# لەم ژمارەیەدا



الاشراف الفني : ص. ع


سەرنووسەر
اسماعیل رسول

جیگری سەرنووسەر
فائق جمیل

رۆشنبیری نوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

# کارێکی گەورە لە باسی ئیدیۆم لە زمانی کوردی و لە فەرهەنگ نووسی کوردیدا!

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

لێکۆڵینەوەی ئیدیۆمی زمانی کوردی باسێکی نوێیە و تاکو ئێستا شتێکی لەوتۆی دەربارە نەنووسراوە. لە نێو ئەو کارانەی لەم کێشەیە دواون، کتێبی (مەکسیمی خەمۆ)[1] و وتارێکی (یو. یو. ئاڤالیانی)[2] بەتایبەتی کە بە زمانی ڕووسی نووسراون، دیارن.

جگە لەو چەند لێکۆڵینەوەیە، هەروەها مامۆستایان: تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ. لە فەرهەنگەکانیاندا هەندێ ئیدیۆمیان تۆمار کردووە. مامۆستا صادق بەهائەدین ئامێدیش لە ساڵی ١٩٧٣دا لە بەغدا کتێبێکی گەورەی بە ناوی «ئیدیەمێت کوردی» یەوە بڵاوکردەوە[3]. بەداخەوە ئەم نووسراوە کە بریتی‌یە لە فەرهەنگێکی ئیدیۆمی کوردی – عەرەبی، گەلێ وشەی ئاسایی‌و فرێزی بەرەڵڵای تێدا تۆمارکراوە کە بە ئیدیۆم دانراون‌و زوربەی ئیدیۆمەکان مانایان باش لێك نەدراوەتەوە بێ‌گومان هۆی ئەو کەم‌و کورتی‌و ئاڵۆزی‌یەش نەبوون یان کەمیی لێکۆڵینەوەی تیۆریی ئیدیۆمە. لێکۆڵینەوەی قووڵ‌و تەواو لە ئیدیۆمی زمانی کوردی مەودای ساغ‌کردنەوەی گەلێك کێشەی گرنگ‌و ئاڵۆزی وشەو دەستەواژە و ڕستە ئاسان دەکاو، زەمینەی ڕێکخستنی فەرهەنگ تەخت دەکا..

ڕستە کە لە ئاخاوتنی ئێمە پێکهاتووە، بەسەر وشەدا دابەش دەبێ. کەم ڕێ

دەکەویّ ڕستە لە یەك وشە دروست بوویّ . پتر لە پێکهاتنی ڕستەدا چەند وشەیەك بەشداری دەکەن : (ئازاد چوو بۆ بازاڕ) . (ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژی هاوینە) . . . لە ڕووی سینتاکس (Syntaxe) ەوە ڕستە یەکسەر بەسەر وشەدا دابەش نابیّ ، بەڵکو لە نێوان ڕستەو وشەدا زنجیرێکی سینتاکس هەیە ئەویش فریز (عبارة )Phrase هـ .

**فریز بەو دانە سادە سینتاکسیە دەڵێن ، کە لە دوو یاخود چەند وشەیەکی سەربەخۆ[٤] پیکهاتییّو ڕێزمان بەیەکەوەی بەستبن .**

**لە زمانی کوردیدا دوو جۆر فریز هەیە :**

**١ – فریزی بەرەڵلاّ .**

**٢ - فریزی گیراو .**

فریزی بەرەڵلا ئەوەیە ، کە بە ئاسانیو بەپێی پێویست دابڕێژریّ ، یاخود لە ڕستە دەربهێنریّ . بە وێنە لە ڕستەی «تۆ دیمەنی بەهارو جەژنی نەورۆزت دیوە ؟»دا دەتوانریّ دوو فریزی بەرەڵلاّ : «دیمەنی بەهار» ، «جەژنی نەورۆز» وەربگیریّ .

هەرچی فریزی گیراوە پێی دەوتریّ «ئیدیۆم ، فریزیۆلۆژی» . کاتیّ لە یەکگرتنی هەندیّ وشەدا واتای تایبەتی پەیدا دەبیّ ، ئەوە بەو جۆرە فریزانە دەڵێن ئیدیۆم .

لە زمانی کوردیدا – وەك هەر زمانێکی دیکەی سەر ئەم زەمینە – جگە لە وشەی جیاجیا ، کە دانەی زمانن ، هەروەها پێکهاتنی ئاڵۆزیش هەیە کە پێی دەوتریّ ئیدیۆم ، وەك : «برین **کولانەوە**» ، **«شوولّ لیّ هەڵبڕین»** ، **«کای کۆن بە با کردن»** ، **«کللك و گویّ کردن»** ، **«ناوی بە گەرووی ئاشا چیّ»** ، **«زمان لیّ دەرهێنان»** ، **«کەولە کۆن»** ، **«لووت تیّ ژەندن»** ، **«دایە کێو»** ، **«دەستی داری گرتووە»** ، **«مل لە چەقۆ سوین»** ، **«دووکەلّ لە ماڵی هەڵناسیّ»** . . **هتد** .

لەبەر ئەوەی کە ئیدیۆم لە سیستێمی زماندا بە مانای دیکە دێت ، پێویستە لە ڕوونکردنەوە و ئاشکرا کردنی خاسیەتو دەوریدا ، لە لایەکەوە لە فریزی بەرەڵلاّدا و لە لایەکی ترەوە لەوشەی جیاجیا ، جیابکرێتەوە .

ئەو دوو ڕێگەیەی لێکۆڵینەوەی ئیدیۆم ، وەك دیاردەیەکی دیاری کراوی زمان شتێکی زۆر پێویست و گرنگە ، ئەویش لەبەر دوو هۆ : یەك – ئیدیۆم لە زماندا ئەرکی خۆی لە ڕێگای وشەی جیا جیاوە دەبینیّ ، دوو – ئیدیۆم لە پێکهاتنیدا لێکدراوەو پارچەکانی وشەی سەربەخۆن . تەنیا لە تەماشاکردنی تەواوو وردبوونەوەی قوولّ لە خاسیەتی ، جیاوازیی لەگەڵ فریزی بەرەڵلاّدا دەردەکەویّو لە وشە نزیك دەبێتەوە و لە دواییدا ، واتە لە ئەنجامی بەراوردکردنیدا لەگەڵ وشە ، دەتوانریّ بزانریّ ئیدیۆم چی‌یە :

لێکۆڵینەوە لە کێشەی ئیدیۆمی زمانی کوردی ، نەك تەنیا کەڵك و سوودی بۆ دامەزراندنی تیۆریی ئیدیۆمی زمانی کوردی هەیە بەتایبەتی ، بەڵکو هەروەها بۆ کاریّ فەرهەنگ نووسیو لێکسیکۆلۆژی‌یش بە گشتی گەلێك پێویست و بەکەڵکە .

خاسیەتی سەرەکیی ئیدیۆم – واتە فریزی گیراو – ئەوەیە کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە فریزی بەرەڵلاّ جیایە و لە هەمان کاتدا لە وشە نزیك دەبێتەوە . فریزی بەرەڵلاّ لە کاتی ئاخاوتندا دروست دەبیّ ، هەرچی ئیدیۆمە لە کاتی ئاخاوتندا دروست نابیّ ، بەڵکو دانەی تەواوو ئامادەی زمانە . بە وێنە لە کاتی ئاخاوتندا کە دەوتریّ : «کامەران هێندەی ڕست ، سەرم ئاوسا» ، ئەوە لەم ڕستەیەدا «سەرم ئاوسا» کە ئیدیۆم (فریزی گیراو) ە ، وەنەبیّ لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا دروست بوویّ ، بەڵکو لە شێوەیەکی ئامادەو پێکەڵدا لە زماندا هەبووە و بەر لەم کاتە داڕێژراوە . پێویست بە بیری خاوەنی ڕستەکەیدا هێناوەتەوە و ئەویش وەك کەرەستەیەکی ئامادە هەستی خۆی پیّ دەربڕیوە . . هەرچی فریزی بەرەڵلاّیە لە کاتی ئاخاوتندا لە وشەی جیا دادەڕێژریّ . بە نموونە کە دەوتریّ : «منیش پاش چەند ساڵێك تووشی لاوێکی ڕووناکبیر هاتم» ، ئەوە لەم ڕستەیەدا «لاوێکی ڕووناکبیر» ، کە فریزی بەرەڵلاّیە لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا لە وشەی جیا دروست بووە .

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش : بۆچی کێشەی فریزی گیراو لە بەشی لێکسیکۆلۆژیدا تەماشا دەکرێت ؟ . . . ئاشکرایە ، کە فریز پارچەیەکە لە ڕستە – واتە مەفهوومی سینتاکسیەو ئەمە ڕاستەو بەم پی‌یە دەبیّ لە بەشی سینتاکسدا لێی بکۆڵرێتەوە ، بەڵام کێشەی فریزی گیراو (ئیدیۆم) لە سنووری سینتاکس دەردەچیّو لە لێکسیکۆلۆژی نزیك دەبێتەوە . زۆر جار دەبینین کە بە ماناو واتا وەك یەك وشەیە ، بە وێنە ئیدیۆمی : «ئەسپیّ لە گیرفانیدا سەوزەڵە گیانم دەڵیّ» – بە ماناو واتای وشەی «لات ، هەژار» دێت . یاخود فریزی گیراوی : «نانی لەسەر ساج سووتاوە» – بەرانبەر بە وشەی «پەلەکەر» دەوەستیّ .**

**لە زمانی کوردیدا فرێز هەن ، کە هەمیشە بەرەڵڵان ، وەك : «کچی جوان» ، «نامە نووسین» ، «چا خواردنەوە» «پیاوی ئازا» ، «کتێب خوێندنەوە» . . . هتد . فرێزیش هەن کە هەردەم گیراون ، وەك : «گوڵۆڵەی کەوتە لێژی» ، «لووت تیَژەندن» ، «دایە کیۆ» ، «یاری بە ئاگر کردن» . . هتد .**

هەروەها زۆر فرێزیش هەن ، کە دەکرێ بەرەڵڵاش‌و گیراویش بن ، ئەمەش پێوەندی بە ماناو مەبەست‌و بەکارهێنانیانەوە هەیەو لە رستەدا دەردەکەوێ . بە وێنە فرێزی : «شووڵی لێ هەڵبری» – مانا ڕاستەوخۆکەی ئەوە دەگەیەنێ کە «یەکێك شووڵ لە یەکێك هەڵبرێ» بەم پێ‌یە ، ئەمە فرێزێکی بەرەڵڵایە . بەلام بە مانای تیانی – واتە «لە تامی دەرکرد ، لە ڕادەی تێ‌پەڕاند» – دەبێ بە فرێزێکی گیراو (ئیدیۆم) یاخود فرێزی «دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکا» – مانا ڕاستەوخۆکەی ئەوە نیشان دەدا ، کە «یەکێك دۆ بهێنێ‌و لەگەڵ دۆشاودا تێکەڵی بکا» – ئەمە فرێزێکی بەرەڵڵایە . هەرچی مانای تیانی ئەم فرێزەیە بۆ ئەوە دەوترێ ، کە «یەکێك لە وتووێژێکدا ، یاخود لە کارێکدا . . تووڕە دەبێ‌و قسەی نابەجێ دەکاو لە ڕادەی تێ دەپەڕێنێ» – بەم مانایە فرێزێکی گیراو دروست دەبێ . فرێزی «ئاشی ناگەڕێ» ، ئەگەر وەك فرێزیکی بەرەڵڵا بەکار بهێنرێ ، ئەوە واتاکەی ئەوە دەردەخا کە «ئاشەکەی ئیش ناکات» بەلام کە بێ فرێزێکی گیراو «ئیدیۆم» ، ئەوە مانای «کاری وەستاو» دەگەیەنێ – واتە مەرج نی‌یە ، ئەو کارە ئیشی ئاش بێت ، بەڵکو هەر ئیشێك بێت جیاوازی نی‌یە .

فرێزی گیراو (ئیدیۆم) هەموو وەك یەك نین ، بەڵکو لە ڕادەی یەکگرتن‌و پێوەندی ئەو وشانەی پێکی دەهێنین‌و لە رووی ئەوەوە کە مانای گشتی فرێزەکە تا چ ڕادەیەك بە هەر وشەیەکی ئەو فرێزەوە پەیوەستە ، جیاوازی هەیە . جا لەم ڕێگەیەوە لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ چەند جۆرێك ئیدیۆم دیاری بکرێ .[٥]

لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ئیدیۆم هەیە ، بۆیە لە زانین و فێربوون‌و وەرگێڕانیدا بۆ سەر زمانێکی دی ، گیروگرفت دێتە پێش . جا بۆ ئاسانکردنی ئەو کارە ، پێویست بە لێکۆڵینەوە لە جۆرەکانی ئیدیۆم‌و ڕێکخستنی فەرهەنگی ئیدیۆم هەیە .

زمانەوانانی ئەمرۆی یەکێتی سۆڤێت گرنگی‌یەکی زۆریان بە کێشەی ئیدیۆم داوە ، بەڵگەی ئاشکراش ئەوەیە کە گەلێ کاری تیۆری دەربارەی ئیدیۆمی زمانی نەتەوە جۆربەجۆرەکانی ئەو وڵاتە بلاوکراوەتەوەو ژمارەیەك فەرهەنگی ئیدیۆم چاپکراوە . ئەمەش بە گشتی لە گەشەپێدان‌و پێشخستنی کاری فەرهەنگ نووسیدا دەورێکی گەورەی بینیوە . . تیشکی ئەو پێشکەوتنە وا تەواو زمانی کوردیشی ڕووناك کردەوە . ئەوەتە لاوی زاناو کورد پەروەر د . مەکسیمی خەمۆ[٦] ، کە بەڕاستی شاسواری ئەو مەیدانەیە ، پاش هەوڵ‌و تەقەڵڵای بێ‌وچانی پتر لە دە ساڵ توانی فەرهەنگێکی گەورەی زانستی ئیدیۆمی کوردی – رووسی لە چاپدا[٧] و لەم‌مەیدانەدا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنێ .

ئەم فەرهەنگە (٢٨٤) لاپەڕەی قەوارە گەورەیە و نزیکەی هەشت هەزار ئیدیۆمی کوردیی تێدایە ، کە ماناکانیان بە رووسی لێکدراوەتەوە . لە (٢٨) لاپەڕەی سەرەتادا دەربارەی ئیدیۆمی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە و لە چەند سەرێکەوە ، بەر لە هەمووش لە رووی پێکهاتن‌و ئەرکەوە گەلێ زانیاریی نوێی خستۆتە پێش چاو . . دواتر لە چۆنێتی‌ی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی ئیدیۆم بۆ ئەو فەرهەنگە دواوە . . باسی شێوەی ڕیزکردن‌و جیاکردنەوەیانی کردووە . . لە لێکدانەوەی مانایان‌و شێوەی جۆربەجۆری وەرگێڕانیانی کۆڵیوەتەوە . . . هتد .

**ئەم فەرهەنگە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو ئیدیۆمانەی گرتۆتە خۆی کە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو (بەتایبەتی لە بەشە دیالێکتی کوردی یەکێتی‌ی سۆڤێت)دا دەبینرێن . هەروەها بەشێك لەو ئیدیۆمانەش کە لە دیالێکتی کرمانجی خوارروودا بەکار دێن ، لەم فەرهەنگەدا تۆمار کراون .**

**وەك ئاشکرایە زوربەی ئیدیۆمی کوردی هێشتا هەر لە ئاخاوتن‌و فۆلکلۆردا دەبینرێن‌و سەدانیان لە نووسیندا بەکار نەهێنراون . بەشی زۆری ئەو ئیدیۆمانەش کە کەوتوونەتە نووسینەوە ، ئەوانەن کە لە ئاخاوتندا زۆر چالاکن . سەرەرای ئەوەش فرەواتاکانیان بۆ هەموو واتاکان بەکار نەهێنراون . . . جا بۆیە د . خەمۆ لە دانانی ئەم فەرهەنگەدا ئەدەبیاتی کوردی نەکردۆتە سەرچاوەی سەرەکی‌و لە زاری** حیکایەت خوان‌و دیهاتیی کوردەوە کەرەستەی بۆ فەرهەنگەکەی کۆکردۆتەوە . ڕاستە لەم قۆناغەدا فەرهەنگی ناوبراو ناتوانێ دەورێکی گەورە

لە ئاسانکردنی تێگەیشتنی تێکستی ئەدەبیدا ببینێ (هەرچەندە مەبەستی فەرهەنگەکەش تەنیا هەر ئەوەندە نی یە) ، بەلام دوا ڕۆژ – واتە کاتێك ئیدیۆمەکانی زمانی کوردی ئەدەب دەرازێننەوە ، ئەوە دەتوانێ باش ئەو نیشانە بپێکێ . نووسەر لە سەرێکی دیشەوە ئەو سامانەی نەتەوەکەمانی لە مەترسیی تیاچوون ڕزگارکردووە . ئەم بەرهەمە جگە لەو کەلکە زۆرەی بۆ زمانەوانانو قوتابیانو ئەدەب دۆستانو وەرگێران هەیەتی ، هەروەها ڕابەرێکی کەم هاوتاشە بۆ نووسەران .

**لە نێو فرێزو ڕستەی هەمەچەشنەی کوردیدا ، بەر لە هەموو شتێك پەندی پێشینانو قسەی نەستەق سەرنج ڕادەکێشنو کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە و لە چاپدانیان**[٨] گەلێك پێش خڕکردنەوەو تۆژینەوەی ئیدیۆم کەوتووە . نەك هەر لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ، بەڵکو لە لێکۆڵینەوەی زمانە پێشکەوتووەکانیشدا جیاکردنەوەی ئیدیۆم لە پەندی پێشینانو قسەی نەستەق کێشەی زور لە سەرە . شایانی باسە ، د . مەکسیمی خەمۆ زانایانە بۆ ئەو باسە چووەو سنووری ڕاستەو لەباری لە نێوانیاندا کێشاوە .

د . خەمۆ لە چۆنێتیی وەرگێرانو لێکدانەوەی مانای ئیدیۆمەکانی فەرهەنگەکەیدا لە هەمان کاتدا هونەرێکی بەرزی نواندووەو بە زمانێکی ڕەوانو ئاسان ، بە وشەو فرێزو ڕستەی پڕ بەپێستی خۆی شەرحی ئیدیۆمەکانی کردووەو مانایانی لێك داوەتەوە و هەر ئیدیۆمێك چەند مانای هەبێت . هەموو ماناکانی بە ڕووسی نووسیوە . هەروەها ئەگەر ئیدیۆمێکی کوردی لە ڕووسیدا بەرانبەری هەبێ ، ئەوە ئیدیۆمە ڕووسی یەکەشی هێناوەتەوە .

ئەم فەرهەنگە لە رووی زۆری ئیدیۆمو شێوەو شێوازو جۆری دانانو ڕیزکردنو ڕێکخستنی ئیدیۆمەکانو لێکدانەوەو روونکردنەوەو یەکالاکردنەوەی مانای ئیدیۆمەکاندا کارێکی گەورەو زانستیو بەنرخو نایابەو کەلێنێکی گەورەی لەکاری تیۆری ئیدیۆمو فەرهەنگ نووسیی کوردیدا پڕکردۆتەوە . هەرچەندە چەند ناتەواویو کەمو کورتی یەکی کەم لە «فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی – ڕووسی»دا هەیە[٩] ، بەلام ئەو ناتەواوی یانە بەجۆرێك نین لە نرخی ئەو کارە شاکارە کەم بکەنەوە .

لە کۆتاییدا هیوامە خامەی ڕەنگینی د . مەکسیمی خەمۆ لەمەیدانی بەرینی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا هەر لە برەودا بێ .

**پەراوێزەکان** :

(١) مەکسیمی خەمۆ ، دەربارەی فرێزیۆلۆژیی ناو لە زمانی کوردیدا ، یەریڤان ، ١٩٧١ (بە زمانی ڕووسی) .

(٢) یو . یو . ئاڤالیانی ، مەسەلەی جیاکردنەوەی کرداری لێکدراوو ئیدیۆمی کردار (لەسەر کەرەستەی زمانی کوردی) – «کورتەی هەواڵەکانی کۆنفرانسی زمانناسی» ، سەمەرقەند ، ١٩٥٨ ، ل ٤٠ – ٤٣ (بە زمانی ڕووسی)

(٣) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ئیدیەمێت کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

(٤) بێگومان پێویستە لە چەند وشەیەکی سەربەخۆ (واتە لە چەند وشەیەکی تەواو) پێکهاتبێ . لەبەر ئەوەی (پیتی بانگهێشتنو پیتی پێوەندی . .» وشەی ناتەواونو ناتوانن فرێز دروست بکەن . بە وێنە لە ڕستەی «من دەچم بۆ بازار»دا ناتوانین بڵێین ، کە «بۆ بازار» فرێزە ، چونکە (بۆ) وشەی تەواو نی یە .

(٥) بۆ زانستی زیاتر لە بارەی ئیدیۆمەوە ، بڕوانە : د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٦ – ٦٨ .

(٦) د . مەکسیمی خەمۆ لە ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسیی یەریڤان کار دەکا و لە بەشی کوردیی زانستگەی یەریڤان دەرسی زمانی کوردی دەڵێتەوە . ئەم زانایە لە بارەی زمانی کوردییەوە چەند وتارو نامیلکەی بلاوکردۆتەوە ، وەك : «ڕەخنە لە کتێبەکەی ج . خ . باکایێف (شێوەی کوردی تورکمەنستان) » ، گۆڤاری «مێژوو و فیلۆلۆژی» ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ، ژ ٣ ، «مۆرفۆلۆژیی شێوەی بادینان» (کورتەی نامەی دوکتۆری) ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ، «دەربارەی فرێزیۆلۆژیی ناو لە زمانی کوردیدا» ، یەریڤان ١٩٧١ . . . و هەندێکی تر .

(٧) د . مەکسیمی خەمۆ ، فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی – ڕووسی یەریڤان ، ١٩٧٩ .

(٨) تۆمارکردنی پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی هەژدە . هەندێ لەو دەستنووسانە لە ماتێندەرانی یەریڤانو کتێبخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسیی لێنینگراد پارێزراون .

(٩) لە کەمو کورتیی ئەو فەرهەنگە نەدواین . چونکە بە زۆری مەبەستی ئەم وتارەمان ڕاگەیاندنی دەرچوونی کاری ناوبراوە . .

# تاوانی دیاردە خەڵەتێنەکان

رؤوف حسن

دەڵێن : ماڵیان بڕینی لە ڕازیانە . . بەڵام نازانم بۆچی منداڵیان بە دڵئێشە دەمرێت ؟ ! دیارە دەبێ نەزانین چۆن ئەو ڕازیانەیە بەکاربێنین . . خۆ بەکارهێنانیشی ئاسانە . ئەی دەبێ چی بێ ! تۆ بڵێی خۆمان خەڵەتاندبێ‌و ڕاستی‌یەکەی ئەوە بێت ڕازیانە شك نەبەین . . ئەی چی بکەین ؟ چارچیە ؟ ! ڕازیانەی خەڵکی بێنین‌و دڵئێشەکەی پێ سارێژ بکەین ؟ یا ئەوەتا فیروسیای لێ بکەین‌و بڵێین نەمانگەرەکەو منداڵیان دەمرێ نامرێ فیرو سیاو ! !

## ئایا ڕازیانەمان لا چنگ دەکەوێت ؟

. هێندەی لە تاقیکردنەوەی ژیانی خۆمدا بۆم وەدەرکەوتووە نەتەوەکەمان سیفەت‌و خاسیەتێکی زۆر جوان‌و پەسەندی هەیە ئەویش ئەوەیە کە سەرەڕای هەموو ئازایەتی‌و قوربانی دانێکی ، خۆی بەزل نەزانیوەو لافـو گەزافی بۆشی لێ‌نەداوەو ئەوەی لەبارەی‌دا بووبێ بەوپەڕی تەوازوعەوە – بەشێوەیێکی گشتی – پێشکەشی‌کردوەو قەوارەو نرخ‌و پایەی خۆی بەشێوەیێکی مەوزوعیانە سەیرکردوەو ئینسافـو ویژدان لەبەراوردکردن‌دا لەئارادابوە . . چ لە ئەدەب‌و زانست‌و فەلسەفەی مرۆڤایەتی‌داو چ لە بەشدارییە بچووکەکەمان‌دا لە کاروانی شارستانێتی مرۆڤایەتی‌دا .

بەڵام هێندەی دووی برێ لەو قەڵەم بەدەستانەی ئەم سەردەمەمان کەوتم . . چ بەنووسین‌و چ بەئاخاوتن سەری زمان‌و بنی زمانی ئەو برە ڕۆشنبیرە ئەوەیە باسی (تووتێتی) بڕێکی تریان دەکەن . . [وەك قوتابی لە شێوەی تووتی قسەی مامۆستاکانی دەڵێتەوە[1] ] بەم جۆرە تاوانی [ساویلکەیی[2] ] دەهاوێژنە سەر ئەو برەی دووەمیان . .

## کێ هەیە کچی خۆی بکاتە قوربانی کوڕی خەڵکی ! ؟

بێ‌گومـانم ئـەمـە کـارێکی ناهوشیارانەیە . . چونکە ئیتر کار لەوەدا نەماوە کە کچ زیندەبەچاڵ بکرێت‌و هەروەها باوەڕی جارانی فەیلەسووفان کە ئافرەتیان بەدەستکردی شەیتان دادەنا . . بەهۆی کۆمەڵێ [تیك . . تیك‌و یزم . . یزم] ەوە پووچ کرایەوەو ئافرەت لە نەوەی ئادەمزاد مارەکرایەوەو نرخی مرۆڤایەتی بەهۆی پێوەندی نیوان (هۆ) و (ئەنجام)ەوە بۆ سەندرایەوەو چارەنووسی ئادەمزادێتی پێ بەخشرایەوە . بەڵام بەهۆی کۆمەڵێ (زیك‌و یزم) ی ترەوە چاوبەستێکی نوێ‌ی

**بۆ خرایە کارو لەگەڵ بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی نرخی (دۆلار) دا جۆرە کۆت‌و پێوەندێکی هاوچەرخانەی** لە زێڕو لیرە بۆ دروست کرا تا بکرێتەوە کۆیلەی سەردەم (قۆناغی) عەبدایەتی جارێکی تر بۆ دروست‌بکرێتەوەو لەو لایەنەوە تێ‌ی بڕوانرێ کە بە تەنیا هاودەم‌و هاوڕازی نێو پێخەف‌و ژووری نوستنەو ، کەڵکی کارکردن‌و بەرهەمهێنانی پێوە نیە . . بێ‌گومان ناو لێفەو دۆشەك‌و بەتانیا جێگەی مەرەزەی چەڵتووك‌و کارخانەی پاپۆڕ دروستکردنی تیا نابێتەوەو جگە لە بێچوو و زاوزێ هیچ پێوەندیەکی بە باری ئابووریەوە نامێنێ .

با بگەڕێینەوە سەر کچی خۆمان‌و کوڕی خەڵك . . من گومانم لەو کەسە

هەیە کە کچی خۆی ناداتە مێردو کوڕی خەڵك ناکاتە شووی کچەکەی . . دەبێ ناگزوری‌یێك‌هەبێت . . بە کورتی دەبێ ڕووی مەجلیسی نەبێ . . یا گەر بەهەڵە نەچووبم (وەجاخ کوێربێ) دەستێ لەم نهێنیەدا هەبێ . . ئەگینا بۆچی لەوە سڵ بکەمەوە لەگەڵ ئەو عالەمەدا بڵێم (ئاو شلە) . . یا ٢+٢ دەکاتە چوار . . ئەگەر (تووتێتی) لەوەدابێ بڵێم (تایەی پێنجەمی ئوتومبیل بێ سوودە) یا (ئاگر گەرمە) یا ٢+٢= دەکاتە چوار .·. ئەوە بەو جوامێرێتی‌و ناتووتێتیە ڕازی‌نیم کە بڵێم ٢+٢ دەکاتە پێنج . . یا بە ئافرەتێکی شەنگ‌و شۆخی بێگانە بڵێم بەد فەساڵ‌و ناشیرینەو بە ڕەنگ‌و ڕوو ئاولاویەکی کوت‌و کوێری لای خۆمان بڵێم نازدارو شیرینە . . هەروەها بە پێچەوانەشەوە . . ئیتر با درێژەی نەدەینێ‌و بێینەوە سەر ئەسڵی مەبەست .

من لەگەڵ ئەو پێشەکیە دوورو درێژەی مامۆستا (مەسعوود محەمەد) دام کە ئەم سروشتەی ئێمە تێیدا دەژین پڕێتی لە دیاردەی چاوخەڵەتێن . . زیاتریش لەمە دیاردەی تریش هەیە کە ئەندامەکانی تری هەست‌کردن دەخەڵەتێنن . . ئەگەر پەنجەی لە گۆ کەوتوومان بخەینە نێو ئاوێکی ساردەوە وا هەست دەکەین ئاوەکە گەرمەو . . ئیتر نموونە زۆرە کە هەست خەڵەتێنن ، **بەڵام بیرو مێشك خەڵەتاندن ستەمە . . ئەمەیان دەچێتە خانەی خۆخەڵەتاندنەوە** . . ئەی ئەوە نیە کرێکارێك بەسەفتە دینار لە خاوەن کارێك وەردەگرێت ؟ ! خۆ دیارەو بە چاوی خۆمان دەی‌بینین کرێکارەکە ئەو کەمڕووتێنێتەوە . . بەڵام ئەگەر خۆمان نەخەڵەتێنین سەیری تەنیا ساتی مانگانە وەرگرتنەکە ناکەین . . چونکە نهێنیە کە لەوەدایە کرێکارەکە لەوەوبەر ڕوتێنراوەتەوەو نەجاتی‌بوە . . بوێ هەرگیز دیاردە چاوخەڵەتێنەکان ئەوەندەی دیاردە خۆخەڵەتێنەکان تاوان‌بارنین‌و دەتوانم بڵێم ئەوەی یەکەمیان هەرتاوان نین‌و سوودێکی گەورەشیان هەیە کە کلیلی دۆزینەوەی نهێنیەکان بەدەست دەخەن . . چونکە گشت دیاردە چاوخەڵەتێنەکان‌و تەپکەوداوە سروشتی‌و کۆمەڵایەتیەکان سەرچاوەی دۆزینەوەو هەڵهێنانی گەلێ ڕاستی زانستی‌و پشکنینی زوربەی نهێنیەکان بوون‌و بە دەیانی وەك کۆپەرنیکۆس‌و گالیلۆو داروین‌و ئاینشتاین‌و پاڤلۆڤ‌و ماندڵ‌و نیوتن‌و . . . هتد ، نهێنی دیاردە چاوخەڵە تێنەکانیان دۆزیەوە کە نەك هەر بەنیسبەت ساویلکەکانەوە چاوخەڵەتێن بوون بگرە بەنیسبەت گشت ئادەمزادەوەو تائێستاش‌و هەتا هەتایە هەر چاو دەخەڵەتێنن . . بەڵام بیرو هۆش‌و لێکدانەوەی هەموویان ناخەڵەتێنن . . ئاسمانیش لای هەمووبمان هەروەکو گومبەزێکی شین وایەو بەڵام هەندێکمان بەهۆی جۆرێ لە (تووتێتی) یەوە کە دوای زانایان کەوتووین ئەو هەقیقەتەمان دەرك پی‌کردوە کە گومبەزەکە تەنیا هەوایەو شینیەکەشی ڕەنگدانەوەی کورتە شەپۆلێکی تیشکی خۆرە هەواکەی شین‌کردوە لە ئێوارە وەختەش‌داکەنەپۆلی درێژی سوورپێچەوانە دەبێتەوە لە ئاسۆدا ڕەنگی پرتەقاڵی دەبینین . . هەروەها سوورانەوەی زەویش‌و ئەو پەڵە هەورە گچکەیەش کەهەرگیزاو هەرگیز تنۆکێکی لەوە کەمتر نیە کە لەسەر زەوی لافاوی پێ‌هەڵدەستێ‌و ماڵ‌و شاران وێران دەکات‌و . . . هتد .

ببوورن . . هەرچیەك دەزبارەی زانستی‌و نهێنیەکانی سرووشت دەڵێین هیچی لەگیرفانی خۆمان‌و لە فابریقەو ڕوانگەو موختەبەری خۆولاتەوە نەهاتوەو نەدۆزراوەتەوە . . گشتی بەری ڕەنج‌و شەونخوونی‌و لێکدانەوەی سەدان‌و هەزاران ساڵەی مرۆڤایەتیە . . ئەوەی دەیلێین قسەو تیۆرو زانستی‌ی زاناو فەیلەسووفانە ، وتنەوەو باسکردنیان زۆر باشترە لە قرِوقەپ لی‌کردنی . . ئەم جۆرە (تووتێتی)یە لە زۆر (ناتووتێتی) سوودمەنترەو چاوی ئەو خەڵکە (ساویلکە) یەشی زیاتر پی‌دەکرێتەوە . . بەڵام کە دەڵێین (تووتی) هەر دووبارە کردنەوەی قسەی ئەو برە کەسەیە کە بە سووکیەوە دەنوارنە مەسەلە فەلسەفی و زانستیەکان ئەگینا (تووتێتی) تەواو و لە سەدا سەد بە تەنیا لە هەندێ پێڕەوی ئاینی دایەو بەوپەڕی ڕەوانبێژی‌و سەروبۆرو زێرەوە دەوترێ‌و دەوترێتەوە . .

وابزانم مامۆستا مەسعوود محەمەد نکوولی لە وەنیە کە سەرتاپای یا هەر هیچ نەبێ مەسەلە زانستیەکانی – پێشەکیە دووردرێژەکەی دووبارەکردنەوەو وتنەوەی قسەو بیری کۆمەڵێ مامۆستایانی زەین‌ڕوون‌و خزمەتگوزاری مرۆڤایەتین کە لە ئەنجامی خۆرەنجاندنێکی زۆر دا ئەمجا بەو ئەنجامانە گەیشتوون‌و زۆریش لە ڕۆشنبیرانمان هەیە کە بە تەواوی ناتوانن جارێکی تر دووبارەی بکەنەوەو بیلێنەوە . **جا لەبەر ئەوەی مامۆستا مەسعورد قسەکانی پێشەکی وتارەکەی نەداوەتە پاڵ زادەی بیری خۆی بوێ لەسەری ناڕۆم‌و باسی ئەو کتێبانە ناکەم کە ئەو قسانەی**

تێدان . .

**مامۆستا مەسعوود کەدێتە سەرباسی ڕۆشنبیران دەڵێ :**

**«بەلای منەوە ڕابەرایەتی و پێشرەوایەتی ڕۆشنبیر لە مەیدانی فیکردا سێ مەرجی بنجی گەورەی پێوەیە[۳] .**

هەرسێ مەرجەکەو چەندان مەرجی دی لەمەوبەر بەوردی لە وتارو کتێبان دا باسکراوەو لێرەدا تەنیا ناوی کتێبی (التثقیف الذاتی) سەلامە موسا دەبەم کە بەوردی باسی مەسەلەی پسپۆڕێتی ڕۆشنبیر لە بابەتێك دا دەکات . . ئەمجا باسی ئینسکلۆپیدیایی ڕۆشنبیر لە بابەتەکانی تردا .

ئەمجا هەر لە باسی پێشرەوایەتی ڕۆشنبیر دا ئارتەرمیللەر دەڵێ «ڕۆشنبیران لە داواکردنی گۆڕرانە کۆمەلآیەتیەکان دا یەکەمین، بەلآم لە پێ‌قایل‌بوونی ئەو گۆرانکاریانە دا دوایەمین»

ئەم گوتانەو زۆری تریش لەمەوبەر ڕووناکبیران بە هەر دوو تەرەفیانەوە گوتوویانەو ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە بەم دووبارە کردنەوەو سێ بارەکردنەوەیەی مامۆستا مەسعوود کارێکی سوودمەند نەبووبێ . . چونکە بێ‌گومانم کە زۆر کەس هەن نەك هەر نەیان بیستوون و ئاگادارنین بەڵکو واش هەست دەکەن کە ئەو گوتانە هەمووی نوێن و یەکەمین جارە مامۆستا مەسعوود باسیان دەکات .

من بەشبەحاڵی خۆم خوشبەخت بووم کە بەو زمانە ڕەوان و سەرنج ڕاکێشەرە ئەو گوتانەم خوێندەوە . . بەلآم ڕاستیەکەی کێچ کەوتە کەولمەوە . . لەبەر ئەوەنا کە مامۆستا لە کۆتایی گوتارەکە دا ڕایەکی دژ بە ڕای منی دەربڕیوە . . نەء . . بەڵکو لەبەر ئەم سێ هۆیە :

١ – مەوزووعی (تووتێتی)و گوتنەوەی قسەی خەلکان کە لەمەوبەر بەشێکیان خستەڕوو .

٢ – تاوانبارکردنی دیاردە چاوخەلەتێنەکان و خۆلەقەرەی دیاردە خۆخەڵەتێنەکان نەدان . .

٣ – کێشەی (قۆناغی) عەبدایەتی . . کە مەبەستی سەرەکی نووسەرەو ئەمەشیان زۆر پێوەندی بە مەسەلەی (تووتێتی) یەکەوە هەیە .

ئەوپێشەکیە دوورو درێژەو وەستایەتی کردن لەوەدا کە چۆن ئەم دیاردانە دراونەتە دەم یەك و چۆن بە تەقەڵی وردچن چنراون و بەرەو کوێیان دەبەن ؟ کە بە کورتی مامۆستا دەیەوێ بڵێ :

[**دیاردەی ڕووکەش زۆرە . . چ لە سروشت خۆی داو چ لە بیرو فەلسەفە زانستیەکان دا . . ئەم دیاردانە وەك جادوو داوو تەپکە چاوبەستی خەڵکی دەکەن . . یەکێ لەم جادووگەریێ و فێڵ و فەرەجەش لە قوژبنێکی زانستی (مادی مێژوویی) دایە خەڵکی ساویلکەش بیر ناکەنەوە و وەك تووتی دەڵێن مێژوری کۆمەلآیەتی مرۆڤ بە پێنج (قۆناغ) دا تێپەڕیوە . . ئەمجا مامۆستا مەسعوود (بە ناوی خۆیەوە) قۆناغێکیان پووچ دەکاتەوە کە ئەویش قۆناغی (عەبدایەتیە) کە بەدوای قۆناغی کۆمیونیزمی سەرەتایی دا دێت . . دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە (عەبدایەتی) قۆناغ نیەو دیاردەیێکی کۆمەلآیەتیە واتە بەپێی ئەم ڕایە تەنیا چوار قۆناغ لە مێژووی کۆمەلآیەتی و زانستی کۆمەلآیەتی دا هەیە . . لە قۆناغی سەرەتاییەوە یەکسەر بازی داوەتە قۆناغی (دەرەبەگایەتی) و ئەمجا (سەرمایەداری) و دواجاریش (سۆشیالیزمی)**] . . بۆ ئەمەش چەند بەڵگەو بیانوویێکی هێناوەتە وا بە درێژی و هێندەی بلوێ بووترێ ڕوونی دەکەمەوە .

بەپێی تێورە زانستیەکە . . ئەوە کراوە بە بنج کە هەموو (قۆناخێك) زادەی عەمەلیەتی گۆڕرانی ئابووریەو مامۆستا مەسعوودیش هەر لەسەر ئەم یاسایە دەیەوێ ئەوە ڕەت بکاتەوە کە (عەبدایەتی) زادەی عەمەلیەتی بەرهەمهێنان بێ . .

لەبەر ئەم هۆیانە کە دەڵێ :

١ – لە ئاکامی دۆڕاندنی شەڕ دا . . دانیشتوان وەیان عەسکەرەکانی ولآتە تێ‌شکاوەکە بە دیل‌گیراون و بوونەتە (عەبد) .

٢ – لەبەر ناگزووری خەلك منداڵی خۆیان فرۆشتوە . . ڕەنگە خۆشیان فرۆشتبێ . . ئیتر لەبەر ئەوەی کڕین و فرۆشتنیان بەسەرەوەیە نابنە عەبد چونکە مەڕو گیسك و . . هتدیش دەفرۆشرێن و (قۆناخانیش) دروست ناکەن .

٣ – ئەمجا (عەبد) دەشوبهێنێ بە عەسکەرو قوتابی و موەزەف . . لەبەر ئەم خالآنە :

أ – عەبدو عەسکەرو قوتابی و موەزەف هەرەمەی هەموو چینەکانن . . لە شازادەوە تا هەژاری رووت .

ب – زادەی یەکسەرو ڕاستەو خۆی بەرهەمهێنان نین

ج – دەشێ هاو عومری زوربەی قۆناخە مێژوویەکان بن .

د – هەموویان حالەتێکی کاتین بۆ تاکەکان ، دەشێ عەبدێك بەجۆرێ لە جۆرەکان ئازادبێ بە

دەست بێنێ .

هـ – هەندێ جار ژمارەی قوتابی ئەوەندەی تێکرای فەللاح و کریکار زیاتر دەبێت .

٤ .- عەبدایەتی شتێکی دیکەی زادەی هەناوی خۆی بەدوا خۆی‌دا نەهێنا وەك کە سۆشیالیزم بەدوا سەرمایەداری دا دێت‌و لەویش دەکەوێتەوە .

٥ – عەبدایەتی شتێکی حەتمی‌و ناچاری نیە . . چونکە دەشێ لە کۆمەڵ دا عەبد هەر پەیدا نەبێ . . وەك نەبیستراوە کە لە کوردەواری عەبدایەتی هێندە هەبووبێ کە سەرنج ڕاکێشێت وەیان پێ‌ی بگوترێ چین .

ئەوەبوو زووتر وتم «کێچ کەوتە کۆڵمەوە» چونکە هەر هەموو ئەم قسانەم لەمەوبەر بیستووەو لە کتێبان دا خوێندوومنەتەوە . . ئەو کتێبانەش هێندە زۆرن گەر نموونەیان لێ‌دەربێنم ئەوا هەر ئەم وەلام دانەوەیە جزوبەندێکی گەورە دەگرێتەوە . . بۆیێ چەند نموونەیێکی کورت لە چەند کتێبێکی کەم دەهێنمەوە . . تا بۆ هەموان بسەلمێ کە مامۆستا مەسعوود هەرچیەکی دەربارەی مەسەلەی (عەبدایەتی) ش ووتوە هی خەڵکی ترەو نەی‌دەبوو بیووتا بە [ناچارم تەپکەیەکی فیکری زۆر بە ناوبانگ بدەمە بەرینگای خوێنەرو مافی ڕەخنە گرتنی تێدا بەکار بهێنم (٤)] ئەمجا بێتوبلێ [منیش کە دێم ڕەخنەی لێ‌دەگرم هونەرەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی لەسەرەتاوە بیری وەهای کردوە من بەخۆیەوە خەریك بکات/٥] ئاشکراشە ئەوەی کە مامۆستا ڕەخنەی لێ‌دەگرێ خاوەنی تیورە زانستیەکەیە –

کە لەڕاستی دا دەبوایە مامۆستا مەسعوود ئەم ئەرکەی منی بکێشایەو هەرخۆی ئەو تێکست‌و لاپەرانەی بۆ خوێنەران دەستنیشان کردبایە کە ڕاو بۆچوونەکانی لێوە وەرگرتوون و هەمووشی بخستایەتەوە پاڵ خاوەنەکانیان نەك خۆی . . جا لەبەر ئەوە ناچارم لە کاتی شیکردنەوەکان دا من بەڵگەو نموونەکان بخەمە بەرینگای خوێنەران بەسەرچاوەو لاپەڕەو ناوەوە .

پێشەکی هەندێ لە ناحەزانی ئەم زانستیە چەندەها ڕاو بیرو باوەڕیان دەربارەی (قۆناخی) پێش عەبدایەتی (سەرەتایی دەربریوەو لەوە دواون کە ئەویشیان (قۆناخ) نیەو نەبووە چونکە مولکداریێتی تایبەتی هەربووەو مولکداریێتی لە تەبیعەتی مرۆڤ جیانا کرێتەوەو هەر لەسەرەتای کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە چینایەتی هەبوە . . . هتد(٦) . . کە بەم حسابەیان بێ قۆناغەکان دێنە سەر سێ قۆناخ ، ئەگەر نەڵێم دووکانی بەکرو دوو قالب سابوون ! .

با لەمە گەڕێین‌و بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی (عەبدایەتی) یەکەی خۆمان‌و داوای لێبوردن دەکەم کە ناتوانم خاڵ بەخاڵ باسی ڕایەکانی پێشوو بکەم چونکە پێوەندیەکی توندو تۆڵ پێکیانەوە دەبەستێتەوە . . بەلام هیچ خاڵێکیان لەسەر جەمی نووسینەکەم دا فەرامۆش ناکەم .

ڕاستە مەسەلەی (عەبدایەتی) بە پلەی یەکەم زادەی سەرکەوتن‌و تێکشاندنی جەنگە . . بەلام بەشی یێکەمی ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە سەر (قۆناخی سەرەتایی کۆمەڵ)و ئەوکاتە هێشتا نەبووبوونە عەبد . . بەڵکو تەنیا (دیل) بوون‌و بەزۆری یان دەکوژران یاخود دەخوران . . ئەوەتا لە کتێبی موقەدەس دا دەڵێ :

[ واما مدن هؤلاء الشعوب التي يعطيك الرب الهك نصيبا فلا تستبق منها نسمة ما(٧) ]

بە منداڵ‌و گەورەو نێرو مێ‌وە سەردەبڕران . . بەلام ئەو شارانەی بەبێ شەڕ خۆیان تەسلیم‌دەکرد . . بەشێوەی عەبد بۆ کارکردن‌و بێگاری پێ‌کردن بەکاردەهێنران . .

بەلام ئەمەیان دەکەوێتە نێو قۆناغێکی ترەوە کە بە (عەبدێتی) دەمانەوەو کاریان پێ‌دەکرا .

[لە قۆناغی ئابووری ئەم سەردەمە دا کە وردە وردە پێ‌ی گەیشتن (دیلەکان) ی شەڕ نرخیان پەیدا کردو سەرکەوتوانی شەڕ ویستیان بە کۆیلەیەتی بیانهێڵنەوەو سوود لە کارکردنیان وەربگرن . . بەم جۆرە هێز خرایە خزمەتی بارە ئابووریەکەوە(٨)]

ئەم ڕوونکردنەوەیەی سەرەوە وەلامی (هێر یوجین دۆهرینگ)ە کە لەو سەردەمەدا هەمان ڕای مامۆستا مەسعوودی دەربریوەو (عەبدایەتی) بە قۆناغ‌دانە ناوەو دژی ئەو وتراوە .

[بە پێچەوانەی ئەو ئیدیعایەی (دۆهرینگ)ەوە . . ڕژێمی کۆیلایەتی داهات‌و هێندەی نەخایاند کەبوە شێوەی باوی بەرهەمهێنان لەلایەن هەموو ئەو گەلانەی کە تەجاوزی سنووری کۆمەڵگای سەرەتاییان لە گەشەسەندن‌دا کردبوو(٩)] .

ئەمجا دەڵێ ئەگەر کۆیلایەتی نەبوایە . . ئیمپراتۆریەتی یۆنانی‌و ڕۆمانی نەدەهاتە

ئاراوەو تەنانەت دەڵێ ئەگەر رژێمی کۆیلایەتی لە مێژوو دا نەبوایە سۆشیالیزمی‌ی نوێ نەدەبوو[10] .

جا دەپرسین . . ئایا شەر چیە ؟ ! ئایا هیچ پێوەندیەکی بەباری ئابووریەوە نیە ؟ ! ئەی ئەو دیلو ئەسیرانەی لە شەر دا دەگیرێن چین ؟ ! هەر ناویان ئەسیرە یا عەبدەو هیچی تر نین ؟ ! هەر بۆ کرینو فرۆشتنن ؟ ! ئەی پاش کرینو فرۆشتنەکان چیان لێ دەکەن ؟ !

هەر بۆ نموونە . . هانیباڵێك کە لە ساڵی ۲۰۰ پ . ز دا پاش گیرانی شاری (قەرتاجە) بازرگانی بە عەبدەوە کردبێو (۳۰) هەزار عەبدی فرۆشتبێ . . یان ئەنجومەنی شار (۱۵۰) هەزار عەبدی فرۆشتبێ و هەر جوتیارێك پێنج شەشێکی لێ کربێ نابێ بپرسین ئەمانە چۆن دەژیان ؟ ! ئایا هەر بۆ جوانی دا دەنران ؟ ! ئەمە لە بەشێکی پچووکی ئەم سەرزەمینە دا وبەس . . ئەوەش ئاشکرایە کە تەنیا (دیلەکان)ی شەر نەدەبوونە عەبد بەڵکو دانیشتوانی وڵاتە داگیرکراوەکەش بە گشتی دەبوونە عەبد . . . ئەوەتا [ژمارەی عەبدی رۆما لە ساڵی ۲٤ پ . ز دا گەیشتە (۲۰) ملیۆن بەرامبەر ۲۱٤ هەزار ئازاد . . لە ئەسیناش دا لەسەردەمێك دا (٤۰۰) هەزار عەبد بەرامبەر (۲۱) هەزار ئازاد بوو[11] ] کە نیسبەتی ژمارەی عەبد لە چاو ئازادەکانی رۆمادا نزیکەی (۹۵) عەبد بوو بۆ تەنیا یەك پیاو . . لەوی تریش‌دا نزیکەی ۲۰ عەبد بۆ ئازادێك .

کەواتە کرینو فرۆشتنی عەبد گەرچی بازرگانیەکی سەربەخۆ بوو بۆخۆی . . بەڵام بۆ کۆمەڵە ~~کەبەستێکی~~ جۆراو جۆر ئەم سەودایەی پێوە دەکرا کە بەپلەی یەکەم بۆ بەرهەمهێنانو کارکردنە . . چونکە ناچینە ئەقڵەوە پیاوێکی ئازادی رۆمای ئەو سەردەمە (۹۵) کۆیلەی بە خێوکردبێ . . بەم حیسابەیان مەسەلەکە لنگەوقووچ دەکەوێتەوەو ئەوکاتە عەبدەکان دەبنە کوێخاو ئاغاو کابرای ئازاد دەبێتە رەنجبەریان . . بێ گومان عەبد بەپلەی دوومو سێیەمو دەیەمیش بۆ زۆر مەبەستی تر بەکاردەهێنرا . . بەتایبەتی ئافرەتانیان . . جا ئیتر بۆ رابواردن بێ لەتەکیان دا یا بۆ کاروباری نانکردنو چێشت‌لێنانو خزمەتی تری ناو ماڵ . .

ئەگەرچی قۆناخی کۆیلایەتی وەحشی ترین تاوانی نامرۆڤانەی تیا دەکرا – هەر لەوەوە کە عەبد بووبووە هەرزانترین هێزێکی کارکردنو مەمرەو مەژی دەژیاو ، نەك هەر بەرهەمەکەی بەڵکو عەبدەکە خۆیشی بە تەواوی ببووە موڵکی خاوەنەکەی . . تا دەگاتە ئەوەی کە چۆن بۆ یەکتری کوشتن‌کێش دەکرانە نێو مەیدانە فراوانەکانیانەوە تا لەزەتو خۆشی لە خوێنی رژاویان وەرگرن – بەڵام مادیی مێژوویی بە قۆناخێکی بەرەو پێشەوەچووی دادەنێ لە کاروانی گەشە سەندنی کۆمەڵایەتی دا . . چونکە لەم قۆناخە دا دیاردەی کار دابەشکردن هاتە ئاراوەو بەرەو رێكو پێکی هەنگاوی نا . . کەرەسەی بەردین و دارین فرێ درانو کەرەسەی مەعدەنی جێگەیانی گرتەوە . . بەرهەمی کارکردن لە کشت‌وکاڵ دا پتر بوو . . جگە لە کشت‌وکاڵ عەبد لە پیشەسازیش دا کاری‌دەکرد . . هەروەها شوانیو بازرگانیشی دەکرد . . بەکارکردنی ئەمان . . خاوەنەکانیان بە تەواوی بێ‌ئیش‌وکاری بەرهەمدار مانەوەو دەستیان دایە لایەنەکانی تری ژیان . . هونەرو ئەدەبو فەلسەفەو زۆرشتی تر کە زیاتر مێشك و بیری پێوە خەریك دەبێو گەرچی لەناو عەبدەکانیش دا تاکو تەرای وایان تێدابوو لەم بارەیەوە نرخو پایەی بەرزی خۆی هەبێ . . بەڵام بە شێوەیێکی گشتی هەرچی عەبد هەیە بە جۆرێکی ئەوتۆ لەشو بیری دەشێوێنراو تێك‌دەشکێنرا کە لە گیانی خۆی بێزار بێو هیچ شتێکی ئەم جیهانەی بەلاوە بایەخدار نەبێ . . تەنانەت لە تێکشاندنی کەرەسەو ئامێرە قورسو قەبەکان دا جۆرە تۆڵە سەندنەوەیەکیشی تێدا بەدی دەکرد .

بەڵام ئەگەر هەر واشیان دانا کە عەبد دەورێکی ئەوتۆی نەبوە لەبەرهەمهێنان داو بەوە رازی بووین کە تاکە کەسێکی ئازاد ۹۵ – ۱۰۰ عەبدێکی بەخێو کردوەو عەبدەکان لە پاڵەوە خواردوویانەو خواردوویانەتەوە . . کە هەرگیز جێگەی بروا نیە . . بەڵام ئەم جۆرە لێکدانەوەیەش زادەی بیری مامۆستا مەسعوود نیەو [جۆزێف نیدام لە کتێبی زانستیو شارستانێتی ل ۱۰۹ و ۱۱۹ دا پەی بەو (هەقیقەتە) دەبات کە عەبدایەتی دەورێکی گرنگی لە بەرهەمهێنان دا نەبوە .[12] ]

هەر لەم بارەیەوە کە مامۆستا عەبدو عەسکەرو قوتابیو . . پێك‌دەشوبهێنێ چونکە لە عەمەلیەتی بەرهەمهێنان دا دەوریان نیەو لە چینە جۆراو جۆرەکان پێك‌هاتوون . . ئەوەی ئاشکرایە ، بەکەمێ وردبینیو بیرکردنەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە عەبدایەتی بنجو بناوانی لەسەر چینە هەژارو بێ‌دەرەتانەکان دامەزراوە . . چونکە وەك مامۆستا خۆی ئیشارەتی پێ‌داوە رەنگە تاکو تەرایان توانیبێتی

ئازادی بەدەست‌بێنێ . . کە ئەمەشیان بە زۆری لە ڕێگەی خۆکڕینەوەوە دەبێ‌و کابرایەکی عەبدی کۆنە دەوڵەمەند دەتوانێ بەزەبری پارە خۆی بکڕێتەوەو ئازادی بەدەست‌بێنێ و ئیتر لە خانەی عەبدایەتی دا نامێنێ‌و دیاردەی نزیك لەم هە یت‌و هوتە تاك‌و تەرابەش لە نێوچینی جوتیارو کرێکارانیش دا ڕوودە دەن . . بە تایبەتی جوتیارێکی خاوەن زەویەکی بچکۆلە لە پاش چەند ساڵێکی بەهات‌و ئاو هەوا خۆش . . ڕەنگە قازانجێکی ئەوتۆ بکات کە پارچە زەوی تری پێ‌بکڕێت‌و جوتیاری تر بۆ خۆی ڕابگرێت‌و ببێتە برا دەرەبەگێك .

لە لایەکی ترەوە کورە جوتیارێکی عەسکەر . . یا کورە کرێکارێکی قوتابی هەر لەسەر چینەکەی خۆیان حسێب دەکرێن . . چونکە جیاوازیە چینایەتیەکە لە قوتابخانەو ئۆردووگاکان دا بە پوختترین شێوە دیاری دەدەن‌و زوربەی هەرە زۆرمان موعاناتی ڕۆژانی خوێندنی سەر کورسی‌ی قوتابخانەکانمان لە یادەو نە قوتابیێتی‌و نەعەسکەرێتی کێشەچینایەتیەکانی نەسڕیوەتەوە . . بەلام کێشەی عەبدایەتی زۆر جیاوازەو (مەزەندەبێ ئەوە ناکرێ کۆمەڵێ عەبد پێکەوە لە جیاتی ئاژەڵ . . جەنجەڕو گاسنیان ڕاکێشابێ‌و خەریکی کێلان ، یا سەولێ لێدان بووبن . . بەلام لە نێو خۆیان دا (موعاناتی) چینا یەتیان هەبووبێ . . ئەوەش ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی عەبدەکانە کە بەرامبەر بە ڕژێم‌و یاساکانی خاوەنەکانیان بوو توانیان کە هەرچۆنێ گەمارۆیان بدەن‌و تەنگیان پێ‌هەڵچنن گەرچی لە ئەنجام دا سەرکەوتنیان بەدەست‌نەهێنا .

سەرەرای ئەمە لە نێو عەبدەکان دا نەك هەر عەسکەرو قوتابی هەبوون . . بەڵکە فەیلەسوف‌و مامۆستاو فرمانبەریشیان تیا دەرکەوت . . (ئیزۆپ) چیرۆك گێرەوەیەکی بەناوبانگی یۆنانی بوو ئائیستاش بەرهەمەکانی ماوەو کەچی عەبدیش بوە . شیعرەکانی هۆمیرۆس لە عەبدە یۆنانیەکانەوە وەرگێراونەتە سەر زمانی لاتینی . . تەنانەت (ئیفلاتوون) چەند ساڵێك عەبد بووە . . سپارتاکۆسیش بە (١٠٠) هەزار عەبدەوە شۆڕشی بەرپاکرد . . باشە بەرامبەر دەیان‌و سەدان نموونەی وا بڵێین چی ؟ ! ئەگەر عەبدایەتی وەك عەسکەری‌و قوتابیێتی وابێ . . ئەی عەسکەرو قوتابی‌ی عەبد ناوبنێین چی ؟ ! گەر عەبدایەتی دیاردەبێ‌و قوتابیێتی‌و عەسکەریش هەر دیار دەبێ . . (١٠٠) هەزار عەسکەرەکەی سپارتاکۆس‌و سەدان قوتابی‌و مۆزەفی عەبد دەبێ ببنە دیاردەی دیاردە ! ! .

مامۆستا مەسعوود دەڵێ دەشێ عەبد هاو عومری زوربەی قۆناخە مێژوویەکان بێ . . ئەمەیان زۆر ڕاستە . . بەلام وەك تاکەکان نەك وەك یاساو ڕژێم چونکە سەعات‌و دەقیقە بۆ قۆناخەکان دانەنراوە . . دەشێ پاش کۆتایی هاتنی قۆناخێك بە شێوەیێکی گشتی ، چەند نموونەیێکی لە چەند بەشێکی سەرزەوی دا بمێنێ . . ئەوەتا [مۆرگانی زانای ئەمەریکایی دوای لێکۆڵینەوە گەیشتە ئەوەی کە تا ئەمرۆش پاشماوەی کۆمەڵگای سەرەتایی لای هەندێ میللەت ماوە لە شێوەی هاوبەشی‌ی کشتوکاڵی دا لە نێو تیرە وەحشیەکانی ئەمەریکاو دوورگەکانی زەریای هێمنی دان(١٣)]

هەر لەم بارەیەوە لە ساڵی ١٩٥٢ بە دواوە چەند جارێك (شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی بلاوکرایەوە کە لە شێوازێکی زۆر سەرەتایی بەرهەمهێنان دەدوێ وەك شێوازی کۆنی ڕۆمانی‌و یۆنانی‌و عیبری‌و . . . هتد بۆ ئەوەی وەك قۆناخێکی مێژوویی بخرێتە نێو قۆناخەکانەوەو ئیتر لە دوای بلاوکردنەوەی زۆر کێشەی گرینگ باس کراوە .

ئایا هێشتا زانایان لەوە دا سەربەستن کە باسی تێکچوون‌و کەوتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بکەن‌و بەو لێکدانەوەیە وازبێنن کەهۆ بنجیەکەی دەگرێتەوە بۆ گواستنەوەی کۆمەڵگای ڕۆمانی لە قۆناخی عەبدایەتی ناتاشکراوە بۆ قۆناخی دەرەبەگایەتی خراپ دەستنیشان کراو ؟ ! یا بڵێین کە کۆمەڵگای (چین) قۆناخی عەبدایەتی نەدی کە دەرەبەگایەتی بەدوادا دێ ، وەك کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاست(١٤)] .

ئەوەتا لێرەدا وبەر لە مامۆستا مەسعوود گومان لەوەکراوە کە لە چین دا قۆناخی عەبدایەتی هەبووبێ . . لە لایەکی تریشەوە [ڤیتنکۆڤ دەڵێ : نیزامی عەبدایەتی نە لە ولاتانی ڕۆژهەلاتی کۆن‌داو نە لە چین‌و هیندستان داو نەلە سەر ئاستی مێژوویی بنکەی بەرهەمهێنان نەبوە . . هەولدانی (فلادیمیر . ل) یش بۆ ئەوەی سیفەتی قۆناخ لە پەرەسەندندا بداتە کۆمەڵگاکانی عەبدایەتی ، ئەمە ئەورووپاو گەلانی کیشوەرەکانی تر دەگرێتەوەو لەمەدا پشتی بە ڕووداوی مێژوویی دەسنیشانکراو نەبەستوە ، بەڵکو تەعمیمێکی ڕووتە(١٥)] .

ئەو گوتەیەی مامۆستا مەسعوود کە دەڵێ دەشێ لە کۆمەڵ دا عەبد هەر پەیدا



# ئاینشتاین

**نیازی حەمە عەزیز**

مێژووی مرۆڤایەتی تەمەنێکی درێژخایەنی هەیەو ئادەمیزاد هەر لە سەرەتاوە تاکو ئەمڕۆ گەلێك چالاکیو سوارچاکی نواندوە . وە زۆر کەسی وای تێدا بووە توانیویەتی خزمەتی مرۆڤو ژیانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد بکات . بەڵام تاکو ئێستاش کەس نەبوە وەك «ئاینشتان» بتوانێ بە قوڵینگی بلیمەتی کۆسپو تەگەرەی نهێنیەکانی سرووشت تەختبکاتو باخی زانست بەراوبکات .

هەر ئەم زانا مەزنە بوو توانی جڵەو بۆ ئەسپی بیری شلبکاتو لە گۆڕەپانی هەردوو زانستی – فیزیك – و – ماتماتیك – دا پێشبڕکە بکات لەگەڵ هەموو بیرو باوەڕێکی پوچەڵو بڕوای گەندەڵی کۆمەڵگای ئەو سەردەمە کە مرۆڤیان بە هەڵە بردبوو لە تاریکی ونەزانیدا پەلەقاژەی بوو :

**«ژیانێکی پڕ لە نەگبەتی»**

ئەم پیاوە بلیمەتە ناوی «ئەلبرت ئاینشتاین»ەو لە ڕۆژی ١٤ ی ئازاری ١٨٧٩ لە شاری «ئەلەم» ی ئەڵمانیا لەدایك بووە . . هەروەکو زۆر لە زاناو پیاوانی گەورە هەر لە منداڵی‌یەوە بەدیو نەهاتی ڕووی کردۆتە خۆیو خێزانەکەی . . . ئەوەبوو لە تەمەنی یەكساڵیدا باوکی لە بازرگانیکردن‌دا تووشی زەرەرو زیان بوو وە بە ناچاری ماڵەکەی بۆ شاری «میونیخ» برد بۆ ئەوەی کارێکی تر بدۆزێتەوە ژیانی خێزانەکەی مسۆگەربکات . دوای ماوەیەك لەوێ خۆيو خوشکەکەی خرانە قوتابخانەیەکی سەرەتایی «کاثولیکی» «بەڵام خوێندنو ژیان بەسەربردن لەگەڵ منداڵانی مەسیحی لەم قوتابخانەیە بۆ ئاینشتاین کارێکی ئاسایيو ئاسان نەبوو .

ئەوەی کە زیاتریش ئەم مرۆڤەی ئازار دەداو بیرو لێکدانەوەی داگیردەکرد ئەو دیاردە سرووشتی‌یانە بوون کە دەوروبەریان پێك‌دەهێنا ، پتریش خەمی لەو نهێنی‌یە سرووشتی‌یانە دەخوارد کە هۆیەکانیان نەزانراوە یان مەردم بە هەڵە تێی‌گەیشتوون . . هەر ئەم ئامێزە پیرۆزەش بوو «ئاینشتاین»ی فیزیاویو بیرکاری پەروەردەکرد . .

دوای قوتابخانەی سەرەتایی چوو بۆ قوتابخانەی ئامادەیی – جمتریوم – وە تەنها پێنج ساڵ تیایدا خوێندو نەیتوانی خوێندنی ئامادەیی تەواو بکات .

لەبەر ئەوەی خێزانی ئاینشتاین بەدوای ژیان‌دا عەودالبوو لە ساڵی ١٨٩٤ ڕوویکردە شاری «میلانۆ» ، کە لەوێ کارگەیەکی بچووکی لێ دروستکرابوو وە خەڵك بۆ کارکردن ڕوویان تێکردبوو هەر لەبەر ئەوە بە ناچاری وازی لە خوێندن هێناو بەم شێوەیە بڕوانامەی ئامادەیی «جمتریوم»ی وەرنەگرت . . ئەمە وای کرد

وەرگرتنی لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا ببێتە شتێکی مەحاڵ . . تا دەهات خێزانی ئاینشتاین بەرەو هەژاری دەچوون . . بۆیە هەوڵی ئەوەی دا کارێك بدۆزێتەوە بەڵام خێزانەکەی لەسەر بەردەوامی لە خوێندنو چوونی بۆ زانکۆ سووربوون . . ئەوەشیان لەبیر نەچێت خوێندنی لاوێتی ئاینشتاین دوارۆژێکی رووناکی تێدا بەدی نەدەکرا ، چونکە مرۆڤێکی زیرەك نەبوو ، تەنانەت هۆی وەرنەگرتنی بروانامەی ئامادەیی جمتریوم تەنها نەداری نەبوو بەڵکو تەمبەڵیو بێمێشکیو نازیرەکیی کارێکی وای کردبوو خۆ ئەگەر دەوڵەمەندیش ببوایە نەیدەتوانی بێ بە هیچ ، وە وای لێ هاتبوو گەڵی جاری تریش واز لە خوێندن بهێنێ ئەوانانەش کە زۆر دەستەوستان بوو لێیان بریتیبوون لە «زیندەوەرزانی ، کۆمەڵایەتی ، ئەدەبو زمان» .

پاش ماوەیەك لە بەختی ئاینشتاین قوتابخانەی – تەکنیکی باڵا – ی ناسراو بە (ETH) لە شاری زیوریخ کرایەوە ، کە وەرگرتنی قوتابی لەم قوتابخانەیە بروانامەی ئامادەیی پێویست نەدەکرد ، بەڵکو پێویست بوو ئەو کەسەی دەیەوێت تیایدا بخوێنێ لەو تاقیکردنەوەیە دەربچێت کە وانەکانی پێك هاتبوون لە (ماتماتیك ، فیزیك ، زمان ، زیندەوەرزانی) هەروەك توانی لە ماتماتیك وفیزیا دەرچێت بەڵام لە زیندەوەرزانیو زمان کەوت ، بەمە ئەم هەلەشی لەدەستچوو ، بەڵام دوایی ئەوەی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و مامۆستاکان سەیری وەڵامەکانی فیزیكو ماتماتیکیان کرد یەکجار سەریان سوڕ ما لە زرنگیو زیرەکی لە وەڵامدانەوەی لەم دوو وانەیە ! ! بە رادەیەك توانیبووی دوو وانەیەدا نمرەی یەکەم وەربگرێ هەر ئەمانیش بوون بەهۆی ئەوەی کارێکی وای بۆ بڕەخسێنن کە ساڵێکی تریش لە تاقیکردنەوە وەریبگرنو ئەمجارە توانی بە پلەیەکی بەرز دەربچێ بەم شێوەیە لە ساڵی ١٨٩٦ (ETH) – ئاینشتاین – ی وەرگرت

بەڵێ ئاینشتاین زۆر بەختەوەر بوو بە مانەوەی لە وولاتی سویسرا وە بە خوشترین کاتەکانی ژیانی دادەنێ بەتایبەتی کاتێك شێوەی گوزەرانی ژیانی سویسرای دیموکراتی بەراورد دەکرد لەگەڵ ئەڵمانیای سەربازی هەر ئەوەش وای لێکرد دەست بەرداری خاكو نیشتمانی خۆی بێتو لە ماوەی ساڵێكدا رەگەزنامە (جنسیە)ی سویسری بەدەست بهێنێ ئاینشتاین چوار ساڵی رەبەق لەم قوتابخانەیە بردەسەرو توانی بڕوا نامەی تەکنیکی باڵا بەدەستبهێنێ .

پێویستە ئەوە بزانین کە ساڵی (١٩٠٠) بە ساڵی دەرچوونی ئاینشتاینو سەرهەڵدانی بەهرە زانستییە نەمرەکانی دەژمێردرێ . . وە هەر لەم ساڵە بەرەو دوا گەورەترین تەقینەوەی زانستی لە مێشکیدا رووی دا و لە سەرانسەری جیهان دەنگی دایەوە .

### «شۆڕشێکی مەزن»

لە ساڵی ١٩٠١ یەکەمین لێکۆڵینەوەی فیزیکی لە گەورەترین گۆڤاری زانیاری بە ناوی (فیزیك) دا بڵاوکردەوە ، هەرچەند لە سەرەتاوە ئەم لیکۆڵینەوە گرنگییەتی پێ نەدرا بەڵام باوکی (مارسین جورسمان) ی هاوڕێی بوو بەهۆی ئەوەی کە لە دەزگای (بەڕێوەبردنی داهێنان – إدارة الاختراع) وەریبگرنو لەوێدا حەوت ساڵ بەردەوام ئیشی کرد کە بەپیتترین و خۆشترین ماوەی کارکردنی بوو . وە لێرەدا توانی رۆڵی ئازایەتی خۆی ببینێ و مەزنترین شۆڕشێکی زانستی بەرپا بکاتو بەهۆیەوە بەرزترین ناوبانگو کەسایەتی بنیاتبنێ .

لە ساڵی ١٩٠٤ توانی چوار لێکۆڵینەوەی تر بڵاوبکاتەوە کە گرنگییان لە رادە بەدەر بوو .

گەورەترین بلیمەتی ئەم مرۆڤە لە ساڵی ١٩٠٥ دەنگی دایەوەو لەم ساڵەدا ژیری و زانایی ئاینشتاین بوو بە راستییەکی رووتو نکوڵی لێ نەدەکرا ، وە ئەم ساڵە ساڵێکی بنەرەتی بوو لە مێژووی زانیاریی فیزیكدا ئەوە بوو کە لە تەمەنی (٢٦) ساڵیدا بوو چوار لێکۆڵینەوەی تری بڵاوکردەوە کە – سێهەمیان بە ناوکی شۆڕشە فیزیاوییەکەی دەژمێردرێ . تەنانەت راپەڕینێك بوو کاریکردە سەر بۆچوونی نیوترونی بونەوەر لە جیهاندا . ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لەژێر ناوی [لەبارەی کەهرۆدینامیکی لەشە جوڵاوەکانەوە] دا بوو بە – تیۆری رێژەیی تایبەتی – لەسەرانسەری جیهاندا ناسرا وە لە دوو خاڵی بنەرەتی پێك هاتبوو ، ئەوانیش :

١ – هیچ تاقیکردنەوەیەك نیە توانای دۆزینەوەی «وەستانی سەربەخۆ» یان «جوڵانی سەربەخۆ»ی رێکی هەبێت لە هێڵێکی راستدا .

٢ – رووناکی لە بۆشایی گەردووندا بە چەندەها هێڵی راستو بە خێراییەکی نەگۆڕ پەرش دەبێت .

ئەوەی ئاشکراشە ئاینشتاین لە شۆڕشەکەیدا بەسەر کاتو شوێندا هیچ جۆرە هاوکێشەیەکی پێش خۆی بەکار نەهێنا ، جگە لە هاوکێشەکانی ناسراو بە – لۆرنتز – لە ساڵی ١٩٠٧ نەبێت کە لە

زانستی فیزیادا یەکجاری کۆتایی بە شۆڕشەکەی هێنا. ئەویش بە بلاوکردنەوەی دوا لێکۆڵینەوەی کە تیایدا سەلماندی «ووزە» و «بارستایی» لە کارتی‌کردن‌دا لە هەموو مادەیەك وە هەر لەم لێکۆڵینەوەی‌دا کە هاوکێشە بەناوبانگەکەی پێشکەش کرد کە دەڵێ:

«ووزە = بارستایی×چوارگەی خێرایی تیشك».

وە ئەمە یەکەمین هاوکێشە بوو کە دیاردەی لەسەر تیشك دارە ئەتۆمیەکانی لێك‌دەدایەوە کە ماوەیەکی درێژخایەن لە تیشك هاویشتن دان، نەك هەر ئەوە بەڵکو یەکەمین سەلماندنی دڵنیابوو کە یەکەمجار لە کارەساتە ترسناکەکەی هەردوو شاری «هیرۆشیما»و «ناگازاکی» دا جێبەجێ‌کرا. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٤٥ هەردوو شاری ناوبراو بە بۆمبای سامناکی ئەتۆمی وێران‌کران. کە ئەمە بەلای ئاینشتاین‌و رای گشتی جیهان کارێکی دڕوارو نارەوا بوو وە یەکجار پەشیمان بووەوە، بۆ ماوەیەك خەمێکی قووڵ تلاندیەوە، هەر وەکو خۆی پێ‌نەگیرا دەنگی نارەزایی لێ هەڵنەستێ.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە گەورە زانایانی ئەورووپا هەڵویستیان پێچەوانە بوو لەگەڵ ئاینشتاین‌دا لە بیروڕا زانیاری‌یەکانی، بەتایبەتی پێش ئەوەی شۆڕشەکەی دانی پیا بهێنرێ، جگە لە زانای گەورەی ئەڵمانی.. «ماکس بلانك» نەبێ، هەر لە بلاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەی سێهەم لە ساڵی ١٩٠٥ لەگەڵیدا هاوڕا بوو. ئەوەی شایانی باسە تاکو ئەمڕۆش زۆر لە زانایان بڕوا ناکەن «تیۆری ڕێژەیی تایبەتی» لە هەڵەو کەلەبەر بەدەربێت چونکە لەلایانەوە حوکمی نارەوا بەرامبەر بیری ئاوا فراوان راست نیە.

**«بەرزبوونەوە بۆ لوتکە»**

دوای ئەوەی زانکۆی «برن» دانی بەسەرکەوتنی ئاینشتاین‌دا هێنا لە هەوڵە زانستی‌یەکانیدا وای لێ هات بیر لە فەرمانێکی بەرزو پایەیەکی بڵندتر بکاتەوە کە شایانی بەهرە زانستی‌یەکەی بێت‌و زیاتر بە هۆیەوە بتوانێ لە مەیدانی خزمەتە زانیاری‌یەکەیدا کاربکات. هەر بۆیەش وازی لە دەزگای – (بەڕێوبردنی داهێنان) هێناوە لە ساڵی ١٩٠٨ لە زانکۆی (برن) بوو بە یاریدەدەری مامۆستای فیزیك، هەر بەوەشەوە نەوەستاو لە زانکۆی زیوریخ یش بوو بە یاریدەدەری مامۆستای فیزیای تیۆری وە لە ساڵی ١٩١٢ بەتەواوی بەرز بۆوەو کرا بە مامۆستای فیزیای تیۆری لە قوتابخانەی (ETH)، هەروەها بوو بە ئەندامی ئەکادیمی زانستی پروسیاو دواییش کرا بە بەڕێوەبەری «پەیمانگای قەیسەر بۆ لێکۆڵیتەوەی زانستی».

لەسەرەتای ساڵی ١٩١٦ ئاینشتاین گەیشتە سەر بەرزترین پۆیەی سەربەرزی‌و ناوبانگ، ئەویش بە بلاوکردنەوەی دوا لێکۆڵینەوە زانستی‌یە نەمرەکەی بەناوی [تیۆری ڕێژەیی گشتی] وە هەتا مردنیش نەیتوانی دەست‌کەوتێکی تری ئاوا بەدەست بهێنێ، وە ببێتە هۆیەك کە جەماوەرێکی مێژوویی‌و جیهانی بۆ لای خۆی کێش‌بکات!!

**بەرەو رامیازی**

لە دوای ساڵی ١٩١٦ پلەی بەهرەو زانیاری ئاینشتاین ڕووی لە کزی کرد وە وای لێ‌هات بە تەواوەتی لە بازنەی کارکردن لە زانست دا چوە دەرێ ئەمەش چەند هۆیەك وای‌کرد کە هەرە گرنگەکەیان بیری رامیاری (سیاسة) بوو لە کەللەی دا وە زیاتر کەوتە گێژاوی کێشە رامیاری‌یەکانی جیهانی ئەو کاتە وە هەر زوو دەرکەوت کە خەریکە بەو باسانەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٣ کرا بە مامۆستای زانکۆی (برنستون) لە ئەمەریکا وە تاکو دوا ساتەکانی ژیانی لەوێ‌دا مایەوە.

**«مردنی»**

گەورەترین نەشتەرکاری (عملیة جراحیة) لە ساڵی ١٩٤٨ لە کۆ ئەندامی هەرسی ئاینشتاین‌دا کرا کە دەرکەوت تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوە، لەدوای ئەمە تەندروستی بەرەو خراپی چوو. لە ساڵی ١٩٥٥ لە نامەیەك‌دا کە بۆ هاوڕێیەکی نووسیبوو گوتبووی: وام لێ هاتوە کە مەرگ وەك قەرزێکی کۆن بینم‌و پێویستە بیدەمەوە... ئەوە بوو لە ١٨ ی نیسانی ١٩٥٦ بۆ دوا جار پێڵوی چاوی لێك‌نا. وە پاش ڕێگەدانی خێزانەکەی بڕیار درا لە زانکۆی برنستون بەشێوەی نەشتەرگەری مێشکی ئاینشتاین دەربهێنن‌و بزانن چ جیاوازی‌یەك هەیە لەنێوان مێشکی ئەم‌و مێشکی مرۆڤێکی ئاسایی؟ لە وەلامی ئەمەشدا دکتۆر – تۆماس هار – لە ساڵی ١٩٧٩ گووتی: تاکو ئێستا هیچ جیاوازیەکمان بەدی نەکردوە.

دوا ئیشی ئاینشتاین ئەو ڕاسپاردەیە بوو کە لە لایەن (١٠) ڕۆشنبیرو زانای وەکو خۆیەوە ئیمزا کرا کە تیایدا جیهان ئاگادار دەکەنەوە کە «ئەگەر بێت‌و جەنگی جیهانی سێهەم بقەومێت. توخم‌و نەژادی ئادەمیزاد لەناودەرچێت‌و ژیان بە گشتی کۆتایی دێت لەسەر زەمین».



# دیوانی بێ کەس

محەمەدی مەلا کەریم
ڕێکی خستووەو
سەرەتای بۆ نووسیوەو
سەرپەرشتیی لە چاپدانی کردووە
کتێبخانەی (الطلیعة) لە کەرکووک بڵاوی کردووەتەوە

**جمال بابان**

پێش ماوەیەك دیوانی شاعیری نیشتمان پەروەری کورد خوا لێ خۆشبوو فایق بێ کەس کە برای کارامەو ئەدەب پەروەر کاك محمدی مەلا کەریم ڕێکی خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە ، گەیشتە دەست خوێندەواران .

ئەمە دووەهەم چاپی دیوانی بێ کەسە کە باسی ئەکەین ، لەوە پێش یەکەم چاپی دەرچوو بەلام ئەویان دەست کەم کەس کەوت ، بگرە هەر نەمان دی . ئەم دیوانە لەبەرگێکی جوانو چاپێکی جوانتر لە (٢٣٨) لاپەرەدا کە چاپخانەی (الادیب) لە بەغدا لە چاپی داوە. بەتایبەتی بەرگی دوایی کە بە (٢٧ جار !)ی شێرکۆی کوری بێکەسەوە ڕازاوەتەوە و پێشکەشی (بێکەسی باوكو نیشتمان پەروەر)ی کردوە . تیایدا گەراوەتەوە بۆ ئەو ساڵەی کە (بێکەس) لە جەژنی نەورۆزی لای گردی مامە یارەدا .

(٢٧ ساڵە من ڕەنجبەری تۆم)ی بەرامبەر بە (ئەدمونز) خوێندەوە .

بێ کەس سەردەمێك مامۆستای تایبەتیم بوو ، ڕێزمانی عەرەبی پێ ئەوتم ، جگە لەوە پەیوەندی خزمایەتی وای ئەکرد کە زوو زوو لە ماڵە خزمانو لە ماڵی خۆیان ببینم ، بەلام ئەوسا ئەوەندە عەقڵم بە قسە بەنرخەکانی بێ کەس نە ئەشکاو بۆم لێك نە ئەدرانەوە . ئەوەندە هەیە لە بیرمە زۆر جار خزمان گلەییان لێ ئەکرد لەسەر ئەو (بێ کەس)ەی ناوبەتی بەخۆیەوە وپێیان ئەووت : تۆ لە هەموکەس کەست زۆرترە ، کەس بەقەدەر تۆ ئاموزاو خزمی نیە . لەوەلامدا ئەیووت :

کەس ئەوکەسەیە فریای کەس بکەوێت . من لە منداڵیەوە خۆم مشوری خۆم خواردوەو خۆم بەخێو کردوە وکەس فریام نەکەوتوە .

لەڕاستیشدا بێ کەس سەردەمێکی منالی تاڵو ناخۆشی بەسەربرد وەختە بڵێم وەك ژیانیی منداڵیەکەی (شارلز دیکنز) وایە کە لە (اولیفر تویست)دا ئەی گێڕێتەوە . بەلام فەرقەکەیان بەگوێرەی سەردەمو شوێنە .

بێ کەس هەر کە فام ئەکاتەوە ، یاخود هەر لە منالیەوە بێ باوكو بێ دایك گەورە ئەبێ ، هانا نابات بۆ کەس کە یارمەتی بدات ، خۆی مشوری خۆی ئەخوات ، هەر ڕوژە لە شوێنێكو هەر جارە لە سەرئێشێك ، دەر بەدەرو بێ دەرەتان . . جگە لەوەی باری ولاتەکەیو میلەتەکەی لەرووی سیاسی وئابووریو کومەلایەتیەوە تابلێی ناخۆشو نالەباربوو ، ئەمانە هەموکاریان کردەسەر دڵە ناسکەکەیو دەروونە پر هەستەکەی بەجۆرێك سەیری هەر هەلبەستێکی ئەکەیت ، لە چوارچێوەی کوردو نیشتمان دەرناچێت ، ئەگەر یەکسەریش نەبێت لە دواییەکەیدا هەر بەولایەدا با ئەداتەوە . بەلێ هەر چەندە لە هەندێك لە شیعرەکانیدا هەستیی ئومید برانو وورە بەردان ئەکرێت ، ئەمەش هۆی ئەو نالەبارییو لەیەك دوورکەوتنەوەی هەندێك لە ڕۆڵەکانی میلەتەکەیو شیرو تیر لەیەك سوون بوو کە ئەویش وەك شاعیرێکی هەست ناسكو لە گوشتو خوێن دروست

بوو ، ئەمانە هەمو کاری تیٚ ئەکردن بەلاٌم هەمیشەش گەراوەتەوە ولەم بابەتەی وتووەو لەگەلّ پیرەمیردا هەستیان یەك بوە :

وابزانم نەورۆزی ٩٤٥ بوو ئیمە قوتابی بووین کە قوتابخانە بردینی بۆ کاریٚزی وەستا شەریف لای گردەکەی مامە یارەو ئەو رۆژە ئەدمونزیش هاتبوو گوایە مالّ ئاوایی لە کورد بکاتو هیجگاری بگەریٚتەوە بۆ وولاٌتی خۆی ، سەر لە بەیانی بوو لام وایە موتەسەریف خوالیٚ خۆشبوو مارف جیاووك بوو ، کاتیٚکم زانی بوو بە هەراو نەرە نەر ، ئەو ئەیووت کورە وازبیٚنەو مەکە . . ئەو ئەیووت نەخیٚر واز ناهینم ، هەمو گوناهیٚك لە گەردنی خۆم . . سەیرم کرد بیٚکەس سنگی نا بۆپیٚشەوە ، ناچار ئەدمونز وتی وازی لیٚبیٚنن ، ئەویش دەستی پیٚکرد :

**بیست و حەوت سالّە من رەنجبەری تۆم**
**بەنانو ئاوو جلو بەرگی خۆم . . .**

ئەو دەشتو گردو سەوزایی و سەیرانەی هەمو کرد بە ئاگر وچەپلّەو بابزی . . بۆ ئیوارەش وردە خۆپیشاندانیٚك دەرچوو خوالیٚ خۆشبوو (عیزەتی فاتە) پیٚشرەوی بوو ، دوای ئەوە خەلّکەکە لە قوتابخانەی ناوەند لە سەرەوە گیرسانەوە ، لەویش کۆریٚکی شیعر خویندنەوە دەستی پیٚکرد ، بیٚکەس لەویشدا ئەی‌نەراند :

**بەهار نامەوی جوانیت ببینم**
**ئەمرۆ من بە دلّ پەستو غەمگینم**
**دوورم لە خۆشی خەریکی شینم**
**زارو بیٚزارم تاریکە ژینم**
**دوژمنی گولّ و لالەو نەسرینم**
**بەهار نامەویٚ جوانیت ببینم**

شیعری بیٚکەس وەك کاکە حەمەی مەلاکەریم ئەلّیٚت[1] : شایانی لیٚکۆلّینەوەیەکی وردە ، واتا هەمو شتیٚك بە تەنها دەرچوونی دیوانەکەی تەواو نابیٚت ، من لەم رووەوە بروام بە نووسەرو لیٚکۆلّەرەوەکانی خۆمان بەهیٚزە کە رۆژیٚك لە رۆژان ئەم ئاواتە پیروزە بهیٚننە دی .

بیٚکەس شاعیر بوو ، لە هەمان کاتیشدا بیٚکەس (ساخر) و گالّتەچی ونوکتەزان بوو . هەروەها قسەی بە تۆبکلّو (جوت باقیٚ)ی شیعری زۆر بوو . لەم بابەتە هەبەتی (ایها الدوم) و (حوشتر بار ئەکەن لە گیەخانە) و (ئەو موتەسەریف حازم ئیداری – لائق لەسەر خۆی کورسی وەزاری) . . بەلاٌم لە هەموێ خۆشتر ئەوە کە لە (تەویلّە) مامۆستای قوتابخانە ئەبیٚت ، کاربەدەستانی تەویلّە لەگەلّ ئەوانەی نوقتەی سەرسنووری ئیراندا هاتوچو لە بەینیاندا هەبووە . گوایە جاریك قومیسەریٚکی تازە دیتە نوختەکەی ئەو بەری تەویلّە . فایقیش کار بەدەستانی تەویلّە کۆ ئەکاتەوە[2] وەك باشجاوش و مأموری استهلاك و بلدیە و گومرك ومامۆستاکان . . ونوختەکەی بەرامبەریان ئاگادار ئۆکات کەوا کاربەدەستانی تەویلّە دیٚن بۆ بە خیٚرهاتنی قومیسەری نویٚ . ئەوانیش لەو بەر هەمو کۆئەبنەوەو ئەچن بەپیٚشوازیانەوە . ئەمانیش کە ئەچن بیٚکەس لەریٚ پیٚیان ئەلّیٚت : ئیوە هیچ قسە مەکەن من هەموتان پیٚشکەشی ئەم قومیسەرە تازەیە ئەکەمو بە یەکترتان ئەناسیٚنم . کە ئەگەنە جی ئەوانیش هەمو بەریٚز جۆری عەسکەری رائەوەستن . بیٚکەس لەپیٚشدا خۆی ئەچیتە پیٚشەوەو دەست ئەخاتە ناو دەستی قومیسەرو ئەلّیٚت بەندە خۆمت پیٚشکەش ئەکەم (مفلس الدولەی أعوری)

پاش ئەو دووەم کەسی تەنشت خۆی پیٚشکەش ئەکات ئەلّیٚت : ئەم زاتە (نیٚرەکەر السلطنەی مەترەقی) بەسیٚ هەم کەس ئەلیت ئەمیش (میٚباز الله خانی أعرجی) . بەچوارەمیش ئەلیت : ئەم زاتەش (سفیە الدولەی سەرخۆشی‌یە) . کە پیٚنجەمیش پیٚشکەش ئەکات ئەلّیٚ ئەمیش (پیٚك‌الله خانی شاربی)یە دوای ئەویش (مطیع المالیك هەلّەوەری) بەحەوتەمیش ئەلیت : ئەمیش (رەقەلّ الانجمەنی بیٚ هیٚزی)یە ، هەشتەم : (وورگ الملکی ئاووسی) . بە نۆ هەم کەسیش ئەلیت ئەم ئاغایەش (شەکەتیر هومایونی خرنوکی)یە . بەم جۆرە هاوریکانی خۆی پیشکەش ئەکات . کابراش لەم (القاب)ە سەیرانە سەری سرئەبیٚ و ئەمانیش لە دلدا هەمو لەپیٚکەنیندا ئەکولین بەلاٌم دەنگ ناکەن . تا لە دواییدا لە یەکتری ئاشکرا ئەبن و ئەبیٚ بە بەزمی پیکەنین و هەرا .

ئەوەی شایانی باسە بیکەس هەروا بەخۆرایی ئەو (لقب)ەی لە هاوریکانی نەناوە ئەوەتا لەخۆیەوە دەستی پیٚکردوە ، کە یەکیکی مفلسو چاوبکیشی نەبوە ، پیك‌الله خانی شاربیش یەکیکیان بوە کە هەمیشە خەریکی خواردنەوە وبیك و مەی بوە می بازالله خانی أعرجی ئەویش یەکیکی میٚبازو شەل‌بوە . .

ئەوانی تریش هەر بەم جۆرە .

ئەم زیرەکی و قسە لە جێیەو ئەم نوکتەبازیە ئەتوانم بڵێم هەر بە بنەماڵەبۆیان ماوەتەوە . هەر دومامیو ئاموزاکەی بێکەس هەموو ناویان دەرکردبو لەم رووەوە[3] جگە لە هەندێکی کەیشیان کە قسە خۆش ونوکتەبازبوون .

دڵم بەوە خۆشە کەوا میللەتەکەمان خەریکە هەر نیشتمان پەروەریك خزمەتی پێشکەش کرد بێت ریزی لێبنیو لەچوار چێوەی توانایدا حەقی خۆی بداتێ . ئەویش بەو یادکردنەوەو ئاهەنگ گێران و لەسەر نوسینانەو . . کە لە هەر دەرفەتیکدا پێشکەش ئەکرێت . تا ئێستا دوو جار ئاهەنگی گەورە بۆ بێکەسو بیرەوەری بێکەس گێرراوە ، یەکیکیان لە سالی ٩٥٨ دا و ئەوی تریان لە سالی ١٩٧٠دا . ئەمە جگە لە کۆری یادکردنەوە ، بێگومان ئەمانە کە من بەرامبەر بە یەکیکی وەك بێکەسو هاوەڵەکانی ، بەڵام ئومید ئەکەین لە مەودوا نەك هەر ئەوانە بەڵکو روژێك لە رۆژان پەیکەریشیان بۆ بکرێت .

وەختی خۆی بێکەس لە ماڵەکەی خۆیدا (ماڵی یەکەم ژنی کە حەلاوە خانی خوا لێخوشبو بوو) وینەیەکی خۆی پیشان داوم کە بەمیزەرو جبەوە بوو لەگەڵ قوتابیەکانی (دارالعلوم) لە سالەکانی ١٩٢٤ - ١٩٢٥ دا لە بەغدا پێکەوە گرتبوویان ، بێکەس لە ریزی پێشەوە وەستابوو ، وینەیەکی ئێسك سووکو سەیریش بوو ، نازانم چی لێ هات . بەداخەوە ئەو وێنەیەی وا دیارە نەماوە کە خۆشی زۆری لابەنرخ بوو .

لە دیوانەکەی بێکەسدا پارچە شیعریکم هەست کرد کەتیایدا نەبوو ، یەکیکشم دی لە هەندێك شوینیدا وەك خۆی نەبو کە خۆم لە دەم بێکەسم بە جۆرێکی تر بیستوە و بەلکو لە کاتی خۆیدا لە بەرم کردوە .

یەکەم پارچە کە لە دیوانەکەیدا نەبوو ئەمەیە :

**تانجەرۆ**

**ئەی تانجەرۆ ، کەوسەری هەمو خاکی کوردستانی خۆمانی**
**بەراوی تۆ ، سەر بەرزقو خێر ، پر دەغلو دانی زۆر جوانی**
**تەوسیفی تۆ ، قەت نایەتە ، تەحریرو نووسین**
**هێندە پر فائیدەی جوانی ، باعیسی فەخری کوردانی**
**خورەی ئاوەکەی تۆ ، هەموو غەمێك لە دڵ ئەبا**
**سەوزایی دەوری تۆ ، عالەمێك پر سرور ئەکا**
**مەنزەرەی تەبیعی ، هەمتای بەهەشتی فیردەوس ئەکا .**

شیعرەکەی تری کەمن بەو جۆرەم نەبیستوە کە لە دیوانەکەدا هاتووە ، شیعرەکەی رەمەزانەو بەم جۆرە دەست پێ ئەکات نەك بەو جۆرەی لە دیوانەکە دایە :

**غەلبە غەلبی خەلك ، زۆرە تێناگەم**
**هەر ئەلێن هەورەو فەرق پێناکەم**
**یەکێك هات وتی : چۆنی نازانی**
**ئەلحەمدوللا ، خۆ موسولمانی**
**سبەی دوسبەی وا رەمەزانە**
**مانگیکی گەورەی موسولمانانە**
**ئەم خەلکە بۆیە گردن لێرانە**
**بزانن مانگ دیارە یاخود پەنهانە**

دوای ئەوە لەبەیتی پانزە هەمدا راستیەکەی بەم جورە یە نەك وەك لە دیوانەکەدا هاتوە :

ئەوقاتم بەبێ هێزی هەر وەك تر
ئەرۆمو کەوتووم وەك مریشك بەکر

هەروەها بەیتی بیستو پینج هەم راستیەکەی بەم جۆرەیە :

**ئەگەر هەوالی ئەویش ئەپرسی**
**باسی توتنە یاخود مەبعووسی**

بەیتی بیستو هەشتیش بەم جۆرەیە نەك وەك لە دیوانەکەدا هاتوە :

**ئەوا بەم حاڵە شەومان رابوارد**
**چوینەوە ماڵێ پارشێویشمان خوارد**

بەیتی سیو یەکیش بەم جۆرەیە :

**تەبیعەت گەرمە هەروەك ئاگرە**
**بۆ شەرو هەرا دایم حازرە[4]**

ئەمە بو ئەو شتانەی بەر چاوم کەوتن ، بێگومان ئەم توزە کەموو کوریانەش هەرگیز لە نرخی دیوانەکەو لە ئەرکو عەزیتی کاکە حەمەی مەلاکەریم کەم ناکەتەوە ، بەڵکو بە پیچەوانەوە کاکە حەمە خۆی زیاتر هانی دام کە ئەم تێ بینیانە بخەمە روو .

---

(١) لاپەرە (٣)ی دیوانەکە .
(٢) سەیری بەرگی دووی رشتەی مرواری لاپەرە ٢٧ - ٢٨ بکە
(٣) حاجی ئەمینی کاکە حەمە قسەزان وقسەنەستەق بوو ، هەروەها میرزا عارف برای . خۆ ئەحمەدی میرزا ئێستاش هەموکەس بە عەزرەت قسەخۆشەکانیەوەن .
(٤) سەیری لاپەرە ١١٦ - ١١٩ بکە

# پترۆف فۆدكن

**بهاء الدين جلال**
**ئامادەی كردووە**

(شۆڕشی دوارۆژ هێزێكی سروشتی‌یەو پەیوەندی بە مرۆڤ‌و زانستی‌یەوە هەیە) .. هەر لە منداڵی‌یەوە ئەم فەلسەفەیە كاری تی‌كردو تەزووی بە لەشیدا دەهێنا ، تاوای لی‌هات خۆی لەناو ئازارو كێشەیەكی بێ‌سنووری ئەو كاتەی وولاتەكەیەوە دۆزی‌یەوە .

لە ساڵی ١٨٧٨دا لە شارێكی خنجیلانەی دەم كەناری زێی ڤۆلگا چاوی ژیانی هەڵێنا .. پترۆف فۆدكن .. لە خێزانێكی هەژارو سادەدا شارەزای نهێنی‌یەكانی جیهانی ئەو سەردەمە بوو .. خەبات‌كردن‌و سووربوون لەسەر مافی ئادەمیزادو خستنە ڕووی كێشەكانی ی دروشمی ژیانی رۆژانەی فۆدكن بوو .. هەر لە منداڵی‌یەوە وێجی دایك‌و باوك و خزمەكانی بووە .. ئەم پەیوەندی‌یە كۆمەڵایەتی‌یانەش بە شێوەیەكی ئەوتۆ لە كارەكانی رەنگی دایەوە كە بەرهەمەكانی مۆركی سۆزو عاتیفەی راستەقینەی پێوە دیاربێت ..

فۆدكن .. هەر لە منداڵی‌یەوە خووی دایە نیگاركردن .

وردبینیو ڕاستگۆییو جوانیی لە بەرهەمەکانیدا دیارو ئاشکرابوون . . سەرەڕای ئەو هونەرە ، دەستێکی بالآشی لە نووسین‌دا هەبوو . . شانۆگەری زۆری نووسی ، بەناوبانگتریان شانۆگەری (قوربانی)بوو . .

مامۆستاکانی فۆدکن سەریان لە لێهاتوویی‌و دانایی‌و ژیریی ئەم لاوە سوڕدەما . . چیرۆکەکانی سەردەمی خۆی خوێندەوە . . چیرۆکی نووسی بەڵام تابلۆی کەمی دەنووسی ، دەیگووت (نووسەر نابێت زۆر بنووسێت و کەم بخوێنێتەوە چونکە شتی زۆر ئەگەر زیرەکی‌و وریایی تیا بەکار نەیەت ئەوا ئامانجی بەسوود ناگەیەنێت‌و مرۆڤ دەبێت زۆر گوێ ڕابگرێت‌و کەم بدوێ‌و بنووسێ) .

تەمەنی فۆدکن گەیشتە (١٤) ساڵ . . ڕوویکردە ئەکادیمیای هونەرەکان‌و پاشان بەرێکەوت ئافرەتێکی نیگارکێشی ناسی‌و کردی بە هاوسەری ژیانی .

چەند ساڵێکی نەخایاندو ڕوویکردە شاری (پترسبۆرگ) لەوێش لە قوتابخانەی (چکنلز) ناوی خۆی نووسی لەم قوتابخانەیەدا جۆرەکانی وێنەو نەخشەی ئەندازەو هونەری سیرامیك فێربوو . . بەمەشەوە نەوەستا تا لە هاوینی ساڵی ١٨٩٨دا گەڕایەوە مۆسکۆ ، چووە کۆلیجی ئامادەکردنی هونەرمەندە نیگارکێشەکان . . حەوت ساڵی ڕەبەق تێدا خوێندو لەم ماوەیەشدا نزیکەی بیست چیرۆك‌و چیرۆکی شیعرو دوانزە شانۆگەری نووسی .

فۆدکن . . خواست‌و ئامانجەکانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەیان دەسەند ، بۆیەکا چووە ئەڵمانیاو لە قوتابخانەی (هونەرە بەناوبانگەکان) لە شاری میۆنیخ شارەزایی‌یەکی تەواوی لە نیگارکێشاندا پەیداکرد . . ئەم قوتابخانەیە بنکەی هونەرمەندانی ئەو سەردەمە بوو ، کە زۆربەیان لە وولآتانی ئەورووپای ڕۆژئاواوە هاتبوون . . لەو قوتابخانەیەدا کارەکانی هونەرمەندە بەناوبانگەکان ڕووسیای بە تایبەتی (کردۆنسکی) بەسەرکردەوە . لاسایی زۆربەی مامۆستاکانی ئەو سەردەمەی کردەوە . .

لە ساڵی ١٩٠٥دا بڕوانامەی دیپلۆمی بەرزی لە کۆلێجی ئامادەکردنی هونەرمەندان وەرگرت ، تا لە ساڵی ١٩٠٦دا دەرهێنانی شانۆگەری (قوربانی)ی گرتە ئەستۆ . . بە جۆرێك کە ڕەخنەگرانی شانۆ بایەخێکی هەرە گرنگی‌یان پێ‌داو جێگای سوپاسی کردن‌و ڕێزلێنان‌بوو .

پترۆڤ لە کارە هونەری‌یەکانی‌دا پەنجە بۆ کۆمەڵ‌و نەخۆشی‌یەکانی درێژدەکات ، کە تا ئەو ساڵەی دیپلۆمی بەرزی لە کۆلێجی هونەرمەندان وەرگرت لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاردا دەینالآندو زوڵم‌و زورداری و هەژاری باڵی بەسەر میللەتەکەیدا کێشابوو . . لەبەرهەمەکانی‌دا . داوا لە میللەت دەکات کە هۆشمەندی‌و تێکۆشان بکەن بە خۆراکی ژیان ، سەربەستیی مرۆڤ تاکە ئامانج‌و خەمی ڕۆژانەیان‌بێت . . ڕێبازی هونەریی پترۆڤ تا ڕادەیەك کەوتە ژێر باری هونەری کۆنی ڕووسەوە ، بەتایبەتی لەڕووی بەکارهێنانی ڕەنگ‌و ناوەڕۆکەوە کە پشت بە کەلەپووری ڕەسەنی ڕووس دەبەستێت . .

لە ساڵی پێراردا سەدساڵ بەسەر لەدایك بوونی ئەم هونەرمەندە مەزنەدا تێپەڕی کەوا یەکێك بوو لەشۆڕە سوارانی هونەری نیگارکێش‌و چیرۆك‌نووسانی ڕووسیا دەورێکی سەرەکی لە ڕەنگدانەوەی واقیعی ئەوسای ڕووسیادا هەبەو ، هەروەها خزمەتێکی بێ‌پایانی گەلەکەی کرد .




د. أنور مصرف

رشانەوە نەخۆشیەکی ترسناکە وە لە جۆری نەخۆشیە تەشەنەدارەکانە واتا لەناو کۆمەڵدا زوو بلاْونەبێتەوە . بێ‌گومان هەموو کەس ناوبانگی ئەم نەخۆشیەی بیستوە بەلاْم بە داخەوە زۆربەی خەڵك تا ئێستا لە خۆپاراستنیو بەربەرەکانی ئەم نەخۆشیە هیچ شتێك نازانێ کە ئەمەش جێی داخو مەترسیە ئەم نەخۆشیە زۆر کۆنە . ناوبانگ‌دارە لە کاتێ کە ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ داگیرکردنی هیندوستان ئەچوو یەکێك لە مێژوو نوسەکانی باسی ئەم نەخۆشیەی کردووە . دەڵێ نەخۆشیەکی خراپ لە هیندوستان هەیە هەر کەسێ دووچاری بێ دەم‌وچاوی زەرد هەڵئەگەڕێو چاوی بەقوڵدا ئەچێ لێوەکانی شین ئەبێتەوەو پێستی زکی ئەچێتە ناوەوە وە چەرمی لەشی چرچو ووشك ئەبێت هەر وەکو یەکێکی سوتاو یەتە بەر چاوەود وە ئەم نەخۆشیە روی لە هەر وولاتو شارێك بکردایە وێرانی ئەکردو زۆری لێ ئەکوشتنی . ئەم نەخۆشیە دوژمنێکی گەورەیەو هەمیشە هەڕەشە ئەکا لە ژیانی ئادەمیزادو زیانی زۆری داوە لەڕووی ژیانو باری ئابوری کۆمەلاْیەتیەوە وە تا ئێستاش بەردەوامە لەو هەڕەشەو پەلاماردانە بۆ سەر ژیانی ئادەمیزاد جا بۆیە پێویستە باشی بیناسینو خۆمانی لێ بپارێزین

**مێژوی نەخۆشی رشانەوە :**

ئەم نەخۆشیە بەزۆری لە هندستاندا وە بەتایبەت لە هەرێمی (بەنگال)، هەیەو جێ‌نشینە لەوێوە بلاْو ئەبێتەوە بە جیهاندا بەشێوەی شەپۆلێ . لە سەدەی (١٩) تا سەدەی (٢٠) شەش شەپۆلی گەورە بلاْوبۆتەوە بە جیهاندا وە عێراق دووچاری

چوار لەم شەپۆلانە بوە وە هۆی گەیشتنی ئەم شەپۆلانە میوانە رۆژهەلاتیەکان بوون . جا لەبەر ئەوەیە لەپێش هەموو شارەکاندا لە شاری بەسرەدا بلاوئەبوەوە لەوێشەوە پەرەی ئەستاند بۆ شارەکانی تری عێراق . تەنیا جارێکیان ئەم نەخۆشیە لە ئێرانەوە هات وە لەپێشەوە دانیشتوانی شاری خانەقین دوچاری بون لەوێوە بلاوبوەوە بە شارەکانی ترا کە ئەمەش لە سالی ٩٦٦ و ٩٦٧ دا بوو ئەو شەپۆلانەی هاتونەتە عێراقەوە لە سالانی ١٩٢٣ - ١٩٢٧ – ١٩٣١ و ١٩٦٦/٥٩١ر٢ هەزار کەس توش بون بەپێ‌ی ژمارەی میری هەروەها زۆر کەسی تریش دووچاری ئەم نەخۆشیە بون وە مردوون بێ‌ئەوەی میری ئاگادار کرابێ تەنها شەپۆلی سالی ١٩٣١ کە لە هەرێمی باکوری وولات بلاو بوبووە بو بەهۆی مردنی ١٩٥٢ کەس لە سالی ١٩٤٧ شەپۆلێك هات بەسەر وولاتی میسردا لەو کاتەدا کە سەربازە هیندیەکان لە میسردا بون کە بو بەهوی مردنی ١٥،٠٠٠ کەس .

لە سالی ١٩٤٥ ١٩٥٩ نزیکەی ١٦٤،٠٠٠ هەزار کەس لە وولاتی هیندستاندا بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە مردن – دوا شەپۆلێ لە سالی ١٩٧٠ کە هات بەسەر ئەوروپاو ئاسیا دوا ژمارە کە بلاوکراوەتەوە لە (٣٠) وولاتدا لە ماوەی ٣ سێ مانگ ٢٢،٠٠٠ هەزار کەس توشی ئەم نەخۆشیە بوون .

**هۆی نەخۆشی رشانەوە :**

هۆی نەخۆشی رشانەوە میکرۆبێکە کە زانیاری بە ناوبانگ (رۆبرت کوخ) لە سالی ١٨٨٣ لە شاری ئەسکەندەریەدا دۆزیویەتەوە وە ناوی ناوە (ڤیبر کولێرا) وە لە ویرگول یا تیپی (و) ئەچێت بەلام لە سالی ١٩٠٥ – ١٩٠٦ دەرکەوت کە میکرۆبی ئەم نەخۆشیە شەش جۆرە . ئەم جۆرانە دەرکەوتن لە پاش تەماشا (فحص) کردنی پیسایی ئەو حاجیانەی کە لەدوای گەرانەوەیان ئەمردن وە ناوی ئەو جۆرانەیان نا (الطور)و میکرۆبی الطور ئەبێتە هۆی نەخۆشیەکی سوکتر وەکەمتر مەترسی لێ‌ئەکرێت لە جۆرەکانی تر .

**چۆنیەتی گرتنو بلابونەوەی رشانەوە :**

تەنها یەك رێگا هەیە بۆ چونە ژورەوەی میکرۆبی رشانەوە ئەویش رێگای خواردنو خواردنەوەیە . کە لە دەمەوە ئەچێ بۆ ناوسك (معده)و ریخۆلە وە لەدوای گەیشتنی بۆ ناو ریخۆلە ماوەیەك ئەمێنێتەوە وە دەست‌ئەکات بە زیاد بون ئەو ماوەیە لە (٣) سەعات تا (٣) رۆژ یا تا (٦) رۆژ ئەخایەنێ بەپێ‌ی کەمو زۆری میکرۆبەکانی ئەم نەخۆشیە کە هێزو بەربەرەکانی لە لەشی نەخوشەکە دا کزئەکا وە ئەو ماوەیە کە میکرۆبەکەی تێدا ئەمێنێتەوە لە ریخۆلە پێ‌ی ئەلێن ماوەی هەلهێنان و هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە لە نەخۆشەکەدا نابینرێت . پاش ئەو ماوەیە نیشانە گرنگەکانی ئەم نەخۆشیە دەرئەکەوێ لەگەل رشانەوەو زگ‌چون وە ئەگەر رشانەوەو پیسایی نەخۆشەکە بە میکرۆسکۆب تەماشابکرێ بە هەزارەها میکرۆبی تێدا ئەبینرێت . چۆنیەتی بلاوبونەوەی ئەم میکرۆبانە لە نەخۆشەوە بۆ خەلکی تر بەم جۆرەیە :

١ – بەهۆی مێشەوە کە ئەنیشێتەوە بەسەر پیسایی‌و رشانەوەی نەخۆش ئەگەر لە جێگایەکی بەر بەرەلا فرێ‌درابێ . ئەوسا بالو قاچەکانی مێشەکە هەزارەها میکرۆب هەلئەواسێت وە کاتی ئەم مێشە ئەنیشێتەوە بەسەر هەر خواردنێك یان خواردنەوەیەك ئەوسا ئەم خواردنە پرئەبێ لە میکرۆبی کولێرا وە هەر کەسێ ئەم خواردنە بخوا ئەم نەخۆشیە ئەگرێ .

٢ – بەهۆی ئەو کەسانەوە کە خزمەتی نەخۆشە کە ئەکەن ئەگەر دەستیان کەوتبێ لە جلو نوێنو خاولی نەخۆشەکە کە بە پیسایی یان رشانەوەی تەر بوبێ . وە ئەو میکرۆبانەی کە بە دەستیەوە گیرساوەتەوە لەگەل خواردن یان خواردنەوە ئەچێتە ناو ریخۆلەکانیەوەو ئەم نەخۆشیە ئەگرێ .

٣ – لە ماوەی هەلهێنان‌دا کە میکرۆبی رشانەوە لەناو ریخۆلەو پسایی دا هەیە بەلام هێشتا نیشانەی نەخۆشیەکەی لێ دەرنەکەوتووە ئەم جۆرە کەسانە زۆرتر مەترسیان لێ‌ئەکرێت بۆ بلابونەوەی نەخۆشیەکە چونکە بە ساغ لە قەلەم ئەدرێن لەناو کۆمەلدا وە کەس خۆیان لێ ناپارێزێ وە بە سەربەستی تێکەل بە کۆمەل ئەبن وە هاتوچوی جێگا گشتیەکان ئەکەن وە نەخۆشی بلاوئەکەنەوە .

٤ – دوا جۆر بۆ بلابونەوەی ئەم نەخۆشیە ئەو کەسانەن کە تازە چاك بونەتەوە بەلام لەناو ریخۆلەو پیسایی‌یەکانیان میکرۆبی ئەم نەخۆشیە هەر ماوەو بلاوئەبێتەوە .

پارێزگاریش لەو کەسانە ناکرێ لە لایەن کومەلەوە کە لایان

وایە کە چاك بونەتەوەو . لەبەر ئەوە ئەم دوو هۆیەی دوای گەورەترین وە گرنگترین هۆن بۆ بلاوکردنەوەی ئەم نەخۆشیە .

٥ – ئاویش زۆر جار ئەبێتە هۆی بلاوکردنەوەی ئەم نەخۆشیە ئەگەر سەرچاوەی ئەو ئاوە میکرۆبی ئەم نەخۆشیەی تیٚچوبێت بە جۆریٚ لەو جۆرانەی باسمان کردن .

**نیشانەی رشانەوە :**

پاش چونە ژورەوەی میکرۆبی رشانەوە بۆ لەشی مرۆڤ بە هۆی خواردن یان خواردنەوەوە باش ماوەی هەلٚهێنان (مدة الحضانة) ئەم نیشانانەی لیٚ دەرئەکەویٚ :

١ – رشانەوە لەگەلٚ زگچونێکی زۆر وە بیٚ ئازار

٢ – رەنگی رشانەوەو پیسایی نەخۆشەکە وردە وردە رەنگی زەردی لیٚ کەم ئەبێتەوە وە بەرەو سپیەتی ئەروات تا لە ئەنجامدا رشانەوەو پیسایی‌یەکە وەکو ئاوی برنجی لیٚ دێت وە هۆی سپی‌بونی رەنگی رشانەوەو پیسایی نەخۆشەکە ئەوەیە کە دیواری ناوەوەی ریخۆلەکانو زگ دائەمالرێت وە لەگەلٚ رشانەوەو پیسایی دێتە دەرەوە .

٣ – ئەم زگچونو رشانەوە زۆرە ئەبیٚ بەهۆی کەم‌بونەوەی ئاو لە لەش و لە خوێندا وە خوێن خەست ئەبێتەوە ئەمەش ئەبێتە هۆی دەرکەوتنی گەلیٚ نیشانەی تر وەکو .

٤ – هەست‌کردن بە تینوەتیەکی زۆر لە لایەن نەخۆشەکەوە وە زمانو پێستی لەشی ووشك ئەبێت وە کە ئەگەر ئاوی بدرێتیٚ جارێکی تر هەر ئەرشێتەوە .

٥ – هەست‌کردن بە بیٚ‌هێزیٚ لەبەر سست‌بونو ووشك‌بوونی هەمو ماسولکەکانی لەش . وە دەنگی دەر ناچێت هەرچەندە بیشیەویٚ بدوێت وە لە چرپە زیاتر هیچی تری لیٚ نابیستریٚ .

٦ – میز کەم ئەبێتەوە وە گورچیلەکانی لە ئیش ئەکەوێت نزیکەی ٥٠٪ لەوانەی ئەگەنە ئەم رادەیە ئەمرن ئەوانەی کە چاك ئەبنەوە بە دەرمان یان لە خۆیانەوە وردە وردە میزیان زۆر ئەبیٚو رشانەوەو زگچونیان کەمتر ئەبێتەوە .

**چۆنیەتی ناسینی ئەم نەخۆشیە : –**

١ – ئەم نیشانانەی سەرەوە بەسن بۆ ناسینی ئەم نەخۆشیە لە کاتێکدا کە ئەم نەخۆشیە لە جیهاندا یا لە وولاتـەکـانی دەورویشتانـدا بلاوبویێتەوە . بەتایبەتی زگچونو رشانەوەی زۆری بیٚ‌ئازارو پێچی زگ بەلاٚم ئەگەر نەخۆشیەکە نەبێت لەکایەدا ئەوسا دۆزینەوەو ناسینی نەخۆشی کولێرا ئاسان نابێت .

٢ – بۆئەوەی کە بەتەواوی دلٚنیا بین لە رودانی ئەم نەخۆشیە پێویستە رشانەوەی نەخۆش یا پیساییەکەی بە میکرۆسکۆب تەماشابکرێت وە میکرۆبی ئەم نەخۆشیەی تێدا ببینرێت وە گەلێك جار پێویستی بەوە ئەبیٚ کە پیسایی‌کە یان رشانەوەکە بچێندرێت بە جۆریکی تایبەتی وە لەپاش پەرەسەندنی میکرۆبەکە لەوشوێنە تایبەتیە کە تێدا چاندراوەو تەماشاکردنی بە میـکرۆسکۆب‌و دەرکەوتنی میکرۆبەکە ئەتوانین سوربین لە روودانی ئەم نەخۆشیە .

**زورجار وەبەتایبەکی لە کاتیِ تەواو بونەوەی ئەم نەخۆشیە جیاکردنەوەری گەلیٚ نەخۆشیکە لەم نەخۆشیە ئەچیٚ ئەبیتە ئەرکێکی گران بۆ سەرشانی نەخوش وخزمیِ نەخۆش‌و زۆر جاریش بۆ سەر دوکتورەکانیش . چونکە نیشانەکانی نەخۆش رشانەوە لەم نەخۆشیانەی خوارەوە ئەچێت :–**

**١ – سوتانەوەی (التهاب) ریخۆلەو زگ (معدة)**

**٢ – ژەهراوبون (التسمم) بە خواردن .**

**٣ – زك‌چون (دیزانتری)**

**بەلاٚم ئەوەی شایانی باسە زگچون لێرەدا بە پێچ‌و ئازارە بەپێچەوانەی زگچونی نەخۆش رشانەوە کە بەبیٚ ئازارو پێچە**

**چارەکردنی :**

بێگومان هەمو نەخۆشێکی رشانەوە ئەبیٚ بخرێتە خەستەخانەوە وە هاتوچۆی لەگەلاٚ قەدەغەبکرێت .

بناغەی چارەکردنی «کولێرا» هەولٚدانە کە خوێنی نەخۆشەکە خەست نەبێتەوە و . ئەرازوی ئاو وە هەمو جۆرە خوێکانی ناو خوێن بکرێت گوایە چەند ئاوو خوێن دەردەچێت لە لەشی نەخۆشەکە ئەبیٚ ئەوەندەی ئاوو خوێن لیٚ رۆیشتوە بیدرێتەوە . لە رێگەی دەمارەوە بە جۆری (نورمال سلاین) Normal Salinc یاخود جۆرەکانی تر بەپیٚی پێویستی وە پاش فحص کردنی خوێن بۆ ئەوەی بزانین چە جۆرە خوێنێك کەم‌بوە تا بیدرێتی وە زۆر

جار پێویست ئەبێ کە ٢٪ بیکاربۆناتی صۆدیۆم یاخود ١٪ کلۆرایدی پۆتاسیۆم بێجگە لە ٠،٩٪ کلۆریدی صۆدیۆم بدرێتێ .

وبیتراسایکلین وە کلۆرۆمایسین وە گەلێ انتی‌بایوتیکی تر ئەگەر بدرێت بە نەخۆشەکە لە سەرەتای نەخۆشیەوە زۆر سودبەخشە وە کە نەخۆشەکە بەرەو چاك‌بونەوە چو توانی بخواو بخواتەوە پێویستە ئاو وە شەربەتی میوەی زۆری بدرێتێ وە هەر کە توانی بخوات بەتایبەتی گۆشت وە خواردنی پرۆتینی بدرێتێ .

**خۆپاراستن :**

ئەگەر نەخۆشی رشانەوە لە ولآتدا بلاوبوبێتەوە یاخود مەترسی بلاوبونەوەی لێ بکرێ پێویستە هەموو کەسێك خۆی بکوتێ واتە دەرزی ئەم نەخۆشیە لەخۆی بدات بۆ ئەوەی هێزی بەرهەڵستی لە لەشی مرۆڤ زۆر بێ بۆ بەربەرەکانێ ئەم نەخۆشیە جا لەبەر ئەوە پێویستە هەموو کەسێك دوو جار دەرزی رشانەوە لە خۆی بدات لە ماوەی هەفتەیەکدا وە کاری ئەم دەرزیە تا سەو نیە بەڵکو تا (٦) شەش مانگ بەرهەڵستی ئەکات وە لەپاش ئەم ماوەیە وردە وردە هێزی بەرهەڵستی کەم‌ئەبێتەوە وە لەدوای سالێك هێزی بەرهەڵستی تەواو ئەبێت وە پێویستە جارێکی تر بە دەرزی تر بەکار بهێنرێت بۆ تازەکردنەوەی هێزو بەرهەڵستی لەشی مرۆڤ دا بۆ شەش مانگی تر زۆر بەداخەوە گەلێ کەس وا ئەزانێت کە خۆی کوتا دژی نەخۆشی رشانەوە ئیتر هیچ جۆرە پارێزگاریەکی تری پێویست نیە وە هەرچیەك بخوات وە بخواتەوە مەترسی لێ ناکرێت بەلآم وا نیە بەڵکو ئەوەی خۆی کوتاوە توشی ئەم نەخۆشیە ئەبێت وەك ئەوانی تر ئەگەر خۆی نەپارێزێ بەپێی ئەو ئامۆژگاریانەی خوارەوە . تەنها یەك جیاوازی نەبێ لەگەڵ ئەوانی تردا ئەوەش ئەوەیە کە ئەوانەی خۆیان کوتاوە ئەگەر توشی ئەم نەخۆشیە بون بەجۆرێکی سوکتر ئەیانگرێ وە بە ئاسانی رزگاریان ئەبێت .

**چەند ئامۆژگاریەکی گشتی بۆ خۆپاراستن :**

١ – بەکارهێنانی ئاوی بۆری لە شارەکاندا کە بە کلۆر پاك (تعقیم) کراوەتەوە مەترسی لێ ناکرێت . چونکە لەو کاتەدا میری دەزگاکانی (أجهزة) کە پەیوەندیان هەیە بە پاراستنی باری تەندروستی زۆرتر گوێ ئەدەن بە پاك‌کردنەوەی ئاو وە کلۆر زیاتر ئەکەنە ئاوەکەوە بۆ دڵنیابون لە پاکی ئاوی بۆریەکان بەلآم ئەگەر لە جێگایەك بویت ئەم جۆرە ئاوە دەست‌نەکەوت ئەبێ ئاو بکوڵێنیت باش ساردبێتەوە ئەوسا بەکاری‌بهێنیت بۆ خواردنەوە .

٢ – میوەو سەوزە پێش شۆرینەوەو پاك‌کردنەوە خواردنی زۆر بەزیانە چونکە زۆر لە باخەوانەکان میوەو سەوزە بە ئاوی ئاوەڕوی مالآن ئاو ئەدەن بەتایبەتی ئەو باخەوانانەی کە ئەکەونە خواروی شارەکان جا لەبەر ئەوە ئەبێت لەپێش خواردنی بە (پرمنغنات) یا (کلۆراکس) پاك بکرێتەوە .

٣ – ئەبێ نەخۆش لە خەستەخانەدا بکەوێت وە بمێنێتەوە تا چاك‌ئەبێتەوە وە میکرۆبی نەخۆشیەکە لە پیسایی‌یەکەیدا نەمێنێت بەتەواوی ئینجا رێ‌بدرێت بۆ چونەدەرەوە لە خەستەخانە .

٤ – رشانەوەو پیسایی نەخۆش ئەبێ پێش فرێدان بۆ ناو ئاودەستخانە پاك‌بکرێتەوە بەهۆی دەرمانی تایبەتی وە نابێ فرێ‌بدرێتە جێگایەك کە مێشی لێ‌بنیشێ .

٥ – ئەبێ پێش خواردن وە خواردنەوە دەست پاك بشۆرێت بە ئاوی پاك‌و صابون وە هەروەهاش لەدوای لێبونەوە .

٦ – ئەبێ جل وە نوێنی نەخۆش هەموی پاك بکرێتەوە یا بسوتێنرێت .

٧ – نابێ بەهیچ جۆرێك شیری نەکوڵاو بخورێتەوە وە خواردنەوەی شیری پاك باشترە ئەگەر دەست‌کەوێ .

٨ – لەناوبردنی مێش لەناو ماڵ‌و دوکانەکاندا هۆیەکی زۆر گرنگە بۆ بەربەرەکانی کردن‌و بەرهەڵستی ئەم نەخۆشیە وە نابێ بەهیچ جۆرێك رێگە بدەی مێش بەسەر خواردن‌و خواردنەوەوە بنیشێتەوە .

٩ – ئەبێ هەموو خواردن‌و خواردنەوەیەك دا بپۆشرێت وە لە مێش بپارێزرێت .

١٠ – ئەبێ هاتوچۆ لەو گەورەکەی نەخۆشی تێدایە قەدەغەبکرێت .

١١ – هەموو کەس ئەبێ دەرزی دژی ئەم نەخۆشیەی لێ‌بدرێت جگە لە منالی شیرەخۆرە .

أ – منال لە (١) سال تا (٤) سال $\frac{1}{4}$سی سی لێ‌ئەدرێ .

ب – منال لە (٥) سال تا (٧) سال $\frac{1}{2}$سی سی لێ‌ئەدرێ .

جـ – منال لە (٨) سال زیاتر ١ سی سی لێ‌ئەدرێ .



# تێکەڵاوبوونی دەرمانو کارتێکردنی

نووسینی : دکتور علي عواد الجبوري
نجاة رفیق حلمي کردوویە بە کوردی

ئەوەی کە سەرنج ڕائەکێشێ لەم ساڵانەی دوایییەدا ئەوەیە کە پزیشکەکان گەلێ داوو دەرمانی جۆراو جۆر بۆ نەخۆش ئەنووسن . جاری واش هەیە هەر لە خۆیانەوە ڕەچەتەی دەرمان بۆ نەخۆشەکە ئەنووسن .

هەندێ جار یەك دوو دەرمان بۆ نەخۆشەکە ئەنووسن کە کارتێکردنیان وەك یەکە .

هەندێ جاریش نەخۆشەکە خۆی ئەبێتە پزیشکی خۆی کە دەرمان بۆ خۆی ئەکڕێو وا ئەزانێ پیێ چاك ئەبێتەوە .

هەروەها ئەو دەرمانانەی کە بۆ لەناوبردنی مارو مێروی ناو ماڵ بەکاردێ ئەبێتە هۆی پیسکردنی ئاوو هەوا «البیئة» . چونکە هەندێکی مادەی «کلورینی» تێدایە کە کاردەکاتە سەر ئەنزیمەکانی «میکروسوماتی» جگەر . ئەمەش ئەبێتە هۆی جۆرە کارکردنێکی نارەوا .

## هەلمژین بەرێگای ڕیخۆڵەدا

ئەو مادانەی دژی ترشێن یاخود ترشەلۆکی کە «کالسیوم . مغنسیوم» یاخود «ئەلەمنیوم»ی تێدایە توانای کارلەیەك کردنی لەگەڵ مادەی «تتراسایکلین»دا هەیەو ئەبنە هۆی دروستکردنی تێکەلاوێکی «مرکب» ئاڵۆز لەبەر ئەوە نابێ ئەم جۆرە مادانە پێکەوە بدرێن بە نەخۆشی .

هەروەها کاربۆنات‌و فیتامینات کار ئەکەنە سەر ئایۆناتی ئاسن‌و لەکاری ئەخەن .

هەندێ مادەی تر هەیە دژی ترشەلۆکییەو «المنیوم»ی تێدایە لەگەڵ هەڵمژینی فۆسفات ڕێك ئەکەوێ .

هەموو ئەو مادانەی دژی ترشەلۆکین «حموضە» ئەبنە هۆی کەمبوونەوەی هەڵمژینی ترشەلۆکە لاوازەکان وەکو «فینال بیوتازون» و «نیترو فرانثوین» و «مرکبات»ی سلفا .

هەندێك «پاریثوریت» و ئەوانەی دژی مەیاندنی خوێنن «تخثر الدم» کە بە ڕێگای دەمەوە ئەدرێ بە نەخۆش .

ئەو مادانەی دژی ژیانەوەن «المضادات الحیویة» کە لە ڕێگەی دەمەوە ئەدرێ . بۆ لەناوبردنی میکروب لە ڕیخۆڵەکاندا کارتێکردنێکی خراپیان هەیە بۆ سەر فیتامین «K»

هەروەها مادەی «ترایمترین» و فینتوین ئەبێتە هۆی نەخۆشی «میکاپلاستیك ئەنیمیا» لە ئەنجامی کارتێکردنی ترشی «خولیك»و کەمبوونەوەی لە لەشدا .

ڕۆنە مەعدەنیەکانیش ئەبنە هۆی کەم هەڵمژینی فیتامین «D» چ لەناو خۆراکدا بێ یاخود بە رووتی وەربگیرێ .

هەندێ کار لەیەككردنی کیمیاوی زیانبەخش ڕوو ئەدا . کە ئەم جۆرە دەرمانانە بە ڕێی دەماری خوێن‌دا ئەکرێن بە

لەشدا . وەکو تێکەڵکردنی «ادرینالین» لەگەڵ «قتیسلین» یاخود تێکەڵکردنی «کاربنسلین» «جنتمایسین» کە یەکەمیان دووەمیان لەکار ئەخا .

«مونافەسە بۆ یەك‌گرتن لەگەڵ پرۆتیناتی خوێن» —

گەلێ دەرمانی هەیە کە توانای یەکگرتنی لەگەڵ پروتیناتی خوێن‌دا هەیە کە لە ئەنجام لەکار دەکەوێ .

مادەی «دایکومارۆل» توانای جێگرتنی «تولبوتامید»ی هەیە لەگەڵ پروتیناتی خوێن کاریان لەیەك کردووە کە بەمەش رێژەی شەکر لە خوێن‌دا کەم‌ئەبێتەوە «هایپوگلایسیمیا» .

مادەی «کلورال هیدرید» توانای مادەی «دارفارین» کە دژی مەیاندنی خوێنە پترەکا بەوەی کە «تریشی ترایکلوراستك» دروست دەکا کە لە ئەنجامی نواندن «تمثیل» پەیدابووە .

«نواندن «تمثیل»

هەندێ دەرمان دەرمانی کە لەکار دەخاو توانای کارتێکردنی خۆی پتر ئەبێ . و بەمەش مەودای کارتێکردنی درێژ ئەبێتەوە .

ئەو مادانەی کارتێکردنی ئەنزیمی «فوثوامین اوکسیدین» ئەبرێ کارێکی خراپ ئەنوێنێ کە ئەبێتە هۆی نەبوونی «تیثرامین» کە لە پەنیرو هەندێ خواردنەوە دایە ئەمەش زیان‌بەخشە لەبەر ئەوە ئامۆژگاری ئەو نەخۆشانەی کە سیلیان هەیە پێویست ئەکرێ کە پەنیر نەخۆن لە کاتی وەرگرتنی دەرمانەکان‌دا . چونکە دوور نیە کە ئەو مادانەی بدرێتێ ئەنزیماتی «کولین استیرنزر) کە «استرات کوین» لە کار تێکردن دەخا . .

مادەی «فینو باربتون» نواندنی «کلومارین» و «نینتوین»و «کریزیوفلین» و «کورتیزون»و «استروجین» و «اندروجین» و «بروجستیوون» پتردەکا .

هەروەها مادە ژەهراوی‌یەکانی کە بۆ لەناوچوونی مارو مێروو بەکار دێت وەکو «دی . دی . تی» نواندنی دەرمان لە لەشدا خێرا دەکا . بەڵکو کاریش دەکاتە سەر ئەو ئەنزیمانەی لە جگەردا هەیەو کە لێپرسراوی نواندنی دەرمانن یا بەزۆری دەنخاتە کار یاخود لەکاری دەخا .

هەردوو مادەی «کوانثرین) و «اسفیتامین» بەرێگای کۆتایی دەمارەکاندا دەرۆن .

مادەی «اسفیتامین» نایەڵێ «کوانثرین» کاری خۆی بکا وەك مادەیەك کە دژی پەستانی خوێن بێ‌و سوودی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە کەم دەکاتەوە .

هەروەها مادەی تریتزول هەمان جۆرە رەفتار دەکا لەگەڵ کوانثرین‌دا . لەبەر ئەوە نابێ پێکەوە بدرێن بە نەخۆش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پەستانی خوێن «ضغط الدم» .

«کارکردنە سەر گورچیلە» —

گەلێ نموونەی وا هەیە کە بۆ ئەوکارە بەیەك چووەدا کە لە گورچیلەدا دەبێت و کاری پالاوتنی کە دەماری خوێن لە گورچیلەدا پێکی‌دێنێ . رژانی «بنسلین» بەهۆی مادەی «برونسید» کە بۆ نەخۆشی «استقاء» بەکاردێ چاکترین کارە .

بەمەش مەودای مانەوەی پنسلین لە لەشدا پتردەکا وە ئەتوانرێ ئەو خەسیتەی کە پێویستە دەسنیشان بکرێ «سالسیلات» دەستکاری لەکارتێکردنی «برونیسید)دا دەکا ئەگەر کەم کەم بەکاربێت .

هەروەها رزگاربوون لە «فینوباربیتون» خێرا دەبێ ئەگەر «بیکربونات»ی سۆدیۆم بەکاربێت ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەیە کە تالژ «قاعدە» دروست دەبێ . ئەمەش نرخێکی گرنگی چارەسەرکردنی هەیە لە حاڵەتی بەژەهەربوون «التسمم» بە «فینوباربیتون»وە بەکارهێنانی «کلوریدی ئەمۆنیۆم» میز ئەگۆرێ بۆ ترشەلۆکی‌و بەمەش یاریدەی لەش ئەدا بۆ رزگاربوونی لەگەلێ دەرمان کە بە خێرایی فرێ‌ی ئەدا .

«گۆرینی سەنگی خوێ‌ی چەسپیو لە لەشدا» —

هەندێ دەرمان هەیە کە کاردەکاتە سەر کەم‌بوون یان زۆربون یەکێ لە «ایونات»ە گرنگەکانی ژیان . وەکو «صودیوم . پوتاسیوم» لە لەشدا بەوەش کارتێکردنی دەرمانەکەی تر کە لە هەمان کاتدا بەکاردێت دەیوەستێنێ .

نزم‌بوونەوەی نیسبەتی پۆتاسیوم بەهۆی دەوراتی تایزاید»هەوە ئەبێتە هۆی تووش‌بوونی دڵە کوتێ لە حاڵەتێکدا کە نەخۆش پێویستی بە مادەی «اجتالس» بێ . وە کە «ادرینالین» و «نورادرنالین» ئەرژێ لە حاڵەتی بەکارهێنانی مادەی «رزرپین»دا کاردەکاتە سەر دڵ کە ئەبێ بە ئاگاداری‌و سڵەمینەوە کە پێویستە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە «اجتالس» بەکاردێنن بۆ بەهێزکردنی دڵ . بەکاربێت .

# بەراهیەك
# ژبو لێكۆلینەوەك
# فۆلكۆرێ كوردی
# ئەركێ فۆلكۆر

**عبدالرحمن علي نقشبندي**

• دڤان دەهـ سالێن چوی‌دا ، بزاڤا ڤیٚ چەندیٚ ، ژبو وەرباندنو بەرفرەهکرنا رەوشەنبیریو هونەری لکوردستانیٚ ، تۆزو هونەریٚ کوردیو ئاڤاکرنا دیوارەکیٚ زەڤەریو پیٚشکەفتنەکا مەزن یاوەرگرتی . رەوشەنبیری ییٚ بنەجهو خورستیو موکم . هەر ژبزاڤا نڤیسەڤانیٚن مە بگرە بو هونینا شعریٚو داریٚژتنا چیٚروکیٚ . . هەتا کومکرنا فولکلوریو ساخکرنا ئاوازیٚن وی .

ئەڤ سرتە ئەوا نڤیسەڤانیٚن مە وەرگرتی بو کومکرنو دیراسەکرنا فولکلۆریٚ کوردی وەنەبیت چاڤلیٚکرنا بیت بیانیا بیت . لیٚ باریٚ نهو مللەتیٚ کورد تیٚرا دچیت یاسەپاندی کو نڤیسەڤانیٚن مە روی بکەنە

• ددویروکا ئەدەبیٚ جیهانیدا بونا هەر سرتەکیٚ ئان خاندنگەهەکیٚ ڤەژەنینا بارەکیٚ بەریترو خاندنگەهەکا کەڤنتربویە کو بەری ویٚ دەست پیکری‌یەو ریٚکا خو بری‌یە . هەر ژئەدەبیٚ کلاسیکی بگرە هەتا ئەدەبیٚ رومانسیو وریالزمیو . . هتد . تاکو گەهشتی‌یە ڤ پیفکی ئەویٚ نهو ئەم دبینین . لیٚ بزاڤا رەوشەنبیریا کوردی بدروستی دڤان سرتیٚن دویروکیٚ‌دا نەچویەو هەکە چبیت ژی زوی یا ژیٚ دەرباز بویو نەمایە تاکو تیٚر ببیت نەخاسمە دمەسەلا ساخکردنو بها ژیٚ وەرگرتنا فولکلوری‌دا چنکو بەرامبەر فرهەیو مەزنی‌یا فولکلۆریٚ کوردی ئەدەبیٚ نڤیٚسی چ بهاییٚ وەسا ژیٚ وەرنەگرتی‌یەو هەکە ژیٚ وەرگرتبیت ژی برەنگەکیٚ گەلە مریو لاواز بویە .

ئەڤ بها ژیٚ نەوەرگرتنە وەنەبیت ژبەر ژاریو کێماتی‌یا فولکلۆریٚ مە بیت بەلکی هەر ژبەر هندیٚ بویە کو نڤیسەڤانیٚن مە

بچاڤەکێ نزم یێ بەرێ خو دایە فولکلوریو ئەو لوێ باوەرییێ بوینە کو فولکلوری کەرەستەکێ دویروکی‌یە یێ کەڤنار هندێ نائینیت کو خو پێڤە بوەستینن ، چنکو ئەڤ فولکلورە نەشێت رامانو ئارمانجێن مروڤێ نوی – یێ نهو – وەرگریتو تێرکەتو ڤیانا ڤی مروڤی بو پێشکەفتنێو پێشڤەچونێ تژی کەت تاکو بزاڤا پێشکەفتنییا ئەورپای‌را بگەهیتو نمونە بوگوتنا مە (ئەو هژمارا کێما وان کتێبو نڤشتوکانە کو لسەر فولکلورێ کوردی هاتی‌نە چاپ‌کرن)[1]

لێ ئەوان نڤیسەڤانا نەدزانی کو بزاڤا ئەدەبێ ئەورپی یالسەر پشتا فولکلوری هاتی‌یە دانانو وەرباندن . ژبەر هندێ ئەز دبێژم بزاڤا ئەدەبێ کوردی چنکو یا بلەزوبەز بویە وەکی دیوارێ سەر بەفرێ یالێهاتی بونمونە : هەکە ئەم بهێین بەرێ خو بدەینە وان چیڤانوکا ئەوێن نهو نڤیسەڤانێن مە دنڤیسن تێریا هونەریو بیری تێدا نینە چنکو چیڤانوك پشتی رومانیو چێروکا کورت دهێت ، لێ نڤیسەڤانێن مە خو لڤێ چەندێ ژی نەگرتی‌یە بەلکی ئێك‌سەر یێن چوینە سەر نڤیسینا چێروکا پوستر . رامان ژڤێ ئاخفتنێ ئەو نینە کو ئەم خو ڤەدەرکەین ژسرتا ئەدەبێ نویو خوبگرین هەتاکو ئەم دهەمی – مەراحلا – را بچین ئەوێن ئەدەبێ ئەورپی تێرا چوی . لێ رامان ژڤێ ئاخفتنێ ئەوە کو باش نینە ئەم بزەبری‌تویز ڤان – مەراحلا – ببرین . بەلکی دڤێ جڤاتو پێشکەفتنا وێ ڤەرێژا پێشکەفتی بسەپینین ، چنکو هەر خەلەکەکێ ئەم بهێلینە دناڤارا مەبڤێتو نەڤێت دێ لپاشەروژێ لێ زڤرینەڤە . هەچکو نهو نڤیسەڤانێن مە ل‌فولکلوری دزڤرنەڤە کو دزڤریتە دەمێ رومانسیەتێ ، چنکو ئەوێ پێدحەسیێن کو بێی فولکلور ڤەرێژا ئەدەبێ نوێ دێ مینتە خلولە . دیسا ئازاکرنا فولکلوری نەکو دێ مە ژموکمیو خورستی‌یا ئەدەبی دویرکەت بەلکی دێ مە ژدرویشمێ تایبەتی یێ نەتەوایی دویر ئێخیتو ئەز دبێم کەس ڤێ چەند لسەر خو قەبیل ناکەت .

ژبەر هندێ هەچکو مە گوتی – دڤان دەهـ سالێن چوی – دا سرتا نڤیسەڤانێن مە سالێ بو سالێ یاراستو دروستتر لێ دهێت . دیسا سویچا هشیار بونا نڤیسەڤانێن مەو دەست هاڤێتنا وان بو کوم‌کرنو ساخ‌کرنا فولکلوری دزڤریتەڤە بو گەش بونا هزرو بزاڤا نەتەوایەتی . راستە سرتا نەتەوایەتی نهو نینە دەست پی‌کری لێ سرتا زانسیو یادووست کو ئەدەبی – تەوزیف – بکەن بو ڤێ رامانێ ژنوی یاکەفتی‌یە چارچوڤێ خو یێ دویروکیو هەر ئەڤ سویچە ژی بویە بناغێ زانستێ فولکلوری هاتی‌یە دانان دەمێ (هەردو برا «کریما» ڤیای دێرینیا دویدوکو زمانێ ئەلمانی خویاو دیارکەن)[2]

ئەوا پێدڤی گوتنێ بیت ئەوە کو بو ڤێ چەندێ – کوم‌کرنو ساخ‌کرنا فولکلوری – دڤێ ئەم بهای ژکارێ مللەتان وەرگرین ئەوێن پویتە دایە فولکلورێ خوو بهای ژوان هەلنگڤتنا وەرگرین ئەوێن ئەو کەفتینێ ، داکو لوان جها بەرێ‌خو بدەینە بەرهێن خو . بو نمونە : دەمێ هەردو برا «گریما» خو دایە کوم‌کرنا فولکلورێ ئەلمانی ئەوان برەنگەکێ گەلە جوانو زیرەك کارێ خو کرو بجهـ ئیناو هەتا نهو بزاڤا وان بچاڤەکێ گەلە مەزن دهێتە خەلات‌کرن (لێ نهو سرتا وان ژلایێ گەلە زانایێت فولکلوریو ئەنترو‌بولوجی ڤە یا هاتی تروکرن ژبەرکو کارێ خو بنیڤەرو یی‌کریو ئەڤ نیڤەرویە یا ژهندێ هاتی کو ئەوان – هەردوبرا – دەست‌کاریا فولکلورێ خو یاکری ، هەر چەندە ئەڤ دەست‌کاری‌یە بئاوایەکێ گەلە هونەریو جوان یێ هاتی‌یەکرن .

هەر ئەڤ چەندەیە ژی وەل مە دکەت کو بێژین : هیڤیا مە ئەوە نڤیسەڤانێن مە بهای ژسەربورا هەرد برا «گریما» وەرگرنو بچ رەنگا دەست‌کاری‌یا فولکلوری نەکەن هەچکو نهو ئەڤ دەست‌کاری‌یە دهێتەکرن دگەلە دەڤێت وی‌دا ئەوێن ل‌روژنامەو گوڤارێن کوردی دهێنە بەلاڤ‌کرن . داکو دبزاڤا خودا دسەرکەفتی بینو خەلەتی یێت نهو نەبنە هەلنگفتنێن سوبەهیو گوتنا گورکی رامانا مە خویا دکەت گاڤا دبێژیت :

«بەراهی‌یا هونەرێ نڤیسینێ



یادفولکلۆری‌دا ، کۆم‌کەن ، پاشی دیراسەکەن ، ژنوی ڤەوژێرن» .

• دڤێ نڤیسینێ‌دا من خۆ لبورێ پێ‌ناسینێن فولکلۆری نەدایە ، چنکو گێژاتی‌و تەمەکا مەزن هێشتا یالسەر هەی‌و هەتا نهو پێناسەکا راست رەوان نەهاتی‌یە کو هەمی زانایێت فولکلۆری ژێ دڕازی‌بن . لێ هندی مەسەلێ تێکەلی بکارێ مەڤە هەی ئەز وەسا باش دزانم کو گاڤا ئەم دبێژین فولکلۆر رامان ژێ ئەدەبێ ژبەرییت - التراث الشفاهی - دگەل کەلەپوریتێ مادی . یانی ئەو کەلەپوریتێ هاتی‌یەوەرگرتن - چ روحی بیت چ‌مادی - پاشی هاتی‌یە ژبەرکرن‌و زانین دڕێکا مەژی‌و کریارێ‌دا بێی کو هاتبیتە نڤیسین)(۳) داکو هەمی چەقێت فولکلۆری هەمی چەقێت کو تێکەلی ب فولکلۆری‌ڤە هەی . بگریت .

دیسا من خونێزیکی خاندنگەهێن فولکلۆری نەکری‌یە کانێ کیشلک راسترەو باشترە ژبادی‌و کانێ هەرخاندنگەهەك چاوا بەرێ خۆ ددەتە فولکلۆری‌و هاتن‌و چونا وی‌و سەروکانی‌یا وی ، چنکو ئەڤێ مەسەلێ ژی تەم‌و مژەکا ستویر هێشتا یالسەرو پربێژی لسەر ڤێ مەسەلێ‌و بێ رەنگێ گشتی تشتەکێ نەدروستە .

لەواژی هندە پرسیارێن سەرکی یێن هەین مە نهو یێن بپشت گوهێ خوڤە هاڤێتین وەکی :

«فولکلۆر چی‌یە ؟ ! لکیرێ زایەو

بویە ؟ ! چاوا دهێتو دچیت ؟ ! کیشلك بابەت ژێ دی کەڤنترە ؟ ! جوداهی یا فولکلوریو کەلەپوریتێ مللی چی یە ؟ ! و . . . هند ژڤان پرسیارا .

بەرامبەر ڤێ چەندێ مە نڤیسینا خو یادانای داکو بەرسڤا پرسیارەکێ بدەین کو ببهاترینو بگرێ ترین پرسیارە ژپرسیارێن زانستێ فولکلوری ، ئەوژی – پرسیار – : «وەزیفێ فولکلوری چی یە ؟ ! !» ژبەر کو «وەزیفێ» فولکلوری ببهاترین مەسەلەیە بو – دارسێ – فولکلوریو ئەنثروبولوجی ، دیسا هەر ئەڤ «وەزیفە»یە فولکلور بلندکریو دانایە جهێ رێز لێگرتنێو ڤیانا جڤاتێ ، تاکو وەلێ هاتی کو ببیتە پارچەك ژبونا جڤاتێو «وەزیفێ» خو بگوهریت لدویف پێڤیاتیێن وێ جڤاتێ ، بو نمونە : هەکو دەیکەك ، چ کورد بیت چ هندیو چ ژهەر مللەتەکێ دی بیت ، گاڤا – ئەلەئەلە – لایێلایێ – دبەر لاندکا خورا دبێژیت ئەو دایك گوهێ خو نادەتە هندێ کانێ ئەو «ستران» ژکیڤە هاتی یەو چاوا هاتی یەو کانێ کیشلك رەنگێ «سترانێ»یە . چنکو وێ – دایکێ – «وەزیفەیەك» ژێ دڤێت ئەوژی نڤستنا زاروکێ وێ یە . دیسا ئەڤ «وەزیفە»یە دهێتە گوهرین بو نمونە : چێدبیت هەر ئەو دایك هەر وێ سترانا دبەر لاندکێرا دگوت ، دبەر هێرانا دستاری ژی را بێژیت داخو مژویلکەت هەتا هەڤرانێ خو دهێریت ، ئان دا ئەڤ سترانە ببیتە هاریکارەك بو نەوەستیانا – رهێت لەشێ وێو هەر ژبەر ڤێ چەزرێ بەژی گەلە – دارس – دکەڤنە خەلەتی یا گاڤا ئاخفتنەکا ڤەبڕ لسەر «وەزیفێ» پارچەکا فولکلوری ددەن . دیسا چێد بیت چەند سترانەك کو دبنەجهێدا هەر ئێکێ «وەزیفە»ك یێ هەی هەمی پێکڤە بهێنە بکار ئینان بو «وەزیفەکی» . بتنێ ژبەر هندێ هەکە مەبڤێت بدروستیو بنەجهـ «وەزیفێ» فولکلوری بزانینو کانێ هەر چەقەك ژڤێ فولکلوری بو چ «وەزیفە» دهێتە بکار ئینان دڤێ ئەم لوەختێ کومکرنێ ڤەبڕ ئاخفتنا خو نەدەین ، دیسا ژبەر کو «وەزیفێ» فولکلوری (یێ پچیای و ڤەدەر نینە ژبارێ رەوشەنبیری یێجڤاتێ ، دڤێ ئەم تێکەلی و یاساو – قیەمێت وێ جڤاتێ – النظم والانساق الاجتماعیة – دیراسە کەین ژبو دیارکرنا دەورێ فولکلوری دپاراستنا بونا جڤاتێداو بەردەوامی یا ڤێ بونێ ، ژبەر هندێ ژی دیراسەکرنا ئەفسانەو چیروکێ ئەو گوتن بەس نینە کو بێژین : فولکلور ئامویرەکە بو «بو راندنا وەختی – خوشیادلی – بلند کرنو رێز لێگرتنا هوزەکێ ئان ئێلەکێ ئان مروڤەکی یان ئامویدەکە ژبو ، هویکرنێو ماتیژیکرنێو بەلاڤکرنو دانا – قیەما – بو مروڤێ جڤاتێو . . هتد ژڤان «وەزیفا» چنکو ئەڤە هەمی «وەزیفێن» – جوزنی – نەکو فولکلور پێ رادیتو نەکو – دارس – دکاریت بساناهی ڤان «وەزیفا» دەست نیشان بکەت ، بەلکی خەلکێ جڤاتێ بخوژی دشێن بساناهی ڤان «وەزیفا» بزانن .

ئەڤ رەنگێ «وەزیفەی» زانایێت ئەنثروبولوجی دبێژنێ «رامانێت بەلی ، یان رامانێت ئێکێ» – الغرض الظاهری او البادي – کو جوداهیەکا گەلە مەزن یا هەی ژرامانێت «بنەرەتی» – الغرض الحقیقي – کو دبێژنێ «وەزیفە» و ئەڤ «وەزیفە»یە یێ – ضمنی یێ دویدە ژبێحەسیانا جڤاتێ ، یانی خەلکێ جڤاتێ ڤی «وەزیفەی» نزاننو ئاگەهـ ژێ نینە ، چنکو ئەڤ «وەزیفە»یە – نەتیجێ – رامانەکا سەرەکیو کەڤنە کو نەمایە لهزرا جڤاتێ»(٤)

یانی مروڤێن جڤاتێ دەمێ فولکلوری بکار دئینیت ژبو رامانەکێ کو لنك وان یادیارە ، چێد بیت ئەڤە رامانا بنەرەتی نەبیت یاکو ئەو پارچا فولکلوری ژبو هاتی یە دانان .

(ژبەر هندێ لدویف گەرو خویاکرنا «ئەرکێ» فولکلوری و بڤێ رەنگی ، کارەکێ گەلە بگرێو ئالوزە چنکو ئەڤ – دیراسەیە – هەچکو مە بەری نهو گوتی پێدڤی – دیراسە – کرنا هەمی بارێن جڤاتێیە بهەمی – زروڤێن – وێڤە)(٥) چنکو فلکلور چ وەکی هونەر تان وەکی نور ڤەرێژا هزرو بیرو باوەرێن جڤاتێیەو هەمی زروڤێن وێ جڤاتێ شوینا خو لسەر

دهێلن . لێ هەر ئەڤە بتنێ سنگەبەر نینە درێکا دیراسەت کرنا «ئەرکی» فولکلوری‌دا ، بەلکی هندە ئالوزیێت دی یێن هەین کو – دارسی – بێخنە زڤروکەکا بێ دویماهی ، ئەوژی تێکەل‌بونا «وەزیفێ» سەرەکی – حقیقی – دگەل «ئەرکێن» ژێدەر ، یانی – عرضی و گوهرینا ڤان «وەزیفا» لدویف بارو زروفو دەمو جهێن وێ جڤاتێ ، ژبەر ڤێ چەندێ ژی خیرا – ئەرکی – فولکلوری هەر بەرفرهە دبیت ، هندەك ددیارنو هندەك دنەپەنی ، هندەك یێن هاتی‌نە گوهرینو هندەك هێشتا وەکی خو یێن ماین . لەوا دێ بێژین فولکلوری دوو «ئەرکێن» هەین :

أ – ئەرکی گشتی‌و بەلی .

ب – ئەرکی بنەرەتی‌و نەپەنی .

هەرچەندە گەلە بکوتەك ئەم ڤان «ئەرکا» ژێك ڤاڤێرینو جوداکەین چنکو هەچکو مە گوتی هەردوو دتێك هەلکێشاینەو جێمکن پێکڤە . هەر ژبەر ڤێچەندێ ژی دێ چەند «ئەرکا» رێزکەین کو پتر ژوان گشتی‌و بەلی‌نەو یێن بنەرەتی‌و نەپەنی – هەرچەندە رێزکرنا مە وان ژی دگریت – دێ هێلین بو – دارسێن – فولکلوری‌و ئەنثروبولوجی)[٦]

– ئەرکی فولکلوری

**١) بوراندنا وەختی «التسلية»** :

– ئەڤ «ئەرکە»یە ژرامانێن سەرەکی‌نە کو فولکلور بجهـ دئینیت ، نەکو «ئەرکەکی» ژێدەرە هەچکو گەلەکەس وەسا هزردکەن چنکو «بوراندنا وەختی» «ئەرك» کە کو هاری‌کاریا مروڤێ جڤاتێ دکەن . ژلایێ مەعنەوی – ڤە وەکی : کەیف خوشیادلی ، نەهێلانا تەمارێ ، کەنی ، خاف بونا لەشی‌و . . . هتد ئەڤ «ئەرکە»یە ئەنجامەکێ – عەمەلی یە ژبارێ نەخوش‌و ئالوزو درێ جڤاتێ پێ هاتی .

دیسا ئەڤ «ئەرکەیە» دگەل هەمی «ئەرکێن» دی مل‌بمل پێ پشکدارە . بو نمونە :

دەمێ زڤستانێ هەکو خەلك جڤات دبن لمالەکێ داشەڤا خو یا درێژ ببورینن . رامان ژگوتنا چیروکا لڤێرێ «بو راندناوەختی»یە . لێ بێی ئەوان ئاگەهـ ژێ بیت هەر چیروکەك «وەزیفە»کێ دی دبینیت هندەك دنەپەنی‌نەو هندەك دبەلی وەکی ئێك‌کرنا هزرو بیرێن وێ جڤاتێ ، هوی‌کرن . . هتد .

**٢) وەکرنو هێلانا گوتن‌و کریارێن کو جڤات ناهێلیت مروڤ وێ «کت کت» بکەت «التنفيس»**

– پێ‌خش هەر مللەتەکی تایبەتی یێن خو یێن زمانی‌و ئاینی‌و تورەی یێن هەین‌و هەر مللەتەکی هندە کریارو بیرو پەیڤێن هەین کو یێن ترۆکرین . لێ دفولکلوری‌دا ئەڤ توخیبە نامینیت – ژبلی هندە هزرێن ئاینی – ژبەر هندێ مروڤێ جڤاتێ گەلە بساناهی دشێت درێکا فولکلوری‌را وان ئاخفتن‌و کریارا بێژیت یێن جڤاتێ ترۆکرین . بو نمونە : مروڤ دکاریت بدلێ خو لسەر – جنس – پاخڤیت درێکا گوتنا هندە دەقێن فولکلوری وەکی مەتەلوکاو مەتەلاو ستراناو . . . هتد .

(نەرمە گەرمە دوخینێ ژێ بکێشە دانەبەرمە هەکە مە هێلا لسەر مە)[٧] .

دیسا دگوتنا ڤان پارچادا نەکو رامان ژێ هەر – تەنفیسە – بەلکی گەلە وەزیفێن دی لدویف دهێن‌و ئێك ژوان دیارکرنا شوینا – جنسی – لسەر مەژیێ جڤاتێ ، دیسا تەسلیەو هوی‌کرن‌و . . . هتد .

یانی مروڤێ جڤاتێ فولکلوری بخو دکەتە مەتال‌و هەکە لسەر ئاخڤتنا وی هاتە لومەکرن دێ بێژیت خو من نەدانایەو ئەڤ سترانە ئان مەتەلە‌ هوسا دهێتە گوتن .

**٣) هوی‌کرن** :

– فولکلور ڤ «وەزیفە»ی دبینیت دهەمی جڤاتادا نەخاسمە دجڤاتێن نەخویندەواردا ، ئەڤ هوی‌کرنە بگەلە ئاوایاو رەنگا دهێتەکرن . هندەك دئێك سەرن‌و هندەك – نەتیجەیە – . بو نمونە :

**«چیچێ چیچە زەرێ**
**کورتەکەکێ سورو زەرێ**
**بخو بینەو وەرێ وەرێ»**

ئەڤ پارچە یادیارە بو هوی‌کرنا بچویکی‌و هاویش کرنا وی دهێت . لێ نەهوی‌کرنا رەوشتەکێ ئان بیرەکێ ، چنکو چ مانا تێدا نینن ژبە رهندێ دێ بێژین ئەڤ

پارچه بو زاروکێ ساڤا دهێت بێ ژنوی هوی دبیته ئاخفتنێ.

لێ ئەڤ پارچا خارێ:

**«ئەلاّ حەی، تو هەر هەی**
**تو دەلیلێ حالێ مەی**
**تو رازقێ رزقێ مەی**
**تە ئەمێت داین، دێ مە بەی»**

دیسا بو زاروکی دهێته گوتن داکو بنڤیت بەلێ «وەزیفێ» وێ بێ دی نڤستن نینەو بەلکی هیکرنا هزرو باوەرێن ئولیەیە. هەکە پتر لدویف بچین دێ بینین کو بێ دەستهەلاتیا مروڤ بەرامبەر مانێ دیار دکەت، دیسا بێهن فرهەیێ لسەر تەنگاڤیا وەکی ڤێ مەتەلێ «تەنگاڤ دبەر کورتن».

دیسا بسەدان چیروك یێن هەین کو بچویکی هوی دکەنە پاقژێ، زیرەکیێ، تورەی، ڤیانا دەی‌و بابا، گەلە رامانێت دی وەکی شەهرەزابون دلەشیداو ئەو گوهرینێن دلەشیێ مروڤیدا دبن.

**٤) گرێدانا جڤاتێ پێکڤەو نێزیك کرنا هزرو باوەرێن مروڤێ وێ جڤاتێ‌و بنەجهکرنا وان هزرو باوەریا.**

– (ئەڤ «وەزیفەیە» دئەفسانەو چیروکادا برەنگەکێ رەوان دیاردبیت)[8] و ئەم دشێین بێژین فولکلور جهێ ئاگری دگریت دەمێ مروڤ ژنوی بسەر ئاگری هەلبوی کانێ چاوا بو سویچەك بو دروستبونا جڤاتێ‌و زمانی.

**٥) خەلات کرنا کریارا باش و ترو کرنا کریارا لەوتی.**

– **ئەڤ «ئەرکە» ئێك سەر بومە دمەتەل‌و چیروکادا دیار دبیت‌و ملەتێ کورد گەلە چیروك یێن لسەر قەنجی‌و باشیێ‌و خرابیێ هەین.**

**٦) گوهرینا کارێ خاڤ بو کارێ بزەڤەر.**

– ئەڤ «وەزیفە»یە دسترانادا دەردکەڤیت چنکو ئاواز دەورێ خو دبینن دڤێ چەندێداو هەمی سترانێت «کاری» ڤی «وەزیفە»ی دبینن.

**٧) پاراستنا رەوشتێن جڤاتێ.**

– پاراستنا رەوشتێن جڤاتێ هەمی چەقێن فولکلوری پشکداریێ تێدا دکەن چنکو ئەڤە «وەزیفەکێ» سەرەکییەو ئەڤ چەندە بومە دمەتەلادا دەردکەڤیت. گاڤا کارەکێ نەرەوشتی یان لەوتی مروڤێ جڤاتێ بکەت دێ ئێك‌سەر مەتەل ژدەڤێ خەلکێ جڤاتێ بارن دیسا ژبچویکینی ڤان رەوشتا ددلێ مروڤێ جڤاتیدا دچینیت.

**٨) پاراستن‌و هەی‌کرنا زمانێ نەتەوەی.**

– ئەڤە ئێك «ژوەزیفێن» فولکلورییەو هەر ئەڤە بویە فولکلور ئینایە ناڤ ڤادا – دیراسە – کرنێ‌و درێکا دەقێن ویدا مروڤێن جڤاتێ زمانێ خوو بێ پاراستی‌و هەی‌کری.

**٩) پاراستنا رویدانێن دویروکی‌و دانانا سەرهاتی یێن جڤاتێ.**

ئەڤ «وەزیفە»یە گەلە بباشی بێ هاتییە راڤەکرن ژلایێ زانایێت فولکلوریڤە چنکو زانستێ دویروکی وەکی زانستێ ئەنثروبولوجی بێ نوی نینەو ددویروکا گەلە ملەتاندا بهایێ ژفولکلوری وەرگرتی بو زانینا هندە راستی یێن دویروکی‌و هەچکو (ئوردیخانێ جەلیل دبێژیت: ئەگەر قنیاتێ تاریڤا یێن ماین تونەبن، بوان سترانا مەرڤ دکارە رابون‌و رونشتاندنا، حەباندنا، بیرو باوەرییا وێ کوما بێ ناڤ‌و نیشان بدە ڤەسەکناندنێ) دیسا درێکا فولکلوریرا جڤات سەرهاتی یێن باب‌و باپیرا ڤەدگێریت‌و دەمێ بوری گرێددەت ب دەمێ نهوڤەو مە گەلە نمونە ژبو ڤێ چەندێ هەنە – دمدم، هەمی سترانێن شەری چ ئەڤ سترانە لسەر سەرکەفتنائێلەکێ بن ئان رەڤینا وێ‌و درێکا ڤان ستراناو چیروکاو هەمی بابەتێن فولکلوری دا مروڤێ جڤاتێ دهێته گرێدان بوەلاتێ خوڤەو هەر ئەڤ ستران‌و سەرهاتییەنە دبنە سویچا ئاریانا وی.

* ئەڤە کورتیا «ئەرکێن» فولکلوری یێن کو دبەلی‌و دیار، لێ ئەوێن نەپەنی‌و سەرەکی کو بوینە سویچا پەیدا بونا هەر بابەتەکێ فولکلوری، دێ هێلین بو هەڤالەکێ دی‌و پاشە روژێ.

**دویماهی**

* ژبو بساناهی‌کرنا رێکا دارسێ فولکلورێ کوردی هیڤیدام ژهەڤالێن هێژا

ئەوێن فولكلورى كومدكەن نەكو ناڤێ – گوتوى –[10] و ژيێ وىو دەڤەرا وىو گوندێ ئەو لێ بوىو گوندێ ئەو لێ ژىو بابو دەيكێن وى ژكينەو ئەو دەقا فولكلورى ژكێ گولێ بويەو ژكێ هوى بويەو گەنگى ديسا سالا كومكرنا وێ دەقىو زاراڤێ وى گوتوىو . . هتد ژڤان پرسيارێن سەرەكى لێ دڤێت – دارس – يان – جامع – بنڤێسيت كانێ (لكيرێ ئەو دەقا فولكلورى دهێتە گوتنو كى دبێژن – ژنمێر بچويك – و كى گوهێ خوددەتێو ج بزاڤێن – درامى – لسەروچاڤێن گوتوى پەيدادبن – كورنژى ، كرژبو ، دەستێ خو دانا سەر گوهێ خو ، لسەر چوكا روينشت ، تزبى خاستن . . هتد ژڤان ، حەرەكاتێن ئيمانى – ديسا ئەو خەلكێ گوهێ خو ددەنێ دكەنە كەنى ، گرى ، دەستان دقوتن تويكا ددەنێ . . هتد ديسا ج بابەتەكێ فولكلورى لوێ جڤاتێ لێ مشەيەو حەزێ دكەنو چاوا هەر بابەتەكى تەفسير دكەن)[11]

ئەڤ بەرسڤە نە نەكو هەردێ بنە هاريكار بو – دارسێ – فولكلورى بەلكى دێ بنە هاريكار كو – ديراسا – جڤاتێ بهێتەكرن ژهەمى لاياڤە . هيڤيدارم ئەز شيابم رامانەكێديار كەم .


## ئەو سەرچاوێن من بها ژێ وەرگرتى

١) گوڤارا – الفنون – يا ئوردونى . ژمارە (١) يسالا (١٩٧٨)ێ .

٢) علم الفولكلور – دراسة في الأنثروبولوجيا الثقافية تأليف الدكتور محمد الجوهري .

٣) علم الفولكلور – الكزاندر هجرتى كراب – ترجمة رشدي صالح .

٤) الفولكلور – قضاياه وتأريخه – يورى سوكولوف – ترجمة – حلمي شعراوى – عبدالحميد يونس .

٥) دفاعا عن الفولكلور : د . عبدالحميد يونس .

٦) دراسات في الفولكلور – تأليف مجموعة من الدكاترة . القاهرة .

٧) الاسطورة : الموسوعة الصغيرة تسلسل (٥٤) . الدكتورة نبيلة ابراهيم .

٨) في علم التراث الشعبي : الموسوعة الصغيرة تسلسل (٤٠) لطفي الخوري .

٩) المدخل الى الانثروبولوجيا : تأليف الدكتور شاكر مصطفى سليم .

١٠) چەند ژمارەكێن گوڤارا – التراث الشعبي – ياعيراقى .


١) ئەو كتێبێن لسەر فولكلورێ كوردى ل عيراقێ هاتىنە چاپكرن گەلە دكێمن ، پشتى سالا (١٩٧٠)ێ روژنامەو گوڤارێن كوردى ژتوى پويتە پێ ب بەلاڤكرنا فولكلورى داى و هەچكو ئەز دزانم لدەمەرا دەوكێ ج كتێب لسەر فولكلورى نەهاتىنە چاپكرن ژ كتێبا سەيدا (على النقشبندى) پێڤە لبن ناڤێ – چيروكێن كرمانجى كو سالا (١٩٧٢)ێ چاپ كرىيە . ديسا چەند مونتيەخەك خودێ ژێ رازى – محمد توفيق وردى – چاپكرىنە هەروەسا مەعصوم مانى كتێبا – عيسى دەلا – چاپ كرىبەكو – سيرەيە – يانى سەرهاتى . لێ ئەو كتێبێن بزاراڤێ كرمانجىيا ژێرى پترنو چەند كتێب ونڤشتوك لسەرلێ چەندێ چاپ كرىنە يا پێڤە گرتى ئەوەكو فولكلور وەكى زانست نهوكى دهێتە خاندن ل زانكويا سلێمانێ – دكتورە شوكريە رسول – وزانكويا بەغدا – دكتور عزالدين مصطفى رسول . سەرپەرشتىيا لێ چەندێ دكەن .

٢) بەرێخو بدە – دراسات في الفولكلور – تأليف مجموعة من الدكاترة ، فەصلێ ئێكێ (ب ٢١) . كو بەرێزى لسەر ڤێ مسەلێ نڤيسىيە .

٣) بەرێخوبدە : بين الفولكلور والثقافة الشعبية – فوزي العنتيل ب ٤٢ .

٤) بەرێخوبدە : دراسات في الفولكلور – ژێدەرێ بەرێ – ب ١٦ – .

٥) بەرێخوبدە : ژێدەرێ – ب ١٧ –

٦) بەرێخوبدە : علم الفولكلور – دراسة في الانثروبولوجيا الثقافية – تأليف محمد الجوهري – ب ١١٤ .

٧) كێپارىيە ، كەلەپاچە ، گيپە .

٨) بەرێخوبدە : الاسطورة – الموسوعة الصغيرة – ٥٤ – الدكتورة نبيلة ابراهيم .

٩) پاشكوى (عيراق) ژمارة (٢٠) .

١٠) الناقل ، الحاصل ، ئەوێ دبێژيت .

١١) بەرێخوبدە : علم الفولكلور – ژێدەرێ بەرێ – ب ١١٨ – .

## لەبیرەوەری هونەرمەند



# حسن زیرەك

عثمان شارباژێری

لە زستاندا ، لە زستانی کوردستاندا ، لە شەوێکی کرێوەو زریاندا ، لە شاری جوانی بۆکاندا ، ژنێك لە دەمەی ژاندا ، لەسەر وەختی منداڵ دانانیدا ، مامان مزگێنی دایە ، «کوڕمان بوو» . کوڕ بەهرەی خوایە .

– لای زۆر خێزان بوونی کوڕ ، مژدەیەکی خۆشەو خەم بڕ .

ساڵ سەردەمایەك بوو ، کە یەکەم جەنگی جیهانی ، ڕۆژگاری قاتو قڕانی ، تازە تەمی لەسەر زەوی ڕەوی بووەوە .

ئەو شەوەی ئەو منالەی تێدا بوو ، ڕێکەوتی پانزدەی مانگی ڕەشەمەی ساڵی (۱۹۲٦) بوو

– بەڵێ منداڵێکی کورد بەدەم کوڵی گریانەوە ، هاتە ئەم جیهانەوە ، وەك منداڵێکی خواپێداوو بەناز گۆش کراو لە دایك نەبوو . بەڵکوو هەر لەو دەمەی دەمی بەرمەمکی دایکی کەوتووە ، شیری پەژارەی خواردووەتەوەو بە شیری خەم پەروەردەکراوە .

– ئیتر حەسەنی بێ باوكو بێ لان ئەکەوێتە گێژاوی ژیانو ژانەوە ، لەو تەمەنەدا بە تەنیا باڵی لەگەڵ گەرداوی ڕۆژگارو ئەرکو ئازاردا ئەکەوێتە پەلەقاژەکردن بۆ رزگاربوون لەو گێژەنو گێژاوەو گەیشتن بە بەختیاری ، بەڵام ڕێکەوتو ڕۆژگار گەلی دڵڕەق دەبێت لەگەڵیا . هەر لەو دەمەدا حسەینی برای

کچێك هەڵدەگرێ ئەو رفاندنو رەدووکەوتنە ئەبنە کۆسپو کۆفان لە ژیانی ئەو منداڵەدا ، حەسەن ناچار دەبێ کە شارو کاری خۆی بەجێ‌بهێڵێو وێڵ بێ بەدوای چارەنووس‌و پارووپەك نان‌دا ، بەلام نان پەیدا کردنی لێ دەچێتە کۆڵی شێر ، سەردەمێك دەبێتە (چاوساغی حافزێکی کوێر)و سەردەمێکیش بە (قاوەچێتی) و (توتنچێتی) بەوە خەریك دەبێت . بەلام لەسەر هیچیان بەند نابێ‌و توێتکە ناخوا !! .

سەبارەت بەو بارەی ژیانی دەڵێت :

«یەکێ بێ گەورە . کە بەرەڵلا بێ»
«وەك منی لێ دێ‌و زەحمەتە چا بێ»
«هەر کەسێ دایکی بێ رەحمی وای ، بێ»
«دەبێ بەم جۆرە وێڵ‌و ریسوا بێ»

لەپاش وازهێنان لەم پیشەو ئیشانە ، دەبێتە شاگرد شوفێر .

«بووم بە شاگردی حاجی بێ ئیمان»
«ئەویش تەماع‌کار . شەخسی زۆر گیرفان» !

هەر لەم دەمی شاگردی کردنەی‌دا ، لە سەقز ژنێك دێنێ کە ناوی (زبیدە — زبە) دەبێت . ئەو ژنە خەڵکی کوردستانی عێراق دەبێت‌و کەس‌و کاری لەو کاتەدا لە بەغدا نیشتەجێ بوون . . رێکەوت بۆ لێدان‌و تێك‌شکاندنی مزۆقی کڵۆڵ هەمیشە تێژەو لە کەمین‌دایە ، ئەم شاگرد شوفێری‌یە بە حەسەنەوە نایە ، بەو لۆری‌یە لە لاوێك ، *(مستەفا) ناوێك ئەداو ئەیکوژێ . ئەو قەوماوە خوێناوی‌و خەماوی‌یە سەراپا نەخشەی ژیانی ئەگۆرێ ، خەمەکانی خەست‌تر ئەکا ، ناچار ئەبێ لە ترسی دەوڵەت‌و دادگا بداتە کێوو لە دەربەدەری‌و دێ بەدەری‌دا بژی ، — تا لە تەمەنی بیست‌و حەوت ساڵاندا لە رێی پێنجوینەوە دێتە عێراقەوە بەو تروسکە هیوایەی بگاتە بەغدادو خزم‌و کەسی ژنەکەی داڵدەیەکی بدەن ، و هەمدیسان بە نیازی ، دیدەنی‌و دیداری مزاری شێخ عەبدول قادری گەیلانی ، گەلێك لەم هاتنەی بۆ عێراق لا خۆش‌تر دەبێت ، سەبارەت بەم سەردەمەی ژیانی دەڵێت : —

«یاڵلا بۆ پێنجوین یا بۆ سلێمانی»
«هەموو کەس ئەیگوت کاکەی ئێرانی»
«گوتم غەریبم وا بووم هەڵوەدا»
«بچمە زیارەتی غەوسەکەی بەغدا»
«بەغدا پڕك گەرام شارع . چاخانە»
«بووم بە شاگردی موسافیرخانە»
«باش کارم ئەکرد رۆژو شەوانە»
«لە ئوتێل شمال . کە جێی کوردانە»

— حەسەن زیرەك — کە ئەگاتە بەغدا پاش بەینێك دەبێت بە شاگرد لە ئوتێل «شمال الکبیر» لە دەمەی شاگردی‌دا کە بە نوێن هەڵگرتن‌و پاك‌کردنەوەی ژوورەکانی ئەو ئوتێلەوە خەریك دەبێت ، جار جارە کە (حەوزە گەورەی بۆکان) و (ناڵە شکێنەی جوان) و (شەنگەبێری‌و جێ ژوان) و (کیژان دەچنە مێرگۆلان) ی دێتەوە بەر دیدەی خەیاڵ‌و لە ناخەوە یادو خەم‌و خۆشی‌یەکانی دەورووژێ ، وەك بولبولێکی دیلی قەفەز بە دەنگی گوڵبانگی تێ‌دەچریکێنێ ، لەو رۆژگارەدا چەند کوردێکی خوێندکارو خەمخۆری گۆرانی کوردی لەو ئوتێلەدا ئەبن ، کە نەغمەو نەوای ئاوازی ئەو ئاوارە بێ نازەیان گوێ لێ دەبێت ، گیان‌و گوێیان هۆگری ئەو بەستە خۆش‌و رەسەنانەی گۆرانی کوردی دەبێت . یەکێك لەو دڵسۆزانەی گۆرانی‌کوردی ، حەسەن دەگەیەنێتە ئێستگەی کوردی لە بەغداد سەبارەت بەم کارە حەسەن دەڵێت : —

«جوان ناساندمی بە عادل عیرفان»
«هەمەکارە بوو لە رادیۆی کوردان»
«ووتی برای کورد تۆش لە خۆمانی ؟»
«ئا بۆمان بڵێ بەندێ گۆرانی»

(عادل عیرفان) خوا لێی خۆش‌بێت ، لەو سەردەمەدا کارگێر بووە لە ئێستگەی کوردی ، زۆر دۆست‌و دڵسۆزی گوێندەو گۆرانی بێژی دەنگخۆش‌و لێ‌هاتوو بووە ، یارمەتدەری زۆریان بووە لە تۆمارکردنی گۆرانی لەو ئێستگەیەدا .

یەکەمجارێك کە حەسەن زیرەك چووەتە ئێستگەی کوردی لە دوا مانگەکانی ساڵی (١٩٥٣) بووە ، کۆری مۆسیقاو گۆرانی کە دەنگی تاقی‌دەکەنەوە یەکەم ئاوازێك کە بۆیان دەڵێت بەستەی (وەرگەرێ ئاوێزانت بم) دەبێت :

«عاشقان دێن لە دوور رادیارن»
«رەنگیان زەردو لێو بە بارن»
«بە دەردی دڵ گرفتارن»
«مەنعیان مەکەن ساحیب یارن»
— وەرگەرێ ئاوێزانت بم —
— شۆرە ژن دەستەملانت بم —
یا رەبی بە میوانت بم —

هەواو هۆنراوەکەی — (فۆلکلۆر)ە .

حەسەن زیرەك دەڵێت :

«کە بەندێکم گوت بە دڵی پڕ گریان»
«لە خوداوە . جەرگیان بۆم بوو بە بریان»
«مەخلەس دامەزرام لە رادیۆی کوردی»
«لە رادیۆی بەغدا . هێنگجار بە مەردی»

هەر لەو ساڵەدا حەسەن زیرەك وەك ئاوازەخوانێك‌و ئەندامێکی کۆری گۆرانی

لەو ئێستگەیەدا ، دادەمەزرێ لە سەرەتاوە مووچەی مانگانەی شەش دینار دەبێت . دوایی بۆی زیاد دەکرێت ، و لەم کاتەی ژیانی هونەریدا لەو ئێستگەیە پەنجاو شەش گۆرانی خۆش‌و پڕ جۆش‌و دڵگری تۆمارکردووە وەك بەستەکانی (ئەی نیزام) (ئەی وەی زارا)
(باخەوان خۆم غەریبم) (باوانەکەی باوم)
(بـــــــەلـــــــەنگەر)
(چاوت جوانە لەیلا) (چارۆکێ)
(وەرگەرێ ئـــــــاوێزانت بم)
(کەو یار) (کیژان دەچنە مێرگۆلآن) (مەناڵە بـولـــــــــــــــبول)
(کەژو کەژاڵێ) (شۆرێ ماڵم شۆرێ)
(ساقی بۆم تێکە) و (گەوهەرێ) . .

لەم سەردەمەی ژیانی‌دا لە عێراق رۆژگارێکی زۆری لە شاری سلێمانی بەسەر برد ، کە بە کارو کاسبی‌یەوە خەریك بوو ، لە بازاڕی بەر خانەقای سلێمانی دووکانێکی دانابوو ، زستان کوبەی تێدا دەفرۆشت هاونیان شەربەت‌و ماڵەکەشی لە گەڕەکی دەرگەزێن ، نزیك باخی شێخ لەتیف بوو ، حەسەن زیرەك لەو ماوە کەمەی لە سلێمانی‌دا ژیا سەبارەت بە دەنگی خۆش‌و قسەی خۆشی زۆر ئاشناو ڕۆشنای بۆ خۆی دۆزی‌یەوە .

– حەسەن کوڕی گۆوەندو گۆرانی بوو ، کەسێکی بەستەزان‌و بەزمی بوو ، شەوانە ماڵەکەیان جمەی هاتووە لە میوانی هونەردۆست‌و ئاوازخواز ، جار جار [بەدمەست] پەستی کردووە ، تا یەکێك لەو کەسانەی حەزیان بە دەنگی حەسەن ئەکرد ، ئەویش خواڵێ‌خۆش بوو (کاك کەریمی حاجی فەرەج) بوو ، خانوویەکی لە نزیك ماڵی خۆیان لە گەڕەکی کانێسکان بۆ بە کرێ گرت و بڕێکی باش ژیان‌و گوزەرانی بۆ دابین کردبوو .

– شەوێك لە شەوانی زستانی ساڵی ١٩٥٧ دا لە ماڵی (کاك کەریمی حاجی فەرەج) چاوم بە حەسەن زیرەك کەوت ، لەو شەوەداو لەو شوێنەدا هەر دوو ژنەکەی لەگەڵ‌دا بوو (زبێدەو ئامین) . لەو کاتەدا بە ڕێکەوت گۆرانی (چاوت جوانە لەیلا) لە ئێستگەی ڕادیۆی عێراقەوە بلاودەکرایەوە حەسەن خۆی هەستا دەنگی ڕادیۆکەی ساف و سازگارتر کرد ، ووتی حەز دەکەم «ئێوەش لەگەڵ من‌دا گوێ بۆ ئەم گۆرانی‌یە ڕادێرن خاتیرەیەکی جوانم لەگەڵی‌دا هەیە !)»

لەو شەوەدا گۆرانی بۆ ووتین بەستەی ڕەسەن‌و بەجۆش ، تافەتاف لە گەروویەوە بێ پسانەوە ئەهاتە خوار ، (ئەوەی ئەیووت نەی‌ئەوتەوە) بۆ ڕاگرتنی تاکت‌و تیپۆی ئاوازەکانی ، هەڵسوڕاندنی تەزبیحەکەی دەستی بوو ! . ئەو (پشوو درێژی‌و ڕەوان بێژی) یەی لە ووتن‌دا لە زیرەکدا دیم ، بەهرەیەکی خواکردو هونەرێکی سروشتیم دی . بۆیە تا لە ژیان‌دا بوو بە چاوێکی پڕ بایەخەوە ئەمڕوانی‌یە ئاوازە نایاب‌و بەشۆزەکانی ، بە گۆیندەیەکی گەورەی گۆرانی کوردیم دەزانی ، لە مردنیشی‌دا هەردەم دەمەوێ یادی فەرامۆش نەکەم ، ڕەوا پتر بدەم بەو هونەرمەندە .

– حەسەن زیرەك تا مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق‌دا مایەوە ، دوا بە دوای ئەمە رووی کردەوە ئێران .

– کە گەڕایەوە ئێران سەردەمێکی کەم لە (بۆکان) ئەمێنێتەوە لە پاشا لە ڕادیۆی کوردی (مەهاباد) دا ئەمزرێت و دوایی ئەگوێزرێتەوە بۆ ڕادیۆی تاران بەشی کوردی ، لەو کاتەدا ئەو ئێستگەیە پێویستی بە ئافرەتێکی خوێندەواری کورد دەبێت ، حەسەن زیرەك (میدیای زەندی) کە کچێکی خوێندەوار دەبێ‌و لە چۆلی سێ‌یەمی ناوەندی دەبێ لەو دەمەدا . لەو ئێستگەیە ، دایدەمەزرێنێ‌و مانگێك پاش دامەزراندنی ، ئەو کچە مارە ئەکاو ئەبێتە هاوسەری ژیانی ، لەو ژنە دوو کچی لەم ماوەیەی ژیانی‌دا بڕێکی یەکجار باشی گۆرانی‌یەکانی بە هاوکاری تیپی مۆسیقای (تاران) و (کرماشان) تۆمارکردووە ، وە ئەو ئاکارە هونەری‌یانەی (پێشکەوتن) و (دەرکەوتن) ێکی نوێ‌ی تری دا بە زیرەك .

– ساڵی ١٩٦٦ نامیلکەیەکی لە تاران‌دا چاپ کرد بە یارمەتی‌دانی میدیای زەندی و شازدە گۆرانی‌ی خۆی تێدا بلاوکردەوە ، کە هەوای هۆنراوەکان ، هونەرمەندی کوردی کرماشانی (فەرەیدوونی مورادی) ) بە (نۆتە) بۆی نوسیوەتەوە ، وەك ئاوازەکانی (چارۆکە هەولێری) یە (بەرهەڵ بێنە) (شەو) (لای لای سوورە گوڵ) (بووك مریەم) و . . بەلام شەیتان‌و شۆفار لە ژیانی زیرەکدا زۆر بوون هەردەم مێمل‌و ڕێگربوون بۆی . خۆشی لە ئێستگەی تاران وەڕز بوو بوو ، حەزی ئەکرد تاکە کەسی‌و لە دەرەوەی ئێستگە تۆماربکا . یەکەم هەنگاوی لەو ساڵەدا ئەوە بوو هاتەوە عێراق ، لە سلێمانی لە ماڵی زۆر ئاشناو ناسیاوو لایەنگرەکانی‌دا ئاهەنگی گێڕاو گۆرانی تۆمارکرد ، ژیانی میوانی زۆری لە ماڵی ئاشنا دێرینەکەی (کەریمی حاجی فەرەج) دا بوو ، لەسەرەتای ساڵی (١٩٦٧) دا لە (کەرکوك) و (هەولێر) لە ماڵە ناسیاوەکانی

چەند ئاهەنگێکی گێڕاوەو گۆرانی
تۆمارکردووە لە مانگی مارتی ١٩٦٧ بە
نیازی تۆمارکردن چووەتە ئێستگەی
کوردی کۆماری عێراق ، وە چەند
گۆرانی‌یەکی ناوازەی پێ بووە ، تا لەگەڵ
(نەسرین شیروان) دا پێکەوە بە دوو قوڵی
ئەیانەوێ گۆرانی (لالە بە دەستان)
تۆماربکەن‌و پراوەیەکی زۆری تێدا
دەکەن ، بەڵام ڕێکەوت‌و ڕۆژگارو
کۆسپ بوارە نادا ، ئاواتەکەی بێتە دی‌و ،
ئەو بەرهەمە هونەری‌یانە بۆ ئەمڕۆی گۆرانی
کوردی بەجێ بمێنێ . بە هەلاتووی
ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی لە وێشەوە بۆ ئێران .

هەر لەم کاتەشە ، (میدیای زەندی)
کە هاوسەرو خۆشەویستی بوو . وازی لێ
دێنێ ، بەڵام (زیرەك) لەبەر
خۆشەویستی‌و چاوی دوو جگەرگۆشەکەی
**(ساکارو ئارەزوو)** پەنا ئەباتەوە بەر میدیا ،
تا هێلانەی بەختیاری‌یان نەڕوخێ ، بەڵام
(میدیا) مل‌ناداو داوای جیابوونەوە دەکا .
حەسەنی هونەرمەندو باوکی دوو منالێ
ڕوونەکاتە میدیاو ئەڵێ :

**«گەر دەرمەکەی ڕوو لە کوێ کەم»**
**«هیچ پەنایەکم نی‌یە ! .»**
**«گەر بە دان پۆستم دەرێنی»**
**«دێمەوە چارەم چی‌یە !»**

بەڵام زۆربێژی کەڵکی نابێ حەسەن
زیرەك بۆ دواجار (میدیای زەندی) بەجێ
دێڵێ . سەر لەنوێ ژیانی‌و گوزەرانی زیرەك
وەك یاری (مارو پەیژە) لە ترۆپکەوە دەگە
ڕێتەوە بۆ سەر کلك ! ! .

لەسەر ڕێگای نێوانی شاری (بانە) و
(پێنجوین) چایخانەیەك دائەنێ‌و ئەبێتەوە بە
چایچی بۆ دابین‌کردنی (ژیان و نان‌و
گوزەران) ! . بۆ خۆی‌و دوا ژنی کە ناوی
(رابە) یە . . سەبارەت بە هونەری
گۆرانی‌و گوزەرانی‌و چایخانەکەی حەسەن
زیرەك دەڵێت .

— چایخانەیەکی پرتووکاوو ناخۆش‌و
عەجایبم هەیە . ئەگەر بێن تەماشای بکەن
تەعەجوب دەمێنن دەڵێن چۆن لێرە
دەژی ، نا ، پێم خۆشە کاسبی لێ دەکەم .
هونەر بۆ من بەهرەیەکی نەدا لە ئێران هونەر
بۆ من کارێکی نەکرد کە بەشوێنی‌دا بچم
چونکە کوردم بە کوردی قسە دەکەم» .

— لەپاشا دوا ڕۆژی ژیانی‌و پیری‌و
پەککەوتەیی خۆی هێنابەوە شاری شنۆ ، و
سەردەمی نەخۆشی لە خەستەخانەکانی
(ڕەزایی) یەو (تەورێز) و (بۆکان)
گوزەران ، تا لە ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی
١٩٧٢/٦/٢٦ بە نەخۆشی شێرپەنجە
(سەرەتانی جەرگ) کۆچی‌دوایی کرد ،
لەسەر ڕاسپێری خۆی کە لای (ئیمام
جومعە) ی بۆکان کردبووی ، لە گردی
(نالەشکێنە) ی بەرامبەر شاری بۆکان بە
خاکی ئەسپێرن .

ئەم ساڵێ ئەوا هەشت ساڵی ڕەبەق
بەسەر کۆچی دوایی ئەو بەهرەمەندو
بلیمەتەی گۆرانیی کوردی دا تێ‌پەڕی ،
هیوادارم کە ڕۆژی کۆچی دوایی حەسەن
زیرەك لە مێژووی مۆسیقاو گۆرانی
کوردی‌دا جێگایەکی بڵندی بۆ دابنرێ ، لە
ڕووی ڕاستی‌ی و ڕەواوە ئەبڵێم کە ئەو
هونەرمەندە لە مردنیدا ، زیندوو بووەوە .
گۆرانی‌یەکانی زیاتر چوونە ناو گوێ‌و دڵی
هەموو کوردێکی گۆرانی ویست .

— حەسەن زیرەك ، بەستەبێژێکی زانا
بوو گوێندەیەکی بە توانا بوو ، لە هۆنراوە
داناندا شارەزا بوو ، هەرچەند
نەخوێندەوار بوو بەڵام وەك شاعیرێك
هۆنراوەی بۆ زوربەی گۆرانیی‌یەکانی
داناوە ، یا لەگۆرانی‌یەکانی دا هۆنراوەی
جوانی ووتووە ، کە لە (سەمت) و
(سیستم) ی شیعری‌دا ڕێبازو شێوازی
جۆربەجۆری گرتووە وە لە *(شایەرە)*
بەهرەمەندەکانی تری کوردەواری جیاوازترە
بەڵکوو زانایانەترو شارەزاتر بۆ شیعرەکە
چووەو پەوتر دایرشتووە : ئەمە چەند
نموونەیەکە لە هۆنراوەکانی :

**(١) کیژان دەچنە مێرگوڵان — مێرگینە**
**تێکرا دەچن وەنەوشە .**
**ئارەق لەو هەنیەی دەتکێ — تك**
**تك دێنە خوار**
**تەر دەکەن پانی‌ی کەوشە .**
**کیژێ لە دایکت مەترسە**
**بۆم وەرە دەرگی حەوشە**
**«چاوی خومارو نێرگز ، بۆچی**
**ببینم»**
**«با لەسەر بالای لێو ئالێ ، دەرچێ**
**گیانی شیرینم»**

**(٢) جوانی ، بە دینم جوانی**
**بە ملیۆنێ هەرزانی**
**ئاورت لە من بەرداوە**
**سەرتۆپی کوردستانی**
**لەبەر ئەو گوزە دەمرم**
**ناسکۆڵێ دەبیا بۆکانی**

**(٣) کیژە کوردەکەی سەربەست**
**خوڵقاوی**
**بە داوی گەردوون ، گیرۆدە ،**
**ماوی**
**توخوا پێم بڵێ بۆچ وا ژاکاوی ؟ !**
**کیژە مەرۆ جوانی**
**گوڵی کوردستانی**
**ئاسکی لە کوێستانی**
**نەمامی بێستانی ،**

(٤) تەنیا گوڵەکەی باخی ژیانم
دایم لە دووریت دڵ پڕ گریانم
ئەتۆ شەونمی ئەمن زریانم

(٥) بە مەستم قەد منزانە
بە دینم دەپەرستم
دەستم گیرا بەرۆکی
مەمکۆڵەی کەوتە دەستم
هاواری کرد وەی دایە
لەپڕ سەرپەنجەی گەستم ! !

– (زیرەك) . . ئەو سەرناوە هەر شایانی خۆیەتی بەراستی زیرەك بووە ، بەو نەخوێندەواری‌یەوە هۆنراوەی (حەریق) و (نالی) و (وەفایی) و (تایەر بەگی جاف) و (عەلی باپیر ئاغا) و (ئەحمەد هەردی) و (پیرەمێرد) و (گۆران) و (ئیامی) – لە مەقامەکانی‌دا ووتوونی . زانیوێتی کە هۆنراوەی فۆلکلوری یا هۆنراوەکانی خۆی کێش‌یان جیاوازە لەگەڵ تاکنی مەقامدا ! .

– حەسەن زیرەك ، وەك کەسێکی هەڵکەوتوو نە قوتابخانەیەکی هونەری دی‌بوو ، نە پیتێکی خوێندبوو ، نە مامۆستایەك پەلی گرت‌بوو ، لە کۆمەڵێکی دواکەوتوو ، دوور لە شارستانی ، دوور لە رادیۆو مۆسیقا سەرباری ئەمانەش هەتیوی‌و هەژاری‌و بێ‌نانی‌و بێلانی‌و دەربەدەری . جا کەسێك ، حەسەنێك ئا لەو ژیان‌و گوزەران‌و جیهانەدا ژیابێ خاوەنی ئەو هەموو هەواو (هۆنراوانە) بێت مایەی سەرسامی‌و سەربلندی ئەو گەلەیە ، کە بەهرەمەندی وای تێدا هەڵدەکەوێ شایانی ناوهێنان‌و رێزلێنان‌و یادکردنەوەو پەیکەر بۆ کردنە . رەوایە چەند سینەماو سەیرانگاو یانەو شوێن و شەقامێکی بە ناوەو ناوبنرێ . چونکە بەهرەمەندێکی بێ وێنەیە لە بەستەی رەسەنی گۆرانی کوردی‌دا .

– گۆرانی‌یەکانی (حەسەن زیرەك) ، خوێندەوارو نەخوێندەوار ، کرێکارو جوتیار . دەوڵەمەندو هەژار ، پیرو هەرزەکار . دڵتەرو دڵدار ، شادو خەمبار لادێ‌و شار ، لایان خۆشەو بە گوێ‌و دەروونی زوربەی زۆری کورد ئاشنان ، ئاوازەکانی زیندوون و ساوان ، پیربوون‌یان بۆ نی‌یە ، نا بێژرێن‌و مۆدو مەودایان بەسەر ناچێ . زۆر کەس هەن کە گۆرانی‌یەکانی ئەو بەهرەمەندە بە جگەرگۆشەی خۆیانی ئەزانن ، بەسەر زارو زمانیانەوەیەو ئەیانڵێنەوە . پێ‌یان ناخۆشە کە کەسێکی تر دەسکاریان بکا ، یا تێکیان بدا یا ناخۆش بیڵێ . گلەیی‌یان لەو کەسانەیە کە (هۆنراوە) یا (هەوا)ی حەسەن زیرەك ئەڵێن ، و ئەیکەن بە (فۆلکلۆر) . . رووی راستی‌ی‌و رەوا ئەشارنەوە مافی ئەو کۆچ‌کردووە پێ‌شێل دەکەن ! .

– لە عەرەب‌دا ، دەنگێکی ناوازەو ئاواز زانێکی بەرزو دەنگخۆشێکی بلیمەت (ام کلثوم) کۆچی دوایی کرد . کە تا هەتایە لەو دەنگە نابێتەوە ، لە کاتێکدا ئەم هونەرمەندە ، خوێندەوار بوو ، خاوەنی خزم‌و کەس‌و کاربوو ، پارەدار بوو ، نازدار بوو ، شاعیری وەك (ئەحمەد رامی) و دەیانی تر مۆسیقاری وەك (ریاض السنباطي) و (بلیغ حمدی) و (عبد الوهاب) و زۆری تر . . هۆنراوەو ئاوازیان بۆ داناوە ، (ام کلثوم) ی هونەرمەند بە ئارەزووی خۆی شیعرو ئاوازەکەی هەڵئەبژاردو بە شان‌و شکۆوە بە دڵێکی خۆش‌و سەرێکی ئاسوودە ئەو کاتەی خۆی ئەیویست گۆرانی‌یەکەی تۆمار ئەکرد . . تەنیا (قورگ) لەسەر (کلثوم) بوو .

– بەڵام زیرەکی بیلمەتی لەمەر خۆمان ، کەسێکی بێ پشت‌و پەنا ، هەژارو بێ‌نەوا ، بێ پارەو بێ پەروا ، بێ نازو نەخوێندەوار بێ نان‌و بێ لان ، خۆی هۆنراوەکەی دائەنا . خۆی ئاوازەکەی دائەنا ، خۆی ئەگەرا بە دوای شوێنێکدا تۆماری بکا . بە پارەیەکی کەم‌و بگرە بە نانەسکی‌و خۆرایی . . سەرەرای کۆسپ‌و کەسەر ، جاوەك چۆن ئەو کەلسومە مەزنە لە عەرەب رۆی ، گەلێ گەورەتر لە کەلسومی عەرەب لە کورد مرد . . کە ئەویش (حەسەن زیرەك)ە لە کۆتایی‌دا ئەڵێم :

«حەسەن رۆی بەڵام دەنگی حەسەن ما
بۆ ئێمە بەستەی کوردی رەسەن ما»
«گەنجینەی (بەستە) و (هۆنراوە) و (هەوا)
بنوو . وەك چۆن ژیایت . بێ ناز . بێ نەوا»

«رۆژێکیش دادێ . بزانرێ تۆ کێ‌ی
خاوەن کام شاکار ؟ رێبواری کام رێ‌ی»


سەرچاوەکانی ئەم نوسینە
١ چریکەی کوردستان ١٩٦٦ حەسەن زیرەك
٢ – محمد ئەمین کاکی حەسەن زیرەك (گفتوگۆ)
٣ – میدیای زەندی (گفتوگۆ)
٤ حەسەنی نای (گفتوگۆ)
٥ (ش . م) لە سلێمانی (گفتوگۆ) لەبارەی حەسەن زیرەکەوە
٦ – گەوهەرێ . کتێبێکە ئامادەی چاپکردن‌و بڵاوکردنەوەیە .
٧ – ئەم وێنەیە تایبەتە بە کتێبی (گەوهەرێ) !

# دەروازەیەك بۆ وێژەی فۆلكلۆری منالأن لە ناوچەی گەرمیاندا

غبد الكرم حميد



دەمەویٚ لەو كارە رۆتینە رزگاربم‌و بیٚ پێشەكی بچمە نێو باسەكەوە ، پێویست ناكا لەمەڕ فۆلكلۆر وەكو زانستیٚ بدوێم یا سوودو قازانجی پشكنین‌و پاراستنی ئەو كەلەپوورو سامانە ڕوون‌بكەمەوەو داوابكەم دڵسۆزانی نەتەوەكەمان هەر یەك لە ناوچەی خۆیەوە قوڵی لیٚ هەڵماڵیٚ‌و بەشەكانی كۆبكەنەوەو لە فەوتاندن‌و لەناوچوون قوتاریان بكەن . . دیسان نایەویٚ منیش بیڵێمەوە كە ئەم بابەتە ئاوێنەیەو ڕەنگدانەوەی قۆناغە جۆراوجۆرەكانی ژیانی نەتەوەكەمان‌و هەموو لایەن‌و بارەكانی ئابووری‌و ڕامیاری‌و كۆمەلأیەتی . . هتد . . ی سەردەمەكانی پیشان‌دەدات چونكە ، وا بزانم بۆتە شتێكی ئاسایی‌و ڕاهاتوو و گەلیٚ جار ووتراوەتەوە . . بۆیەش دەمەویٚ دوور لەو كلێشانە روو بەڕووی ئەم جیهانە فراوانە ببمەوەو بە هێنانەوەی نموونەو تێكستی جۆراوجۆری فۆلكلۆری ئەو ناوچەیەو هەندیٚ روونكردنەوە خوێنەرانی ئازیز پیٚ ئاشنابكەم كە ڕەنگ‌بیٚ بەدەگمەن شارەزایی‌یان دەربارەی شێوە زمان‌و فۆلكلۆری ئەو ناوچەیە هەبێت ، و پێم وایە تا ئێستا شتێكی ئەوتۆی نەنووسراوەتەوەو لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەو كتێب‌و گۆڤارەكاندا كەسێكی كە توخنی نەكەوتووە .

ئەو شوێنەی كە ئەم بابەتە فۆلكلۆری‌یانەی[1] لیٚ وەرگیراوە دیارە هەموو ناوچەكانی گەرمیان ناگرێتەوە «كە مەڵبەندێكی بەرین‌و فراوانە» بەڵكو تەنها بەشێكە لەو . . بەلأم بەشێكی دیاری‌و ناسراو كە هەم «زەنگاوات – زەند ئاباد»[2] و هەم «پالأنی»[3] دەگرێتەوە ، كە تێكرا بریتی‌یە لە ئاوایی و دێهاتەكانی ئەم

بەری «بەری رۆژئاوای» کەناری رووباری سیروان کە لە نزیك خانەقین و جەلەولا «قەرەغان»ەوە دەست پیٚ دەکات‌و ناوچەکانی «شیٚخ باوە»[٤] و مەینەت ئاوا «محنت ئاباد» تا «کوڵەجۆو» و دەوروپشتی دەگریٚتەوە . .

ئەو بابەتە فۆلکلۆری‌یانەش کە لەو ناوچانەدا هەڵم‌بژاردوون‌و لیٚرەدا دەیانخەمە روو بریتین لە چەند چەشنە یاری‌و گۆرانی منالاٚنی کچ‌و کوری ئەو شویٚنە . . لەوانە تەنها بۆ گەمەکردن‌و خۆ خەلاٚفاندن‌و کات بردنەسەرەو هەشە دایکان بۆ لاواندنەوەو ترساندن و ژیرکردنەوەی مناڵەکانیان بە لایلایەو گورگانە شەوە دەیڵیٚن کە هەم بەو ئاوزە منالاٚن ئارام دەکەنەوەو لە وورك‌و پەڵپیان رزگاریان دەبیٚ‌و دەمیان لیٚك‌دەنیٚن‌و هەم لانکەو بیٚشکەی پیٚ رادەژەنن‌و دەیانکەنە خەو . . هەروەها هەندیٚ بابەتی تری مەتەڵ هەڵهیٚنان‌و سەرگوزەشتەو گاڵتەو گەپ‌و تەوس‌و قسەی گاڵتەجاری‌و مەزان گیٚرانە .

بیٚ گومان لیٚرەدا دەبیٚ بوتریٚ کە گەلیٚ لەو نموونانەی بەرچاوم کەوتن هەمان نموونەن بیٚ گۆرین‌و دەستکاری دەقاو دەق لە ناوچەکانی تری کوردەواریشدا دەبیستریٚن‌و دەوتریٚنەوە «کە لەم ووتارەدا دەق ئەو تەرزە نموونانەم نەنووسیوەتەوە بەڵکو تەنها ناوم بردوون» و بەشیٚکیان بریٚ گۆرانی بەسەرا هاتووەو هەندیٚ ووشە یا رستە زیادکراوە یا قرتیٚنراوەو بە پیٚی فۆنەتیك‌و شیٚوە ئاخاوتنی ناوچەکە پیت‌و ووشەکان گونجیٚنراون «کە لە تۆی ئەم باسەدا پەنجە بۆ چەند نموونەیەکی رادەکیٚشین» و تیکرا هەردوو بەشەکە یەکگرتوویی‌و هاورەگەزی‌و پەیوەندی‌ی نەپچراوی کەلەپوورو سامان‌و زمانی نەتەوەکەمان و هاوبەشی‌یان دەردەخات‌و بەڵگەیەکی نەمری تری ئەو مەبەستەیە . .

بەشی سیٚهەمی ئەو نموونانە ، ئەوانەن کە مۆرك‌و شەقڵی تایبەتی ناوچەکەیانی پیٚوەیە . . لە لایەکەوە ئەو شیٚوە زمانەی کە پیٚ‌ی ووتراون ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات‌و لەلایەکی ترەوە گونجانی یاری‌و گۆرانی‌یەکانی لەگەڵ سروشت و کەشی ناوچەکە یان ناوهیٚنانی عیٚڵ‌و خیٚڵ‌و شویٚنەوارەکان ئەو رایەمان بۆ دەسەلمیٚنن «کە لیٚرەدا ئەم تەرزی سیٚهەمە پتر مەبەستمانەو نموونەی زۆرمان بۆ هیٚناوەتەوە» .

گومانی تیٚدا نی‌یە جیاوازی ئەم ناوچەیە لەگەڵ ناوچەکانی تری کوردەواریدا هیچ نەبیٚ لە رووی سروشت‌و ئاووهەواو کەشەوە هەندیٚ ووردە جیاوازی لەگەڵی رووەوە هیٚناوەتە کایەوە جگە لە شیٚوە زمان‌و جل‌وبەرگ‌و بریٚ رەفتارو مامەڵەی رۆژانەو گوزەرانیان ، یاری‌و گۆرانی‌یش «کە بابەتی باسەکەمانە» گرتۆتەوە ، کە بەو پیٚ‌یە تەنانەت شویٚن‌و کات جۆری یاری‌کردن‌و گۆرانی ووتنیش دەگۆریٚ کە دیارە منالاٚنی ناوچە شاخاوی‌یەکان زیاتر دووچاری زستانی سەخت‌و دریٚژ دەبن‌و لەگەڵ سەرماو سۆڵەو بەفرو کانیاوو لاپاڵی شاخ‌و شیٚوو بەهاری رەنگین سروشتی قەشەنگ هەڵس‌و کەوت دەکەن کە تەنانەت ئاژەڵ‌و باڵدارو دارو درەخت‌و میوەکانیشی تا رادەیەك تایبەتی ناوچەکەن کە ئاشکراشە چەند لەگەڵ ناوچە باشوری‌یەکان «گەرمیان» دا جیایە کە هاوین گەرمترو دەشت‌و جۆگەو دۆڵی فراوانتر زستانەکەش خۆشترە کە دەرفەتی یاری‌و گەمەکردن پتر دەدات لەوەی لە سەرجەمی مانگەکانی زستان لە ژوورەوە بن‌و هەلی دەرچوونیان کەم‌بیٚ ، دیسان ئاژەڵ‌و باڵندەو درەخت‌و خەڵەو خەرمانیان تا رادەیەك تایبەتیی خۆی هەیە «باوەکو هەندیٚ لەوانەش – جۆری ئاژەڵ‌و میوە . .

- هی خۆیان نەبیٚ‌و هی دراوسی‌یان بیٚ‌و تایبەت بیٚ بەوانەوە بەلاٚم زیاتر لە بەرچاو بوونەو ئاشنایان بوون کە دیارە جیٚ‌ی خۆی لە ریزی فۆلکلۆری‌یە جۆراوجۆرەکانیان کردۆتەوە»[٥]

لیٚرەدا ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، کە لە ریٚگەی پیشاندان و خستنەرووی ئەم تیٚکستە فۆلکلۆری‌یانەوە دەتوانریٚ ووردە شارەزایی‌یەك لە شیٚوە ئاخاوتنی هاوولاٚتیانی ئەو ناوچەیە پەیدابکریٚت کە سوودیٚکی ئەوتۆش بۆ ساغ‌کردنەوەو لیٚکۆڵینەوەی زمانەوانی هەیە «بەتایبەت تویٚژینەوەی سەر بە دیالیٚکتەکان»[٦] ئەمەو جگە لەو ووشەو زاراوانەی لە توی‌ی ئەم نموونانەدا بەکاردەهیٚنریٚن کە هەندیٚکیان سەربەخۆو تازەن‌و ووشەی هاوواتان «مرادف» و لە دیالیٚکتەکانی تردا نین «ئەم چەشنە ووشانە لەوانەی کە لەو تیٚکستانە هیٚناومەتەوە بەکارهیٚنراون لە داویٚنی ئەم ووتارەدا وە بە لیستەیەك دیاریم‌کردوون‌و بەرامبەر هەر یەکیان واتەکەی یا ووشەی بەرامبەری لە کرمانجی خوارووودا» و هەندیٚکیان هەمان ووشەی هاوبنچینەن بەلاٚم بە شیٚوەیەك گۆراون کە تیٚکراش بۆ یەکبوون‌و دەوڵەمەندکردنی زمانی ئەدەبی‌یە یەکگرتووەکە کەڵك‌و نرخیٚکی بیٚ‌پایانی هەیە .

«یاری‌و گۆرانی‌یەکان»

لە نیٚوان ئەم دوو بابەتەدا «یاری‌و گۆرانی جۆرە تیٚکەلاٚوی وهاوبەشی‌یەك هەیە ، بەشیٚك لەم یاری‌یانە تەنها بریتی‌یە لە جوولاندنی دەست‌و پیٚ یا ئەندامەکانی تری لەش‌و گەمەی رووتەو هیچ گۆرانی‌و ئاوازی تیٚدا نی‌یە . بەشیٚکیش تەنها گۆرانی‌یەو هیچ یاری‌و وازی‌یەکی لەگەڵدا

بەکارنایەت کە ئەمانە زیاتر بریتین لە بەیت‌و بەستەی شایی‌و هەڵپەرکێ یا لایلایەو لاواندنەوەی مندالآمە یا بە زۆری شێوەیەکی چیرۆك ئامێز وەردەگرێ‌و سەرگوزشتەیەکی بچووکی پڕ رووداوی سەیرو سەرنج‌راکێش دەگێڕێتەوە . بەشی سێهەمیش ئەوەیە ، کە لە لایەکەوە یاری‌و گەمەیەو لە هەمان کات‌دا گۆرانی‌و بەستەی تایبەتیشی لەگەڵدا دەووترێ کە ئاوازو کێشەکەی لەگەڵ بزوتن‌و جوولاندنەکانی سەر بە یاری‌یەکاندا

– بەخێرایی‌و ئارامی‌یەوە لە – بهاوکێشێکی گونجاودایە . .

– فڕی . فڕی

ئەم یاری‌یە بە دوو منالٚ دەکرێ ، یەکێکیان بەسەر دەمدا دەکەوێ‌و ئەوەی تریشیان پەیتا پەیتا بە دەست لە پشتی دەداو دەڵێ : –

دەسککی . لە بانککی

حەمدە شیرین شەمامکی

قەیچی‌یە . دا گوزگی‌یە ؟ !

وە لەگەڵیشیا جارێ دوو پەنجەی درێژ دەکات‌و وێنەی قەیچی «مەقەست» ی لێ دروست دەکات‌و جارێ دوو پەنجەکەی دێنێتەوە یەك‌و بە شێوەیەکی بازنە وێنەی گوزگی «ئاوێنە» ی لێ دروست‌دەکات‌و دەبێ منالی پال‌کەوتوو هەول‌بدات – بە مەزەندەو خەمل‌لێدان – بزانێ کامیانە کە گەیشتە ئەنجام هەڵدەستێ‌و ئینجا فڕی فڕی بۆ دەکرێ .

فڕی . فڕی پاساری فڕی

لەگەڵ ناوهێنانی گیانداریك‌دا کە باڵدار بێ‌و بفرێ دەبێ پەنجەی بەرزبکاتەوە ئەگەر نەفڕ بێ «واتا باڵندە نەبێ» ئەوا دەبێ پەنجەی هەر لەسەر زەوی دابنێ . . ئەگەر پێچەوانەی ئەم یاسایە رەفتاری‌کرد دیارە بە دۆڕلوو خڕچیاو دادەنرێن . .

نانە ڕەقە

بە دوو کەس دەکرێت پشت لە یەکتر دەکەن‌و قۆڵیان بە یەکا دەکەن‌و هەر جارە یەکێکیان خۆی نەوی دەکات و لەسەر پشت ئەوی تر هەڵدەگرێ‌و بەم جۆرە بەردەوام دەبن‌و بەشێوەی گفتوگۆ ئەم دیالۆگە پێك دێنن : –

نانە ڕەقە پشتە تەقە

کی دالەت . ؟ عەباس

لەسەر چە ؟ لەسەر نان‌و ماس

با ئێوارە بیاتەوە . سەرو ملی گرم لە لاس .

– قازان پڕی ئاوە :

بەدانیشتنەوە دوو منالٚ بەرانبەر یەکتری دەگرن‌و قاچیان درێژدەکەن‌و رووبەڕووی یەکتری‌و دەستی یەك دەگرن و هەر جارە یەکێکیان ئەوی‌تر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و لەگەڵیا شتێك دەڵی‌و ئەوی تریش وەڵامی دەداتەوە :

قازان پڕی ئاوە
دەمی وە قولاوە
قازان پڕی شیرە
دەمی وە زنجیرە

تیلمو تیلمو

بە کۆمەڵە منداڵێك دەکرێ پێکەوە دادەنیشن تەنها یەکێکیان دوورە پەرێز دەوەستێ ، ئەمان لەنێوان خۆیاندا وا دادەنێن «بە ئەندێشە» کە مریشکێکیان سەر بڕیوەو هەر یەکەیان ئەندامێك «لەو گۆشتی مریشکە» بۆ خۆی هەڵدەبژێری‌و دوایی لە منالە دوورەکە دەپرسن و ئەویش وەڵام دەداتەوە .

تیلمو تیلمو
نارنج ولیمو

گاو گاسنەکەی باوکت بورمە .قنگت ؛
مامری سەربڕیم چەیکی خۆیت . ؟

ئەویش ناوی شوێنێکی دێنێ ، هەر کام لەو کۆمەڵە ئەوەی هەڵبژاردبوو ئەوا بەر ئەو دەکەوێ و دەبێ بڕوا بەکۆڵ بیهێنێتەوەو خۆی لە شوێنی دابنیشێ‌و بەو جۆرە . .

– هەرەکان مەرەکان

بە کۆمەڵە منداڵێك دەکرێ «دیارە مەرجە دەبێ لە تەمەندا نەختێ هەراش بن» یەکێکیان روو لە دیوارێك دەکات‌و خۆی پێی‌ی ڕاگیردەکات و سەری نەوی دەکات‌و پشتی دادەچەمێنێ و ئەوانی کەش هەر جارە یەکێکیان خۆی دەهاوێتە سەر پشتی تا خۆی ڕاگیر دەکات . . ئینجا دەڵێ : –

هەرەکان مەرەکان
بار سەرم گردەکان
گرد گرد پانزە
عەلی قولی شانزە
وە هێزی وە مێزی
تەقلە وەچەن دەگ بزی ؟

بە پەنجە ژمارەیەکی بۆ دروست دەکات‌و ئەوی تریش «منالی پشت کۆم‌بوو» ئەبێ هەڵی‌بێنێ ، ئەگەر زانی «دەرکی پێ‌کرد» ئەوا دەرباز دەبێ‌و ئەوی تر جێ‌ی دەگرێتەوە ، ئەگەر خۆ نا ئەوا بەردەوام دەبێت . .

– هەلوێر مەلوێر :

ژمارەیەك کۆدەبنەوە «کچان» و دادەنیشن و قاچیان بە رووتی درێژدەکەن‌و یەکێکیان هەر جارە پەنجەی تەری دەخاتە سەر قاچێك‌و لەگەڵە هەر یەکێکدا ووشەیەك دەڵێ تاکۆتایی‌یەکەی دەگاتە سەر هەر قاچێك دەبێ هەڵیکێشێ‌و بە کراسەکەی دایپۆشێ‌و بەرە بەرە تا دوا قاچ دەمێنێ ئینجا ئەوەش لەگەڵ زەوی‌دا

بەرانبەر دەکەن‌و بە هەمان شێوە تا ئەویش هەڵدەکێشری‌و تەواو دەبێ :

هەلوێر . مەلوێر . زایەو مایە . چی زورنایە . زورنا چەکی . پا بەلەکی . مێخم کۆتا . مێخ هەڵپەزی . تیکەی چەپم ئەمە گەزی . شیر بزنە بەن . لە کاسە کەل . کاسەی مەویژ . پری لە پویش هەڵتەکنەی‌و هەلاویژ . .

— ئەم لایلایە بۆ لاواندنەوەی منداڵ دەوترێت[٨] یا تەنها بۆ کرکردنەوەو رازی‌کردنێتی . . و لە شێوەی چیرۆکدا ، وەك لە سەرەتاکەیەوە دیارە کە بە ووشەی (مەتەڵ) دەست پێ‌ئەکات : —

مەتەڵ مەتەڵ مەتۆزی
گای حەسەن گەڵۆزی
نە گەلی نی نە گوان
شیری داوە ئەرخەوان
ئەرخەوان چی پێشەوان
سەر قوتکەی گامێشەوان
تکی خوین لەی دیم کوانی
تکی خوین لەو دیم کوانی

خوین بە گیا
گیا بردم بۆ بزن
بزن پشقول داوە پیم
پشقول بردم بۆ تەنویر
تەنویر خەپکە داوە پیم
خەپکە بردم بۆ جفتیار
جفتیار گەنم داوە پیم
گەنم بردم بۆ مامر
مامر خایە داوە پیم
خایە بردم بۆ عەتار
عەتار قەیچی داوە پیم
قەیچی بردم بۆ مەلا
مەلا قورعان داوە پیم
قورعان بردم بۆ خوا
خووا ئیمان داوە پیم

مویشلە مویشان

ئەمەش دیسان چەند بەیتێکی چیرۆك ئامێزی‌یە کە سەرگوزشتەیەك دەگێڕێتەوە ، گوایە ژنێك بە ناوی «میمکە نازی» بەدوای شووکردندا دەگەرێ . شوان‌و جوتیاری تووش‌دەبێ بەلام پێیان قایل‌نابێ دۆشەك‌و جی‌نووستنیان «فەرەنجی» بەو داردەستیان «گۆچان‌و کونەك» ە . . کەچی لە ئەنجامدا بە مشکێك قایل دەبێ چونکە لەسەر «کەول» و تووکە نەرمەکەی دەنخەوێ و کلکە باریکەکەی داردەستێتی‌و بەوە لی‌ی دەدا . . . لە سەرەتادا بەم چەشنە لە «میمکە نازی» یان دەپرسی : —

میمکە نازی
چارۆکە پیازی
تەق تەق کەوشی
لەناو حەوشی

وە کورە مەچی . . ؟
ئەویش لە وەڵامدا دەیووت
وە هوی کردن
وە شوی کردن

وە نان گەنم خواردن

دوای ئەوەی لەگەڵ مشکەکەدا رێك دەکەوێ مەنجەڵێك ئاو گەرم دەکات بەلام کە دەرواتە دەرەوەو تا دێتەوە مشکەکە لە خۆشیاندا ئەوەندە قونە قون دەکات تی‌ی دەکەوێ‌و دەسووتێ «نازی» پێش لە داخا لایەکی خۆی دەبرێ‌و دوایی کە سورکەوان بەو شێوە دەبینێ ئەویش خۆی دەسووتێنێ . قەلا رەشکەش لە داخی سورکەواندا پەر بە خۆیەوە ناهێڵێ . درەختیش کە ئەو وا دەبینێ خۆی دەروتێنێتەوە . . ئیتر بەو شێوە پەیوەندی‌دارانە یەك لەدوای یەك خۆیان ئازاردەدەن :

« مویشلە مویشان . کەفت لە قازان . بیە بریان . نازی لا بریاو . سورکەوان سوزیاو . قەلا پەر وە پێوە نەماو . دار روتیلو . کانی لێڵ‌و وێڵ . پیاو بێل لە قنگ . زورات سەرو قنگ . گور نان لە مل . دوێت جام لە مل . ژن دەساسنەك لە قنگ . . »

— کیژۆڵەکان کە لە دێ دوور دەکەونەوەو بە دوای پووش‌و دارو چیلکەو تەپاڵەدا «شتومەکی سووتەمەنی» دەگەرێن گەلی جار دوا دەکەون و درەنگ وەخت دەبێ ، جا لە رێگەدا کە بە چارۆکەو دارەوە دێنەوە خێرا خێرا پێ هەڵدەگرن بۆ ئەوەی پەلەتر بن‌و زوو بگەنە جێ ، دەڵێن :

خەرمانەکان جەوە جەوە
پا هەڵگرە نیمە شەوە
کۆڵ قەوی . . دای لە زەوی
دایکی وەت . مانوی نەوی
کۆڵ بچووك . . دای لە بنجك
دایکی وەت . بویتە کوچك

یا هەندێ جار دەڵێن :

هە جمە جمە . . پا بجمە
جا جمە سویرە جمو جولیەسی
صەی ئاوایی حەپ‌و لوبلیەسی
کەوچکە رەشە تامی خۆشە
کەوچکە رەشە بۆنی خۆشە
قیر قیر قورباقە

«قیر قیر قورباقە . . هەڵسە وا رۆژی پاکە . . جلك‌و ملکت بۆم دەرکە . . ئەسپی کاکەم بۆ زین کە . . کاکەم جیل‌و جوانە . . ناوی ژنەکەی خەنانە . . خەنانی هەورامانە . . پشت پەلکی کەتانە . . بەرمەمکی رەیحانە . . ئای دایە

مار هات . . ئای باوه مار هات . . حوشتر وه قەتار هات . . ماری زەنگوڵدار هات

هەنارە گوڵ هەنارە

«هەنارە گوڵ هەنارە . . هەناری ئەحمەو باوە توكڵەكەی تورش و شیرین . . ناوكەكەی پڕ لە ئاوە . . عارەب نیم عەگاڵم بێ . . سۆفی نیم بەرماڵم بێ . . هەلاج نیم كەوانم بێ . . مەلا نیم قورعانم بێ . . بە فتوای شێخ و مەلا ئەو كچە بە حەلاڵم بێ . چیبكەم بۆ جفتێ گوارە بیكەم وە گوش ئەو یارە . . هارەی بێ وەك تەیارە . . تەیارە وە عاسمانەوە . . شوان وەلای ڕانەوە جفتیار وە گارانەوە . . مەلا وە قورعانەوە . .» .

ئەمانە جۆرە بەیت و گۆرانی‌یەكن كە دیارە منالی نەختێ گەورە ئەمەن دەیلێنەوە .

«هۆ ڕیۆی ڕیۆی»

هۆ ڕیۆی ڕیۆی
ڕیۆی نی‌یە چەقەڵە
سەر كلكەكەی ڕەقەڵە
ڕیۆی هاتی‌یە لە «سنە»
كلكی گرتی‌یە لە «خنە»
ڕیۆی هاتی‌یە لە «سابلاغ»
كلكی كردێسە بەیداغ

خۆر دەرچوی

ئەم گۆرانی‌یە هی دوای بارانە كە سات نە ساتێ خۆر – هەتاو – لە نێو هەورەوە بەدی‌دەكرێ و تیشكی بلاودەكاتەوە منالان بە تاسەوەن بۆ دەرچوونی . لە خۆشی‌ی هەلاتنی كە نیشانەی سایەقەو سامالەو ڕزگاربوونە لە باران و چڵپاو ، دەڵێن : –

خور دەرچوی
خۆرە بان دەرچوی
ئەحەی عوچی
لە كونا دەرچوی

«هە دۆینە دۆینە»

هە دۆینە دۆینە
دۆینەی ماڵی حاجی‌یە
پڕی كلكە تاجی‌یە
دۆینەی ماڵی مەلایە
پڕی لە سەركە گایە
دۆینەی ماڵی شێخە
پڕی لە سەركە مێخە

– گۆرانی‌یەكی تر هەیە كە لایەنێكی كۆمەلایەتی دەردەخات و ڕەنگدانەوەی سەردەمی پەیوەندی هۆزایەتی‌یە ، ئەم بەیتانەش هەرچەند بە بەرهەمی منالێ دانانرێ و هی گەورەیە بەلام منالان وەك گۆرانی دروشم بە ئاوازەوە دەیانووتەوەو شانازی بە هۆزەكەیانەوە دەكردو زۆر جار منالی خێزانی سەر بە هۆزێكی تایبەتی لەگەڵ منالی سەر بە خێلێكی تر لەسەر ئەم جۆرە بەیتانە بەیەكا دەچوون و دەبوو شەڕە قسەو جنێو ، منالە «پالانی» یەكان ئازایەتی و جوامێری خێڵەكەیان پیشان‌دەداو دەیانووت :

پالانی پالان لە پشت
وەك نووك ڕمێ هەزاری كوشت

هەشبوو نەنگی و كەم‌كوڕی ئەو خێڵەی دەردەخست «كە دیارە ئەوەی سەر بە هۆزێكی كەیە» و وای لە قەڵەم دەدا كە ئەم عێڵە هەر بە ساكاری و گێژی[10] و هەژاری ناسراوەو دەبووت :

پالانی پالان لە پشت
بۆ تیكەی نان خۆی داوە كوشت

چەند گۆرانی‌یەكی تر

«حۆ لەیلێ» – كیژۆلان لە مانگە شەودا دادەنیشن و پێكەوە دەیلێن – «شیرینە لەیلانە لەیلانە . . هاوار بەو جفتە جەیرانە) – لە كاتی بووك هێنان و سویرو شایی‌دا دەووترێن – . (خەنجەر كاكەم دوو دەمە) . (جوجكە چەرمۆڵەو) و هی تر .

چەند یاری‌یەكی تر

«شاخ زەرە . . بزنەگەرە» . «قەرە قەرە – چاوشاركێ» . سێ ڕسكان . دامە دامە . كوچكان و قەمچان «یاری بە قاچ و بەرد» گولان «یاری بە ئەڵهات» . دەسر لە پشت قنگكێ ، خەتمان دا شێر ، تیقان دا جفت . قولان ، خانە خانە ، وەلكان وازی ، زۆران ، قار وە قاری ، مەلەكردن و شەلاقان ، قنگەسركێ ، داران . گوێزان ، هەیاران مەیاران ، دۆزە دۆزە ، شەماڵ ، شەماڵ بێ بێ ، مەیچك ، ئانە پانە لپانە ، پاش پاش – بۆ پاش پاش دەبێ بلێم تەنها لە ناوی پەنجەكاندا لەگەڵ ناوچەكانی تردا بە جیایە ، لەباتی «قولینجك . . بابە لینجك . .»

دەووترێ «تیتە ، زەرنە قویتە ، دوشاو لسە ، سپی كوشە» دەبێ ئەوەش بلێین كە مندالان ئەوەندە تامەزرۆی شەوگەمەن «یاری كردن بەتایبەتی لە مانگەشەودا» ئەوا هەر لە ئێوارەو دەمی خۆرنشیندا بە دەرقاپی‌یەكاندا دەخولێنەوەو بۆ ئەوەی شەو ژمارەیەكی زۆر كۆ بنەوە ئەوا هاوار دەكەن و دەیانچڕن و دەڵێن : –

هەركە نایە بۆ وازێ
شوی بكاتە مامە قازی
مامە قازی ریشی تەنكە
پڕ بەخەڵی مەمكە

که دره‌نگیّ له یاری‌و وازی ده‌بنه‌وه‌و
بیانه‌ویّ بلاّوه‌ی لیّ بکه‌ن ده‌لّیّن : –

هه‌رکه بۆ مالّ باوکی
ته‌نه‌که وه (. . .) دایکی

– به (که چه‌ل) .

که‌چه‌لّ که‌چه‌لّ قوق
له بانی سه‌ندووق
سه‌ندووق پاره پاره
(. . .) دایکه‌که‌ی نه‌قاره

– به که‌له‌فش دان که‌وتوو

حه‌مه عه‌لی پالّتاو کۆنه
تو گیان منالّه‌که‌ت حه‌مدیّ چۆنه



– بابه‌تی گالّته جاری‌و مه‌زاق‌و
فشه‌کردن بۆ پیّکه‌نین‌و گالّته‌کردن‌و داشۆرینی
که‌سیّك ده‌وتریّ که ره‌فتاریّك یا دیمه‌نیّکی
تایبه‌تی هه‌بیّ به شیّوه‌یه‌کی کۆمیدیانه ویّنه‌و
تابلۆیه‌کی کاریکاتۆری بۆ ده‌نه‌خشیّنریّ .

«که‌له‌فش . . که‌لله دگان . . پوشقل
له قنگ . . ئاخر زه‌مان»
– به شیّت یا دیّوانه‌یه‌کی شڕو په‌ڕتووك :

یان . «حه‌مه‌ی که‌مه‌ر . . نۆ کولیّره
خۆر . . ده‌پشت دا له‌به‌ر . . وه سواری
که‌ر – بۆ حاجی له‌ر – به چه‌قه‌چاوه‌و زۆربلّیو به کۆمه‌لّیّ
که به لایانه‌وه ده‌نگ به‌رز بوونه :

دووانیان کاروانێکه سێ پانیان
عوربانێکه.
یان - [ ( . . ) زورات ( )
کونات . عابا هەڵگر بچۆ شکات
شکات نی‌یه چی بکەم . . پر کلاوەکەت
گوی بکەم . . ] .

مەتەڵ :-

که بەشێوەی ناوچەکه پێ دەووترێ «چەوچە» :

- تەختێکەو تەختانێکه . چوار مەرەو بەرەنێکه . «ناو لەپ‌و پەنجەکان»

قەڵایەکم هەیه گەچ گەچینه . نه پای هەیه . نه پاچینه . «هێلکه» .

- کلکی وەك قەیچی‌یه . ژێر زگی وەك ماسی‌یه . «پەرەسێلکه» .

- هەڵدم بڵدم . . شەش پاو دوو سم . «تەرازوو»

- چل تاق چل بەن‌تاق . چل کەمەرەو چل چەوزاق . «ڕەشکه»

- سێ پا له زەوی . سێ پا له حەوا . دوگم دوگمێتی به ئیزنی ئەڵلا . «مەشکه»

- وه سێ برا . کڵاوێکیان هەیه : «ساج‌و بەردەکانی» .

(ئویشم‌و بویشه)

بابەتێکی تری فۆلکلۆری منالانه ، بریتی‌یه لەوەی که یەکەمیان ووشەیەك دەڵێ‌و لەوی تر داوا دەکات دووبارەی بکاتەوە ، ئینجا یەکەم ڕستەیەکی گاڵتەجاری‌و ئەنتیکه یا چاك‌و واتا بەخش بەرانبەری دێنێتەوە به شێوەیەك که دوا ووشەی ڕستەکه له ڕووی سەروا «قافیه»وە له ووشەی یەکەم دەچێت . بۆ نموونه دەڵێت . .

تەشت : دایك‌و باوکت بچنه بەهەشت
گردەکان : وه غله غل بچیته لای مردی‌یەکان
نەو چفه چفه دەڵه کەو
گەم تو ( . . ) من خەم
دەرزی لەبان بلەرزی .
تاوە لای ( . . ) سوزیاوە

بێ گومان ئەو منالەی له پێشدا بزانێ ئەنجامی ڕستەکه چاکەیه (به زەین ڕوونی یا لەمێژە بیستویەتی) ئەوا ووشەکه دووبارە دەکاتەوە ، ئەگەر بشزانێ به قسەی ناشیرین کۆتایی‌دێ ئەوا ڕازی نابێ‌و ووشەکه نالێتەوە ، ئەگەر نەشزانێ کامیانه یان لەپڕ بێ‌و یاری‌یەکەی بەخەیاڵدا نەیەت ئەوا خۆی‌و بەختی خۆیەتی .

- ئەم چەند نموونەش بۆ بابەتێکی تری فۆلکلۆری دێنمەوە ئەویش به خێرا دووبارە کردنەوەی ڕستەکەیه لەسەریەك به مەرجێ بێ هەڵه کردن‌و دەم بەیەکا چوون بێ - دیارە ووشەی واش لەو ڕستانەدا ریزکراوە که پیتەکانی لەیەك دەچن یا نزیکن لەیەك که کەم کەس هەیه بێ هەڵه خۆی دەربازکا - بۆیەش هەر تێ‌ی‌دەکەوێ‌و دەخرچێ :

«چەقەڵ تو چوین چل دەنك چەڵتوبك تەقێ»

«گاکەی کاکەم کاکەی گاکەت خوارد»

ئەوانەی باسم کردن ئەو نموونانەی هێنامنەوە مشتێکن له خەرواری دیارە جیهانی فۆلکلۆر تەنها یاری‌و گۆرانی‌و بەیت‌و مەتەڵ‌و قسەی جۆراوجۆری سەیرو سەمەرە نی‌یه ، بەڵکو پتر لەوانه پەندی پێشینان‌و قسەی نەستەق‌و چیرۆك‌و ئەفسانەو داستان‌و بەیتی شایی‌و شیوەن . . هتد دەگرێتەوە ، بەڵام من لێرەدا کێومالم نەکردووەو تەنها به شێوەیەکی ئیرەتی ئەوەندەم بۆ کرا .

وه له چوارچێوەی ناونیشانی باسەکەمدا مامەوە پەیوەستی ئەو بووم (واتا بابەتی منالان . بەڵکو ئەگەر بۆم لوا ئەوا له دەرفەتێکی تردا شتێك لەو بارانەی دیکەوە ئامادە دەکەم .

وا له کۆتایی ئەم ووتارەدا (وەك له پێشدا گفتم دا) ئەم لیستەیه پێشکەش دەکەم که بریتی‌یه لەو ووشانەی له تێکست‌و نموونه فۆلکلۆری‌یەکاندا بەکارهاتن‌و هەندێ لەوانەی خۆشم له ووتارەکەدا بەکارم هێناوەو تایبەته به شێوە ئاخاوتنی ناوچەکەوە له لای خوێنەری ئازیز ڕەنگبێ ئاسایی نەبێ‌و بەنامۆ بێتە بەرچاو له بەردەم هەر ووشەیەکدا واتاو ووشەی بەرانبەری له دیالێکتی کرمانجی خوارووودا دەنووسم هیواداریشم نووسەران‌و ڕۆشنبیرانی خۆشەویست سوود لەو ووشەو زاراوەو هاوواتانه وەربگرن‌و له بەرهەم‌و نووسینی خۆیاندا تاك‌و تەرا بەکاری بێنن که جگه لەوەی ڕێگەیەکی ترە بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانه ئەدەبی‌یەکەمان ئەوا هەنگاوێکیشه بۆ نزیك بوونەوەی دیالێکتەکانی زمانەکەمان ، ودروست بوونی «نەك دروست کردن» زمانی ئەدەبی‌ی یەکگرتووی کوردی بۆ هەموو نەتەوەکەمان به شێوەیەکی زانستانه که هیوای هەمووانه . .

لیستەی ووشەو زاراوەکان (۱) له شێوە ئاخاوتنی ناوچەی گەرمیان‌دا . (۲) له کرمانجی خوارووودا : -



لیستەی ووشە وزاراوەکان ۱ لە شێوەی ئاخاوتنی ناوچەی گەرمیان وا . ۲ لە کرمانجی خواروودا

| ۱ | ۲ | ۱ | ۲ | ۱ | ۲ |
|---|---|---|---|---|---|
| وازي | یـاري .گەمە | قاروەقاری | کێبەرکێ ـ تابق | ئـێرەتی | کاتی - مؤقت |
| قەیچی | مقەست | ئاوایی | دێ .گوند | خە نیـنە | پێکەنین |
| گوزگی | ئاوێنە | مویش | مشك | قازان | مەنجەڵ .قوشخانە |
| یاساري | چۆلەکە | دوییت | کچ .کیژ | مەزاق | گاڵتەجاری .سخریە |
| مامر | مریشك | چەرمو | سپی | ئویشم وبویشە | دەلێم وبڵێ |
| گەردەکان | گوێز | پاچینە | نەردەوان .بەیژە | هەراش | گەورە |
| دیم | دیو | فزە | زۆر | مبەك | پور ، پلك |
| خایە. | هێلکە | قاپی | دەرگا | چرین | بانگ کردن |
| قوڕباقە | بوق | گلەت | کەرەت.جار | وەلکان | بووکە شووشە |
| کوچك | بەرد | خرچیاو | دۆراو | جفت ، تیق | جووت ، تاك |
| چەیك کورە | کوێ | کەو | رەنگي شین | دگان | دوان ، دان |
| | | جفتیار | جووتیار | سویر | شایی ، رەنگی سوور |
| | | | | چەقەچناوە | زۆربڵێ ، دە مقاڵ |

پەراوێز

تێبینی : ئەم تێکستانەی هێناومنەتەوە لە سالانی ١٩٧٤ – ١٩٧٥ دا لەچەند خێزانێکی «پالانی» ی ناسیاو و خزمی خۆم – کە ئەو کاتە هێشتا لەو ناوچانەدا مابوون – وەرم‌گرتوون‌و زۆرم کۆشش کردووە کە دەق نموونەکان چۆنن وەك خۆی بێ هیچ دەسکاری‌یەك بنووسمەوە . تا هەموو مۆرکی خۆی بپارێزی .

١ – دیارە مەبەستم لەم بابەتە فۆلکلۆری‌یانە تەنها بەرهەمی سەرزاری‌یە واتە ئەوەی سەر بە ئەدەبەو ٔهی ئەو بوارەیە . ئەگینا فۆلکلۆر ئەگەر وەك ووشە لاتینی‌یەکەی یا وەك زانستێك وەربگیرێت ئەوا گەلی بابەتی تری کەلەپوور دەگرێتەوە . تەنانەت . جل‌و بەرگ‌و خشڵ‌و نیگارو وێنەو

فـــــەرش و ئـــــامـــــرازی خواردەمەنیش و . . . هتد .

٢ ناوچەی «زەنگاوات» بریتی یە لەم گوندانە «کوڵەجۆ . حاجی لەر . سێ تەپان . لەلین . بان سنویق . تەپە کزن» و بەزۆری هۆز «عەشرەت» ی «زەن - زەند» ی لێ نیشتەجێن . ناوەکەشی هەر لەم هۆزەوە هاتووە .

٣ دێهاتەکانی «پالآنی» ئەمانەن : «ئاوای گەورە . شێخ باوە . تەپە چەرموو . ئەحمەو تگوڵە . مێلوەنی . قەلآ . ئاوایی سلێمان . ئاوایی فەرەج) و بەزۆری لە عەشرەتی پالآنی پێکهاتوون .

٤ — «شێخ باوە» ناوی دێیەوە . . مەزارگایەکی بەناوبانگی لێیە – لە نێو کانیاوو دارستاندایە – بە هەزار دار ئاسراوە لە هەموو لایەکەوە رووی تێ دەکەن . مامۆستا جمیل رۆژبەیانی لە پەراوێزی کتێبی «مێژووی سلێمانی» یەکەی «ئەمین زەکی» دا دەڵێ . گوایە ناوی ئەم دێیە هەر بە ناوی «محمد بابا السلماسی» یەوە نراوە کە گلگۆکەی لەوێیە «سەلماسیش ناوچەیەکە لە ئەزربێجان» و خواناس و پیاوچاك بووە بروانە . تاريخ السليمانية محمد أمين زكي گۆڕینی مەلاجمیل رۆژبەیانی ١٩٥١/بەغدا . بە عەرەبی . پەراوێزی ل ٢١٥ .

٥ گەڵێ بەرهەمی فۆلکلۆری لەو ناوچەدا هەیە بەتایبەت گۆرانی و بەند کە رەنگدانەوەی قۆناغێکی مێژوویی یە ئەویش سەردەمی نزیك بوونەوە و پەیدابوونی پەیوەندی یە لەگەڵ خێڵە عەرەبەکاندا . بگرە ئەو دەمەی تازە بەرچاویان کەوتبوون و جارێ بە تەواوی مامەڵەو هامشۆیان بتەو نەبووبوو بۆیە تەنها لە رووی دەرەوەو رووکەشیان دەدوێن – واتا جل و بەرگ و دیمەن و رەنگ و روویان . هەروەها ئاژەڵ و خواردەمەنیان «حوشتر . گامێش . خورما . زوران» بەلآم بەشێوەیەك کە وەك تازەو سەرسوڕێنەر لە قەڵەمیان داون .

٦ — لە ووتارێکی سەربەخۆدا بە درێژی باسی شێوە ئاخاوتنی ناوچەی گەرمیان دەکەم . لێرەشدا دەبێ پەنجە بۆ ئەوە رابکێشم کە هەرچەند شێوەی ئەم ناوچەیە دیالێکتێکی سەربەخۆ نی یە بەلآم لەم ووتارەدا هەر بە «شێوەی ئاخاوتنی ناوچەی گەرمیان» ی ناودەبەم .

٧ لە ناوچەکانی تردا «هەللور . هەلور» یشی پێ دەووترێ . هەر لەم بوارەشدا محمود زامدار لە ژمارە (٥٥) ی گۆڤاری بەیاندا حزیران/١٩٧٩ . هەروەها کاك هوشیار سیوەیلی لە ژمارە (٥٢) ی گۆڤاری بەیاندا ت ١٩٧٨/٢ تێکستی ئەم یارییەیان نووسیوە . بەلآم لەگەڵ ئەم تێکستەی ئێمەدا هەندێ جیاوازییان هەیە . تەنانەت لە رووی گێڕانی یارییەکەش لەگەڵ ئەوەی کاك مەحموود باسی برێك جیایە .

٨ مەحموود زامدار لە ژمارەی (٤٤) ی گۆڤاری بەیان دا حوزەیران ١٩٧٧ . بەشێکی ئەم لایلایەی نووسیوە بەلآم دوو سێ دێری پەڕێنراوەو هەندێ ووشەی بە شێوەیەك گۆڕاوە – دوور نی یە لەو ناوچانەی ئەو لێی وەرگرتوون ئەوەندە بووەو بەو شێوەیەیە .

٩ — لەو ناوچانەدا «مەتەڵ» بەمانای چیرۆك و سەرگوزەشتە دێت کەچی لە ناوچەکانی تر واتای «نهێنی هەڵهێنان – حزورە –» دەگەیەنێ .

١٠ — هەر لەم بوارەدا – کە گوایە پالآنی یەکان بە ساکاری و تەوەزەلی بەناوبانگن – دێرە هۆ نراوەیەکی شاعیری نەمری کورد «نالی» م دێتەوە یاد کە لە باسی گوێدرێژەکەیدا دەڵێن .

**گوێ درێژی بارو کورتان بەرزو پالآنی بەزین**

**چوبت و ووریاتر لە گوێکورتانی پالآنی و گێژ**

کە جگە لەو واتایەی کە دەیبەخشێ ئەوپەڕی وردەکاری و هونەری یاری بە ووشەکردنی تێدا بەکارهێناوە . . کە گوێکورت – مرۆڤ – دەگرێتەوە و «پالآن» کورتانەو «پالآنی» هۆزەکەیەو «گێژ» یش دیسان هۆزن و هەر لەو ناوچانەی دەوروبەری – پالآنی و زەنگاوات – دەژین . . جگە لەوەی «گێژ» – وورو گێل یش دەگرێتەوەو بەرانبەری ووشەی (وریا) یشی بەکارهێناوە .

١١ — (وی) جۆرە دیفتۆنگێکە کە تا ئێستا لای زمانەوانی یە کوردەکانەوە بە تەواوی دەستنیشان نەکراوە «ئەمە لەگەڵ (وێ) ی سلێمانیداو ئەوانی تر جیایە» جۆرە فۆنەتیکێك ئەبەخشێ کە نووسینی گرانە ئەگەر نیشانەیەکی بۆ دانەنرێ . . لە شێوە ئاخاوتنی ئەو ناوچەیەدا زۆر

بەکاردێتو گەلێ ووشەی ئەوەی
تیایە .

«سوور – دەبێتە – سویر ،
دوور – دویر ، چو – چوی ،
خوێن – خوین ، شوی ،
قویل . .» هەروەها ساکاریو
وێنەی سەرەتایی پیشان دەدات . .
لە «واوی گۆرانی» بەوە نزیکە .



**معتصم عبدالجبار سالەیی**

هونەر شتێکی پیرۆزەو کارێکی مرۆڤایەتیەو هەردەم بۆ پێشخستنی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە خزمەتکردندا بووە . هەر لە سەردەمی بەردو بەرەبەیانی ژیانی مرۆڤەوە تاکو ئەمڕۆی ئێستامان ، هونەر هۆیەك بووە بۆ سەرکەوتن بەسەر هەڵچوون‌و داچوون‌و زەبروزەنگی دیاردەکانی سروشت . هەمیشە مرۆڤ بەهۆی هونەرەوە شارەزای‌ی پەیدا کردووەو توانیویەتی دەرك بە نەهێنیەکانی دەوروپشتی‌و سروشت بکات‌و بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە بۆ خۆش گوزاری‌و پێش خستنی ژیانی رۆژانەی . ئەو مرۆڤەی کە بۆ یەکەم جار توانی چەقۆو پاچ‌و پێداویستیەکانی ژیانی رۆژانەی خۆی لەبەردا بتاشێت هونەرمەند بووە . . لەم سەردەمەی ئیمەیشدا هونەری راستەقینە دەستەوەسان دانەنیشتووە روو بە رووی هــەڕەشەو گوڕەشە نــاپــاکــە نامرۆڤایەتیەکان . بەڵکو هونەرمەندە دڵسۆزە خاوەن ویژدان‌و بە ئاگا کان قەڵەم‌و فڵچەو ئامرازە هونەریە جۆر بەجۆرەکانی کەیان خستۆتە کار بەرامبەر بەرهەموو دیاردەو کارێکی ناپەسەند . بەڵام شتێکی زۆر جەرگ بڕو ناقۆڵایە کە لە وڵاتە سەرمایەدارە رۆژئاواییەکاندا . لەلایەن هەندێ هونەرمەندو لایەنی دیاریکراوەوە هونەرو ئەرکی راستەقینەی هونەر بە هەموو بەشەکانیەوە دەشێوێنرێن .

گەر بێینە سەر باسی هونەری سینەما . کە هونەرێکی خاوەن وزەو توانایەکی زۆرە گەر بەباشی بخرێتەکار لە پێناوی ئاگاداری‌و رۆشنبیرکردنی بینەراندا . بەڵام دەبینین لە وڵاتە سەرمایەدارەکان بەرادەیەکی ناپەسند . بەڵکو زۆر جار وەکو ئامرازێکی رووخێنەرەو دەخرێتەکار بۆ شێواندنی هەست‌و بیرو ئاکاری باش‌و پیشاندانی .

وەك دەزانین شانۆ هەردەم هۆیەك بووە بۆ خستنەڕووی دیاردەکانی نێو کۆمەڵ . بەهەموو رویەکانیەوە چی بەباشی دروست بێ یا بەنارێکی‌و نالەباری . بەڵام ئێستا لە وڵاتە سەرمایەدارەکان شانۆ دەخرێتەکار بۆ شێواندنی ئەو پەیوەندیە پیرۆزە مرۆڤایەتیانەی کە دەبێ‌و پێویستە خۆی بسەپێنێت بەسەر کۆمەڵدا . ئەمەیش بە زەوقی خۆی دەنوێنێت لەو رێبازە (عبث)یەی کە لەم چەرخەماندا لە وڵاتە رۆژئاواییەکان سەری هەڵداوە .

بە تێکرا دەتوانین بڵێین هیچ بەشێك لە بەشەکانی هونەر رزگاریان نەبووە لەو هەوڵدانانە بۆ شێواندنی رووی راستەقینەیان . ئەکرێ هونەر وەك هەموو شتێکی کە لە وولاتە سەرمایەدارەکان دەکەوێتە ژێر رکــێفی خستنەڕوو و داخوازی‌و (عرض والطلب) دەسەڵاتی قازانج‌و زیان . .

دەبینین بەهەزارەها هونەرمەند هەن نانیان نابێ بە ئاو . لە هەمان کاتیشدا هونەرمەندی وا هەن (هەر چەندە هەندێکیشیان خاوەن بەهرەی زۆرو هەڵویستی مرۆڤایەتی باشیش» خاوەن ملیۆنەها پارەو پولن . بابێینە سەرباسی هونەری تەشکیلی کە مەبەستی سەرەکی‌ی باسەکەمانە . «پاپیلۆ پێکاسۆ» لە دوای شەری جیهانی‌ی دووهەم ڤیەللایەکی (کۆشك‌و تەلار» لە خوارووی فەرەنسە بەیەك تابلۆی لە جۆری ژیانی کپ (ستیل لایف) کری . کاتێکیش کە مرد ملیارێك‌و دوو سەدو پەنجاو یەك ملیۆن‌و شەش سەدو هەفتاو سێ هەزارو دووسەد فرەنگی لە دوای خۆی بەجێ‌هێشت . بێگومان ئەم هەموو پارەو بولەیش لەرێی هونەرەکەیەوە بە دەستی هێنابوو . پێکاسۆ وای لێ‌هاتبوو لەگەل (میداس)دا بەراورد دەکرا . چیرۆکی ئەفسانەی‌ی میداس لەگەل ژیانی پێکاسۆدا زۆر نزیکن .

(میداس) دەستی بدابایە هەر شتێکەوە یەکسەر دەبوو بەزێڕ ، بەڵام ئەو جیاوازیەی کە لەنێوان میداس‌و پێکاسۆدا هەیە ، ئەوەیە کە میداس خەریك بوو لە برساندا بمرێت لەبەر بێ‌خواردنی ، لەبەر ئەوەی دەستی بەهەر خواردنێك بگەیشتایە زوو بەزووی دەبوو بەزێڕ . پێکاسۆش دەستی بەهەر شتێك بکەوتایە یاخود هەر خەتێکی بکێشایە لەزێڕ گەلیك بەنرختر دەبوو . رۆژێکیان برادەرێکی پێکاسۆ پارچە کاغەزێك دەردەکات‌و بە پێکاسۆ دەڵێت وێنەی سێ گۆشەیەکم بۆ بکێشە . دوای تەواوبوونی داوای لێ‌دەکات ناوی خۆی لەسەر وێنەکە بنەخشێنێت . پێکاسۆش پێ‌ی دەڵێ : هەر یەکجاری بۆ داوای پارەم لێ‌ناکەیت ؟ ! جارێکی کەش برادەرێکی پێکاسۆ داوای دەس‌گرتن‌و پارەی لێ‌دەکات پێکاسۆش پێ‌ی دەڵێت : بڕۆ لەناو تەنەکە زبڵەکەم بگەڕێ‌و کاغەزی وێنە لەسەر نەخشکراوی فڕێ‌دراوم بدۆزەرەوەو بیفرۆشە .

راستە هونەر وێنەی سروشت‌و گواستنەوەی دەوروبەر نیە ، بەشێوەیەکی راستەوخۆو فۆتۆگرافی ، دەبینین بە درێژایی مێژوو ، هونەری تەشکیلی خۆی لەشێوەی فۆتۆگراف دوور خستۆتەوە ، هەر لەسەردەمی بەردەوە بەهەموو ئەو وێنەی گیان‌لەبەرانەی نێو ئەشکەوتەکانەوە تا دەگاتە هونەری میسری کۆن‌و ئاشوری‌و بابلی‌و سۆمەری ، وە تا دەگاتە ئەمڕۆمان . بەڵام ئەم لادانە لە دەوروبەرو سروشت لەم سەردەمەی ئێمەدا لە وڵاتە رۆژ ئاواییەکان زیاتر رووی ئەشێوێندرێ وەك ئەو باسەی کە لە چەرخی یەکەمی پێش‌زایین‌دا «پلینۆس‌و شیشرۆن» تۆماریان کردووە ، دەربارەی ئەو پێشەبڕکێیەی چەرخی پێنجەمی پێش زایین لەنێوان دوو هونەرمەندی هەرە بەرزی یۆنانی‌ی کۆن لە ئەثینا . کە گوایە (زگسیس)ی هونەرمەند وێنەی بۆڵە ترێیەك دەکێشێت ، بە شێوەیەکی وا ووردەکاری کردبووی کە چۆلەکە پێ‌ی هەڵخەڵەتاو دەستی‌کرد بە دەندوك کێشان بەسەر وێنەی تابلۆکەدا . ئەمەیش بووە جێ‌ی واقوڕمانی خەڵکەکە . بە پەرۆشەوە هەموو چاوەڕوانی تابلۆکەی (باراشیۆس)ی هونەرمەندی دووهەمیان دەکرد کە بزانن چی روو بە روویان دەکات . بەڵام لەجێ‌ی خۆی نەبزووت ، کاتێك خەڵکەکە داوای ئەوەیان لێ‌کرد کە پەردە لەسەر رووی تابلۆکەی هەڵماڵێت ، وەڵامی دانەوە کە هەرئەوە وێنەکەیە کە بە پەردەیان دادەنا . لە ئەنجامیشدا هونەرمەندی دووهەم کە توانی خەڵکەکە هەڵبخەڵەتێنێت ، بەسەر هونەرمەندی یەکەم‌دا سەرکەوت کە توانی تەنها باڵندە هەڵبخەڵەتێنێت . هەر وەك ئەم باسە دەس‌هەڵبەستە ئەندێشەیە ، لەناو بەشێکی زۆر لە هونەری رووتەڵەکی‌ی (تجريدي) ئەم سەردەمەماندا خۆی دەخاتە روو . بەشێکی زور لە هونەرمەندە رۆژئاواییەکان دوورن لە خواست‌و خەم‌و خەفەتی جەماوەر . هونەرمەند هەندێك خەتی بە گژ یەکتردا چوو دەکێشێت ، یاخود چەند کۆمەڵە رەنگێك دەنەخشێنێت بەو بیانووەی کە گوایە ناخی دەروونی مرۆڤ دەردەبڕێت !

لە هەمووی سەیرتر ئەو دزینەیە کە لە مۆزەخانەکاندا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەکرێت ، بە رادەیەك وای لێ‌هاتووە کە تاوان دزینی گەنجینە هونەریەکان پایەو پلە دوهەمی وەرگرتووە بۆشلەژاندنی پۆلیس‌و دادگا . لەدوای تاوانی حەشیشەو بەنگ کێشانەوەی . (باول بتریدس)ی تەمەن (٧٨) ساڵی‌ی بەرگ دروو لە ساڵی (١٩٢٥)ەوە لە پاریس‌دا ناسراوبوو بە پەیوەندی‌ی لەگەل هونەرمەندەکاندا . ئەو سامانەی کە هەی بوو دەگەیشتە (٨٠) ملیۆن مارك . (بتریدس) گیراو بۆ ماوەی سێ ساڵ خرایە بەندیخانەوە دوای ئەوەی، دانی بەوە دانا کە (١٨) تابلۆی بەنرخی جیهانی‌ی بە پارەیەکی کەم کڕیبوو و دەستی کەوتبوو . لەو دزانەی کە بەزەبری چەك لە ماڵی یەکێك لە پیشەسازی‌دارەکان‌دا دزیبوونیان . وەدانی بەوەش دانا کە بە پارەیەکی زۆر فرۆشتبوونیانیەوە . لە کۆتایی مایسی ساڵی ١٩٧٩ دا «لازاری رۆژ

نبلات»ی بازرگان گیرا بە تاوانی گۆرینو دەسکەوتی نارەواو دەس بەسەرداگرتنی مرواریو تابلۆی هونەری کە نرخی ٢٥ ملیۆن مارك بوو . دەزگاکانی (ئەنترۆپۆل) دووپاتی دەکەنەوە کە ٥٣ هەزار پارچە هونەری دزراوەو لە بازارەکانی جیهاندا دەفرۆشرێن . . ئەمانەیش بە زۆری لە مۆزەخانەکانو ماڵە دەوڵەمەندەکانو کڵێسەکانو پیشانگا هونەرییەکان دزراون . سەرەرای هەموو راوانانو بەدواکەوتنو گەرانو هەڵپەیەك تا ئێستا بە تەنها توانراوە نزیکەی لەسەدا بیست ئەو گەنجینانە بدۆزرێتەوە . لە پاریسدا (گلبەرت راگویداو) گەران بە دوای ئەو گەنجینە هونەریانەی گرتە ئەستۆی خویو توانی لەشەش مانگدا بای (٨٠) ملیۆن مارك دزراوی هونەری بدۆزێتەوە . لە ئیتالیاشدا (رۆدلفۆ سیفیرۆ) کە تەمەنی ٦٤ ساڵە ، ٣٣ ساڵە لە پشکنیندا کاردەکات ، دەیەها جار قەستی سەریان کردووەو ویستوویانە بیکوژن . لە ناوەراستی گەورەترین گۆرەپانی (برۆکسل)ی پایتەختی (بلجیکا)دا ماوەی ٣٥٩ ساڵە پەیکەری منالێکی رووت کە بەپێوە میز دەکات داندراوە ، ماوەیەك لەمەوبەر بۆ دەهەمین جار دزرا . گەورەترین دزی لە ساڵی ١٩٧٦ روویدا ، دوای ئەوەی چەند دزێکی دەماخکردو توانیان ١١٩ تابلۆی پیکاسۆ لە کۆشکی ئەفیتۆن لە پاریسدا بدزن ، کە داوای ١٣ ملیۆن مارکیان ئەکرد بۆ گەراندنەوەی ئەو تابلۆیانە .

لە ئیتالیادا تابلۆی (لاڵەکە)ی رافائیلو (قامچیەکانی مەسیح) لە دەسکردی (پیرو دیللا فرانچیسکۆ) دزران . ئەم رووداوەش یەکەم کارەسات نەبوو ، بەڵکو رووداوی ژمارە ٤٣٩٩٩ و رووداوی ژمارە ٤٤٠٠٠ ی پاش جەنگ بوون . وەزیری رۆشنبیریو سامانی سروشتی ئیتالی بریاریدا کە ووتەیەك لە مۆزەخانەی (بریرا)ی وێنە لە (میلانۆ)دا بدات سەبارەت بەو رووداوە سەرلەبەیانی رۆژی دووشەمەی ئەو رۆژەی کە دەبوو وەزیر وتەکەی بدات ، پێنج یاساولی مۆزەخانەی هونەرە نوێیەکان لە میلانۆ کە بە تازەترین ئامێری ئاگادارکردنەوەی ئەلەکترۆنی کە دەنگی زەبەلاحی کەڵلەی مرۆڤ کاس دەکات ، تەنانەت بەهۆی پەنجەخشاندنێکی بە ناستەمیشەوە لە شووشەی پەنجەرەکانی کە بەدوو شوورەی تایبەتی لە هەر دەرگایەك گەمارۆ دراوە ، بیستو حەوت چوارچێوەی بەتاڵیان دۆزیەوە کە بەرێکی لەسەر یەکتر دانرابوون . ئەو بیستو حەوت چوارچێوەیەش شانازیان بەو تابلۆیە بەنرخانە دەکرد کە لە نێویاندا داندرابوون . لەنێو ئەو وێنانەدا تابلۆی هونەرمەندانی فەرەنسی داندرابوون وەك (ڤان گوخ) و (بیل) و (سیزان)و (رینوار) و گەلێکی تر . نرخەکانیشیان خۆیان لە دوو تا سێ ملیار لیرەی ئیتالی دەدا . بەلأم ئەم تابلۆیانە چۆن دزران ؟ ئەم پرسیارە خۆی لە خۆیدا جێی سەرسورمان بوو !

لە ساڵی ١٩٧٠ دا (٢٥٠٠) رووداوی دزینی تابلۆی هونەری ، وە لە ساڵی ١٩٧٢دا ٥٨٤٣ جار ، وە لە ساڵی ١٩٧٣ دا ١٠٥٢٠ جار ، وە لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە نزیکەی هەشت مانگدا ١١٠٠٠ جار روویدا .

لە ئەمەریکاو ئەوروپای رۆژئاواو ژاپۆندا بەردەوام بازاری کرینو فرۆشتنی گەنجینە هونەریە دزراوەکان بەردەوامە . دزەکانیش گەر بێتو دەست بە سەریاندا بگیرێت ، بۆ ماوەیەکی کەم لە بەندیخانە دەبنو دوای دەرچوونیشیان لە پیشەکەیاندا بەردەوام دەبنەوە . ئێستا کە بە ملیۆنەها پارەو پول سەرف دەکرێت بۆ پاراستنی گەنجینە هونەرییەکان ، ئەویش بە بەکار هێنانی یاساولو تازەترین بەرهەمی تەکنەلۆژیای پەرەسەندوو ، لەگەل ئەمەشدا دزین هەر بەردەوامە .

لە هەمووی نەنگتر ئەوەیە کە دەوڵەمەندەکان زۆر جار گەنجینە هونەرییەکان دەکرنو لە ماڵەکانیاندا هەڵیان دەواسنو لە هەندێ خزمو برادەریان بەولاوە کەس نایانبینێت . لە ولأتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ،

ئارەزوویەکی سەرکێشی وای لە ژنە خاوەن ملیۆنەهایەك کردووە کە کۆمەڵێك لە باشترین تابلۆ هونەریەکانی جیهانی کۆتایی ی چەرخی نۆزدەهەمو سەرەتای چەرخی بیستەم بکرێتو لە لای خۆی بیان پارێزێتو خەڵکی لە بینینیان بێبەش بکات .

**دزینی مۆنالیزا :**

هونەرمەندی ئیتالی ی مەزن لیۆناردۆ دافینشی (١٤٥٢ - ١٥١٩) دەستی بە وێنەکێشانی تابلۆی مۆنالیزای ژنی سیهەمی بازرگانی فلۆرەسی (جیۆ کۆندۆ) کردو نزیکەی چوار ساڵ خۆی بە وێنەکێشانی ی ئەو تابلۆیەوە خەریك کرد . بەڵام دوای ئەو ماوە دوورو درێژە دەستی لە کارەکەی کێشایەوە بەو هۆیەوە کە گوایە هێشتا هەر تەواو نەبووە . وە بە چوار هەزار مارك بە فرانزی یەکەمی پاشای فەرەنسەی فرۆشت . پاشا گەلێك شانازی بەو تابلۆ هونەریە دەکرد . وەك دەڵێن کە گوایە دافینشی لە کاتی وێنەکێشانیدا تیپی مۆسیقا ، موسیقایان بو ئەو ژنە لێدەدا نەوەك وەرس بێ . تابلۆیە درێژیەکەی ٧٧ سەنتیمەترەو پانیەکەشی ٥٣ سەنتیمەترەو لە ساڵی ١٨٠٤ ی زایینەوە لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە شاری پاریسو ژمارەی ٧٧٩ هەڵدەگرێت . زۆر شت ووتراوەتەوە دەربارەی مۆنالیزاو زەردەخەنە تەلیسماویەکەی . وە گەلێك چیرۆك دەربارەی رێکخراوەو ووتراوە کە گوایە خۆشەویستیەکی توندوتیژ لە نێوان ئەو شۆخەو هونەرمەندا هەبووە . بەڵام شووی بە جیا کۆندۆی بازرگان کردووە . تا ئێستاش ئەم تابلۆیەو زەردەخەنەکەی جێ ی سەرسوڕمانی هەموو خەڵکی دونیایە . زۆر جار ئەم تابلۆیە گواستراوەتەوە و کۆپی لەسەرکراوە ، بەڵام هەموو کەس بە ئەزرەتەوەیە تابلۆ رەسەنەکەی دافینشی ببینێت ، هەر کە بەهۆی کاتەوە بۆیە کە درزی زۆری تێدا کەوتووە . ئەوەی جێ ی سەرسوڕمانەو شایانی سەرنجە ئەوەیە کە دەبینین پشتێنەکەی (خلفية) تابلۆکە بە هەردوو دۆڵەکانیەوە لە هەردوو دۆڵی ئاسای ی ناکەن . بەڵکو بەشێوەی خەون ئاسای ی وێنەی کێشراوە . هەر ئەمەیشە وای لەو کەسانە کردووە کە سەر بە قوتابخانەی سوریالین (سەرووی راستەقینەوە) بە تابلۆیەکی سوویالی دابنێن . لەلایەکی تریشەوە ئەو هەردو دۆڵانەی تابلۆکە لە سروشتی سەر رووی مانگ دەکەن ، ئەوەی جێ ی سەرسوڕمانە لەوسەردەمەدا تلسکۆپی وەها نەبووە کە بتواندرێت بە هۆیەوە یان مانگ ببینرێت ! . ئەم تابلۆیە ئێستاکە بە بەنرخترین تابلۆ لە جیهان دادەنرێت . نرخەکەیشی بە ١٠٠ سەد ملیۆن دۆلار دادەنرێت . لە سەردەمی (جەنەرال دیگۆل) دا ئەم تابلۆیە لە واشنتۆنو نیۆیۆرك پیشانی بینەران دراو لە ژابۆنیشدا لە سالی ١٩٧٤ پیشاندرا . ئەم تابلۆیە کە کاتێك پیشان دەدرێت لە پشت پارچەیەك شووشەی ئەستورەوە دادەنرێت ، لەبەر ئەوەی بینەری دەروون نەخۆشو فزولی واهەن کە بەوپەڕی شانازیەوە ئامادەن تیزاب یاخود بۆیە بڕشێننە سەریو بیشێوێننو ناوبانگی پێوە دەربکەن . وە کاتێك ئەم تابلۆیە لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر دەگوازرێتەوە چەند فڕۆکەیەك لە ئاسماندا پارێزگاری ی دەکەن . وە کاتێکیش تابلۆکە پیشان دەدرێت ، خەڵکی بە درێژایی کیلۆمەترێك زیاتر سرەی بۆ دەگرن .

ئەم تابلۆیە لە ساڵی ١٩١١ دا لە لۆڤەر دزراو ، تۆمەتی دزینی خرایە ئەستۆی (ئەپولینێر)ی شاعیری بەنگ‌کێش . چیرۆکی ئەم بەسەرهاتەیش لەوەوە دەستیپی‌کرد کە پێکاسۆو ئەپولینێر برادەرێکی گاڵتەچیان هەبوو . ئەم برادەرەیان بۆ گاڵتەجاری چوو بووە مۆزەخانەی لۆڤەرەوەو چەند پەیکەرێکی بچووکی دزیبوو . نەك بۆ دزین بەڵکو بۆ دەرخستنی زیرەکیو زرنگی . لە دوای دزیەکەی ، بۆ شەو پەیکەرەکان دەبات بۆ لایانو شەو تا درەنگ دەس بە پێکەنین دەکەن . شەو درەنگ برادەرەکەیان بەجێیان دەهێڵێت لەگەل پەیکەرەکاندا . لە هەمان کاتیشدا مۆنالیزا لە مۆزەخانە

دزرابوو ، پۆلیسیش لێوەچان بە پەرۆشەوە خەریکی پشکنینی شاری پاریس بوون بۆ دۆزینەوەی تابلۆکە . ئەوانیش هەردووکیان ترسی زۆریان لێ‌دەنیشت نەوەك بە پەیکەرەکانەوە بگیرێن . لە ترساندا پێکەوە ئەپولینێر ، پەیکەرەکان بەوشەوە درەنگە دەکەنە ناو سنوقێکەوەو لە ژێر تاریکای‌ی شەودا بە کۆلانەکانی پاریس‌دا دەگەڕان بۆ چاریەك بۆ ئەم کێشەیەیان . نەیان دەزانی خۆیان بخەنە نێو ئاوی (سین)ەوە یاخود پەیکەرەکان ؟

لە دواییدا ئەپولینێر سەنووقەکە دەدات بە لۆڤەرو پۆلیسیش دەیگرن‌و بە تاوانی دزینی مۆنالیزا پێنج رۆژ دەیخەنە بەندیخانەوە ، لە دواییدا بە دەردێ ، دوای پەیدابوونی گومان لەسەر کرێکاری نەخشەکێش لە لۆڤەر (فنسنزۆ بیرۆگیا) ، «ئەپولینێریش» شەش هەڵبەستی لەو تاقیکردنەوە دڵتەزێنەی دانا کە ناسۆریان لێ دەتکایەوە . فنسنزۆ برۆگیا توانیبووی تابلۆی مۆنالیزا بدزێت دوای ئەوەی کە خامی تابلۆکە لە چوارچێوەکەی دەرکردبوو و لە خۆی ئالاندبوو و دزیبووی . وە ویستبووی لە ساڵی ١٩١٣ دا بە بازرگانی فلۆرەنسی ئەلفرد گوری بفرۆشێت . بازرگانەکە بەو کرینە قایل دەبێت بەلام لە دواییدا بازرگانەکە هەست بە ترس‌و قورسی‌ی ئەو کارە دەکات‌و پۆلیس ئاگادار دەکاتەوە و مۆنالیزاش جارێکی‌تر بۆ لۆڤەر دەگەڕێتەوە بەم شێوەیەش مۆنالیزا لە ساڵی ١٩١١ دا وون بوو و دزراو لە ساڵی ١٩١٣ دا دۆزرایەوە . دوای گرتنی برۆگیا . یەکەم بیانووی پارێزەرەکە ئەوەبوو کە گوایە برۆگیا ئیتالیەو تابلۆکەیش هی هونەرمەندێکی ئیتالی‌یەو هەستی نەتەوایەتی پاڵی بە برۆگیاوە ناوە تابلۆکە بدزرێ تا بیگەڕێنێتەوە بۆ ولاتەکەی خۆی . بیانووی دوهەمی پارێزەرەکەیش ئەوەبوو کە گوایە بروگیا کەوتۆتە داوی ئەوینی ئەو شۆخەوە ، وە هەر ئەوەیش پاڵی پێوەناوە تا بی‌دزێت . بەلام لە ئەنجام‌دا دادگا بڕیاری بەندکردنی (برۆگیا)ی‌دا وە بۆ ماوەی (١٥) پانزە ساڵ ، بەلام حەوت مانگ تێدامایەوەو دەرچوو .

تا ئێستا زۆر جار رووی راستەقینەی مۆنالیزا شێواندراوە لەلایەن چەندین هونەرمەندی رۆژئاواییەوە . (مارسیل دۆشامپ)ی دادانی لە ساڵی ١٩١٩ دا ئەم تابلۆیەی گواستەوەو وێنەی کێشاو کردی بە پیاو و سمێلی بۆ دانا . لە دوای ئەویش (سلڤادۆر دالی)ی سوریالیست ئەم دەم‌و چاوە نەرم‌و نۆڵەی گۆڕی دوای ئەوەی وێنەی کێشایەوەو وێنەی دەم‌و چاوی خۆی بە سمێڵە باریکە بە زوور هەڵگژاوەکەی لە سەری دانا . ئەم تابلۆیەکرا بە زۆر شت . وەك ئەوەی نیوەی بە خوارەوەی ماسیە . وە یاخود دەستی شکاوەو بە ملیەوە نووساوە ، وەیاخود پشیلەی بە دەستەوەیە . یا نوکەرەو زەوی دەسرێتەوە . بە زۆر شێوەی جۆراوجۆر کوپی لە سەرکراو گواسترایەوە ، تا رادەیەك هونەرمەندێك وێنەی کێشایەوە کە پشیلەیەو مشکی بە دەمەوەیە . ئایا دەبێت مەبەستێك نەبێت لە پال ئەم هەموو بۆچوونانەیاندا ؟ تا ئێستا وێنەی مۆنالیزا زۆر جار پیشەسازییەکان چەند جار کردوویانە بە (ماركة مسجلة) بۆ کالاکانیان — وەك جل‌و بەرگ‌و بۆن‌و سابوون‌و گەلێ شتی‌تر .

**سەرچاوەکان**


١ – مجلة افاق جامعية – العدد الرابع . كانون الثاني ١٩٧٨ من سرق تحفة رفائيل ؟ لە نووسینی : ئینستوراف : وەرگێڕانی صادق الجلاد .

٢ – مجلة الهلال – فبراير ١٩٦٤ . الشاعر اللص . . ! صالح جودت .

٣ – مجلة الهلال : أگستس ١٩٦٤ . . الفن و الطبيعة . عبدالرحمن صدقي .

٤ – جريدة الراصد ١٩٧٩/٨/١٨ . معارض الفن بين الأصالة والتشويه .

٥ – جريدة الراصد ١٩٧٩/١/١٤ . كيف تحولت المونالیزا الى صور للدعاية ؟ .

٦ – جريدة الراصد ١٩٧٨/٣/٢٥ ثروة بيكاسو

٧ – جريدة العراق ١٩٧٩/٧/١٤ الرهائن الصامتة .



# دراماو پێناسەکردن

احمد سالار

دراما Drama ووشەیەکی یۆنانی‌یەو[1] لە ووشەی – Dran -ەوە هاتووە کە مانای کاروفەرمان – Action[2] – دەگەیەنێت . ئەم ووشەی درامایە هەر لەو زمانە یۆنانی‌یە کۆنەوە هات‌وچووە ناو زمانە نوێ‌یەکانی گەلانی ئەوروپاوەو لەوانیشەوە گەیشت بە گەلانی تری وەك هیندو عەرەب‌و تورك . بەهەمان رێگاو شێوە هاتەناو فەرهەنگی ئەدەب‌و هونەری گەلی کوردیشەوە[3] .

ئەرستۆتالیس - Aristotle -- لە کتێبە گرنگەکەی‌دا – Poetics کە لەمەوداکانی – ئیستاتیکا – Aesthetics – دەکۆڵێتەوە و دەدوێ ، لە کاتی خستنەرووی تێورەکەیدا تێوری لاسایی کردنەوە – Imitation[4] – رووناکی‌یەکی زۆری خستۆتە سەر ئەم بابەتەو درامای بە درامات – Sawvtas – ناوبردووە کە ووتوویەتی :

(بۆیە کەسانێ نووسینەکانیان بە – درامات – ناوبردووە)[5] کەواتە ووشەی – درامات –ی لەبری ووشەی دراما بەکارهێناوە کە بە مانای ئاوەڵکردارەکان – الفاعلون – دێت . ئەم ووشەیەش هەر لە ووشەی – دراما – کەوە کەوتۆتەوە . بۆیە بەو شێوەیەش بەکاری هیناوە تا زیاتر سووربوونی لەسەر توخمی فەرمان کردنەکە پیشاندات وەك جەوهەری دروست بوونی هونەری دراماکە . وەك بیەوێت بە چاکی ئەو خاڵە جوی‌کەرەوەیەمان بیرخاتەوەو بە باشی زەق کات .

لە فەرهەنگەکەی ئۆکسفۆرد - دا ووشەی – دراما - ناو براوە بەو (بابەتەی ئامادەدەکرێت بۆ پێشکەشکردن لەسەر تەختەی شانۆو بەهۆی ووت‌ووێژکردن‌و فەرمان‌و رووداوەوەو بەجوولانەوە و هەڵس‌وکەوت کردنەوە . بۆ ئەمەش بە بەکارهێنانی کەل‌و پەل‌و جل‌و بەرگ‌و بینراوەوە چیروکێك دەگێرێتەوە ، بەو شێوەیەی لەراستی‌و ژیانا هەیە . ئەم بابەتەش بە پەخشان یان بە شیعر دەنووسرێتەوە)[6] .

ئەم جۆرە پێناسینە بریتی‌یە لە دەست‌نیشان کردنی توخمەکانی‌و کاری پێشکەشکردنەکەی ، ئەمەش سیماومۆرکی تایبەتی ئەم هونەرەیە . بەم پێناسینە زیاتر بۆ ماناگشتی‌و ناواخنی ووشەکە چووە .

ئەم ووشەی – دراما –یە لە تەك ژیانا هاتووەو وەك هەموو شتەکانی تر مەوداکانی فراوانتر بووەو لە جیاتی دانی تەنها مانایەك‌و بەکارهێنانی بۆ تاکە مەبەستێ . زۆر شتی دی لە ئەستۆ گرتووەو زیاتر روانگەکەی بڵندترو فراوان‌تر کردووە . بەهەمان شێوەی کە هونەرەکەشی چەندە لق‌و پۆپی داوەو کە رۆژ لە دوای رۆژ چەندین پەنجەرەی ژیان‌و رووناکی لەسەر کراوەتەوە . بۆ سەلماندنی راستێتی‌ی ئەم ووتەیەمان زۆر دوور ناڕۆین‌و هەر ئاورێکی سەر پێ‌ی لەو فەرهەنگانەی تایبەت‌مەندی ئەم هونەرەن . ئەوساکە بە چاکی رادەی ئەو پەل‌و تەرزهاویشتنەی ئەم رەزەبەبەرە بە پیتەمان بۆ ئاشکرا دەبێ ، لە فەرهەنگەکەی – دکتۆر ئیبراهیم حەمادە – دا (معجم المصطلحات الدرامية) ناوی چل‌و هەشت بابەتی سەربەخۆی دراماو جۆری درامای بردووە ، ئەمەو جگە لەوەی نووسەر دەیان جۆری تری درامای لەیاد کردووەو نەیناونەتە دووتوێ ئەو فەرهەنگەیەوە . هەر ئەم ووشەی

دراماپەشە لە لایەن دیدرۆ - Dederot
١٧١٣ - ١٠٧٨٤ ز - وبورمارشیّ -
١٧٣٢ - ١٧٩٩ ز - لە فەرەنساو لە
ناوەراستەكانی سەدەی هەژدەهەمدا : (ئەو
بابەتە شانۆیی‌یانەی گرتۆتەوە كە تایبەت
مەندبوون بە باس‌و خواس‌و بەسەرهات‌و
چیرۆكەكانی چینی ناوەراستەوە)(٧) . گەلیّ
جار ووشەی - دراما - واتا ئەو شانۆیی‌یانە
دەدات كە گیانێكی (جدی) تیابێت‌و
دووربێت لە گشت گالتەجاری‌و
بەسەرهاتێكی هیچ‌و پووچ . بەلاّم ئەمە
بەهەر جۆریّ بیّ‌گرنگ ئەوەیە ئەم ووشەیە
لەلای ئیّمە پر بە پری ووشەی شانۆیی‌یە .
كەواتە تایبەتە بەو تێكستانەی لە
سەرتەختەی شانۆ پیشان دەدریّن . بەلاّم
لە هەمان كاتدا دەبیّ ئاگامان لەوەش بیّت
كە چۆنی لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە بەهۆی
ئەو دەسكەوتە زانیاریانەی كەوتە دەست
مرۆڤ چەندە دەروو دەروازەو مەوداو
مەیانی نوێی هێنایە پیّشەوە وەك تەلەفیزیۆن‌و
رادیۆو سینەما . ئەوەبوو دراما خۆی
گەیاندە بازنەی كاری ئەوانەو خستیە
ریزی تەختەكەی شانۆوە لە ریّگای
كاركردن‌و بەردەوامیدا . . . دراما ئەو
سنورەو ئەو چوارچێوە كلاسیكی‌یەی
جیّ‌هیّشت‌و دەیان‌دام‌و دەستگای نوێ‌و
قوتابخانەی لیّوە كەوتەوە . ئەمانە
سەلمیّنەری دیالكتكیەتی هونەرەكەن‌و
رادەی زیندوێتی وپەرەسەندنی
دەست‌نیشان دەكەن .

گەلیّ جار دەبیستین دەووتریّ (ئای كە
درامی بوو) یان (رووداوێكی درامیانە
بوو . . حالەتێكی درامی بوو .
هەلّچونێكی درامی . . ژیانێكی . .
مەرگێكی . . ساتێكی . . كارێكی
جەرگ‌بری درامی بوو . یان پربوو لە
دراما . . ) .

ئاوا گەلیّ شت‌و ووشەی دراماپان بە
سەردا دەسپیّنریّ . ئەوەی جیّگای
سەرنجە ئەوەیە لە كاتێكاو بۆ حالەتێك
بەكار دەهێنریّ كە هەست بە قوولّی‌و
سەختی برین‌و ئازاریّ بكریّ . كاتیّ
هەست بە بزورگی و مەزنی كارێك
دەكریّ . كاتیّ هەست بە واقورمانی
رووداوێكی كتوپری چاوەروان نەكراو
دەكریّ . كاتی هەست بە خۆراگرتن‌و
خۆبەخت‌كردن‌و بەرەنگار بوونێكی لە
ووزە بەدەر دەكریّ . كاتیّ سووربوونی
ئەنجام وەدەست‌هێنان دەگاتە سەر مۆخ‌و
ئیسقان‌و قالبوونی ورەبەرنەدان‌و دلّنیایی
ریّگای مەبەست گرتنەبەر دەژیّ‌و روو
دەدات . هەموو ئەو شتانەی لە خولیایّ
بن‌و گەورەكەی مرۆڤەوە سەرهەلّدەدات
وهیواو ژیان دەگریّتە خۆ . هەموو ئەوانەی
چ خاكە ساری وویّرانە مالّی‌و یان‌گەردن
ئازادی‌و ئاهی هیوا پیاهاتنەوە بیّ .
ئەووشەیە دەخاتە سەر زارو . وابەبیرادیّوا
دەبینیّتەوە . هەرچۆن - دراما - خۆی لە
خۆی‌دا لە بنەرەتدا زادەی واقعە
ماتەریالی‌یەكەیەو جووت بوونیشی لە تەك
ئەو هەموو رەنگدانەوەی واقعە
ماتەریالی‌یەكە دا كارێكی سەیرو دوور
نی‌یە .

لە زۆر شویّن دا لە بری ووشەی -
دراما ووشەی دراماتیك - Dramatic
- دیّتە پیّشەوەو بەهەمان شیّوەی كە چۆن
ووشەی - دراما - دەینواند بەهەمان شیّوە
لە فەرهەنگی ژیانا دەشنی‌و واتا
ئەگریّتەخۆ . ئەوەی جیگای سەرنجە ئەم
ووشەی - دراماتیك .ە دراما دەكاتە
نیشانە (صفة) بۆ كارو رووداو . هەرچۆن
ووشەی شیعر بەكاردەهیّنریّ بۆ نیشانەوان
بە شویّن‌و كارو هەلّس‌وكەوت‌و بیرا‌و . .
وەك : كۆریّكی شاعیرانەبوو . جوانیەكی
شاعیرانە بوو . ژیانێكی شاعیرانە بوو .
زمانێكی شیعری هەبوو . . ئیتر بەو جۆرو
شیّوەیە ئەم ووشەی دراماتیكەش
دەبیستریّ‌و هەلّدەسوریّ . دەووتریّ
دەست بەردانێكی دراماتیكی بوو . .
كەواتە بەكارهێنانەكەی بۆدان‌و سەپانی
مۆركێكە بەوشت‌و كارە . ئەمەش هەز
دەگەریّتەوە بۆ بوونی پەیوەندیەكی ئەو
رووداوە بە بارو دۆخ‌و چۆنیەتی هونەری
دراماوە . كاتیّ ووشەی دراما بەیادا دیّت
ئەوە بیردەخاتەوە كە چۆنی دراما زادەی
بابەتە تەراژیدی‌یەكانە بەر لە بابەتەكانی تری
ئەم هونەرە . وەك ئەم ووشەیە زیاتر ئەو
جۆرەی لە ئەستۆ بگریّت چونكە زۆربەی
ئەو بەكارهێنانەی نە ئەو حالەتانەیە كە
شیّوەیان لە شیّوەی تەراژیدیا دەچیّت‌و ئەو
جۆرە تیّروانینانەی تیایە كە نزیكن لە
سەرنج‌و تیّروانینی پالّەوانە
تەراژیدیاییەكان . بیّگومان تیّروانینی
پالّەوانی كۆمیدی . بەهەمان شیّوەی كە
چۆن تەراژیدیاو كومیدیا دوو جۆر تیّروانینی
جیاوازی مرۆڤن بۆ مەسەلەكەی بوون‌و
ژیان‌و دەوروبەرو هەموو ئەو شتانەی لەسەر
خانیانا وەك بیرورا كە دەخولقیّ . كەواتە
دوو فەلسەفەی جیاوازن . دوو
لیّكدانەوەن بۆ یەك مەسەلە كە مەسەلەی
ژیان . تەراژیدیایی‌یەكەیان لە گۆشەنگای
هەست وسۆزەوە دەروانیّ وروانگەیەتی‌و
هەلّس‌وكەوتی پیّ دەكات .
كۆمیدیایی‌یەكەشیان لە بیرو هۆشەوە تەماشا
دەكاو هەنگاو هەلّدەهێنیّتەوە . پالّەوانە
تەراژیدی‌یەكە سیّ‌و دوو كردنی نی‌یە وهەر
دەبیّ سەری خۆبەدەستەوەدان بدات لە
بەردی رەقی چارەنووس وهەلّهاتن‌و

خۆلادانی بۆنی‌یە لەو راستەڕێی‌یەو بەنەنگی‌و شوورەیی دەزانی‌و نەفس‌بەرزی ئەو خولقەی پی‌بەخشیووە ئەوە مایەیەتی‌و گشت شتی‌ بدۆرێنی‌ ئەوەیان نەبی‌و نابی‌ . ئەمەش عەنعەناتێکەو میراتی‌یەکی کۆنەو لەو کۆمەڵگایانەوە هاتووەو گەیشتووە . بەڵام چ کاتی‌ پاڵەوانی کۆمیدی بەوشێوەیە خۆی نادا بە دەستەوەو دەربازبوونی لە خۆیدا دروست دەکات‌و لە چارە ڕەشی هەڵدی‌و بەخۆیدا دەروانی‌ کە چەندەی لە وزەو بارایە زیاتر بەردەوام بی‌ . ئەو پێکەنینەی کە پی‌دەکەنی‌ ئەو برواهێنان‌و سەرفرازی‌یەی تیا پێچاوەتەوەو هەڵگرتووە .

کەواتە لێکچوون ئەم بەکارهێنانەی دەسەپێنی‌ هەر چەندە ڕەواش نەبی‌ بەهیچ کلووچێکیش نەگونجی‌ لە رووی زانستەوە . دکتۆر موحەمەد مەندوور ویستویەتی بچێتە بنج‌وبناوانی ووشەی دراما - وە ماناکەی دەربێنی‌ بەوەی کە دەڵی‌ : (مانا زمانەوانی‌یەکەی ووشەی دراما لە جوڵاندنەوەوە هاتووەو لەبەر ئەم مانا زمانەوانی‌یەشە وبەتایبەتیش لە شێوەی نیشانە پی‌دانی مانای ئەدەبێکی شانۆیی کە پی‌ی دەووترێ‌ - ئەدەبی دراما بەگشت جۆرەکانی‌یەوە چ جدی‌یەکانی‌و چ گاڵتەو گەپی‌یەکانی . هەر لە ئەنجامی ئەم زاراوەیەوە هاتە سەر ئەو شانۆیی‌یە جدی‌یە هاوچەرخانەی جێگرەوەی شانۆیی‌یە تەراژیدی‌یەکانی)[8] . دکتۆر مەندوور لەتەك دکتور ئیبراهیم حەمادەدا یەك‌ئەکەون لەسەر نموونە هێنانەوە بۆ دراماو ئەو درامایەی مەبەستیان‌و ئەو ووشەیەی بەسەرا دەبرێ‌ . تەماشا دەکەین هەردووکیان شانۆیی‌یەکانی ئەبسنی نەرویجی ١٨٢٨ ١٩٠٦ ز و برناردشۆی ئیرلەندی ١٨٥٦ - ١٩٥٠ ز و - ئەنتوان چێخەفی رووسی ١٨٦٠ - ١٩٠٤ ز - یان بە نموونە هێناوەتەوە پێناسینەکەی دکتۆر موحەمەدی مەندوور زیاتر بریتی‌یە لە لێکدانەوەو پێناسەکردن لە روی زمانەوانی‌یە وە . ئێمە ناڵێین لەو لایەنەوە بی‌بایەخەو گرنگ نی‌یە بەڵام ئەوەندە هەیە کە سەرنج‌دانی باری گشت شتێك لە مەودای کارکردن‌و بووندا گرنگی زۆرەو زیاترە . چونکە بوونی ماتەری ئەو شتەیان بڵێین ئەو ووشەیە لە ژیانی کارکردندا بایەخی هەیەو ئەو کارو فەرمانەی شووناسنامەو ناوی پی‌ دەبەخشی‌ . زمانیش بە گشتی زادەی ژیانە وپێداویستەیەکی گوزەرانەو هۆیەکە لە هۆ هەرە گرنگەکان بۆ دەربرین‌و نزیکبوونەوەو بە ئەنجام گەیشتن‌و تەواوکەری کۆکردنەوەو کۆمەك کرد بە کۆمەڵانی خەڵکی . دەبوو گرنگی بە ناوەرۆك‌و لایەن‌و رووەکانی ئەم بابەتە بدایەو خاسیەتەکانی ڕەچاو بکرادیە . جگە لەوەی کە هیچ رایەکی دەربارەی کارو کەرەسە تەواوکەرەکانی دەرنەبڕیووە لە کاتێکدا دەووترێ‌ - دراما - ئەم ووشەیەی لە چەند پیتێك پێکهاتووە ناپچری‌و لە زەمینە سەرەکی‌یەکەی دابڕنابی‌ . لە زەمینە زیندووەکەی لە زەمینە ماتەریالی‌یەکەی . منیش ڕاموایە کە - دراما - دوو شت دەگەێنی‌ : یەکەمیان بریتی‌یە لەو بابەتە ئەدەبی‌یە کە وەك - تێکستێك . دووەمیان بریتی‌یە لەو هونەرەی پێشکەش دەکری‌و دەبێتەوە بە تەواوکەری کاری یەکەمیان و دەخاتە سەر باری مەبەست‌و ئەرکە سەرکی‌یەکەی دەگەێنی‌ . خۆ ئەگەر هاتو ویستمان واتا زمانی‌یەوانی‌یەکەی وەرگرین ئەوە فەرمان کردن دەگەێنی‌ .

**پەراوێز :**

١ یۆنان - ئەم ووشەیەمان بەکارهێناوە بە مەبەستی گریك Greece - واتا وڵاتی کۆنی ئیغریق .

٢ - Action بە گەلی‌ مانا وەرگێراوە . بە مانای فەرمان یان فەرمان بەجی‌هێنان . هێندی‌ جار بە ماناو مەبەستی زنجیرەکارێك یان کۆمەڵە روو داوێك هاتووە . بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی بە سەرهاتە شانۆیی‌یەکەی لێوە پێك‌دی‌و لەسەر شانۆ دەنوێنری‌ لەلای - ئەرستۆتالیس فەرمانە بنەرەتی‌یەکەی دراما کە دەگرێتەوە .

٣ - بەکارهێنانەکەی زۆر کۆن نی‌یە .

٤ Imitation - ئەرستۆتالیس ئەم ووشەیەی بەکارهێناوە بۆ پێناسەکردنی گشت‌جۆرەکانی هونەر . بەڵام پڕ بە پری ووشەی لاسایی‌کردنەوە وەیە یان گێرانەوە و پیشاندانەوە .

٥ ارستوتاليس - فن الشعر - ترجمة عبدالرحمن بدوي ص ١٠ .

٦ - حسين رامز - الدراما بين النظرية والتطبيق - ص ٢٠ .

٧ ابراهيم حمادة - معجم المصطلحات الدرامية - ص ١٤٣ .

٨ - د - محمد مندور المسرح العالمى - ص - ١٣ .





# میکانیزمە ئەقلی‌یەکان یان

# میکانیزمەکانی بەرگری

گۆڕینی ناصح فاتح

میکانیزمە ئەقلی‌یەکان یان میکانیزمەکانی بەرگری Mental or Derense Mechanisms بەڕاستی هەلوێست ناگۆڕن بەلکو هەندێ لەو دوودلی‌یە Anxiety لادەبەن کە هەلوێست بەرهەمی دەهێنێ. ئەمانە هەموو مرۆڤێك جارجار بەکاریان دەهێنن بەجۆرێك هەندێکیان بۆ گەشەکردنی کەسایەتیمان Personality بە پێویست دانراون. ئێمە لێرەدا هەندێك لە گرنگترین یان باوترین ئەو میکانیزمانە باس دەکەین : —

۱ — نکوولی‌کردن Denial

ڕێگەیەکە لە هەموو پلەکانی گەشەی کەسایەتیدا . بۆ کەمکردنەوەی دوودلی بەکاردەهێنرێن . بەکورتی بریتی‌یە لەوە کە نامانەوێ ڕوو بەڕووی شتەکان بین وەك لە ڕاستی‌دا هەن . منالێك پەرداخێك لەسەر مێزێکەوە دەخاتە خوارەوەو دەیشکێنێ . دایکی دێتە ژوورەوەو دەپرسێ ئاخۆ منالەکە شکاندوویەتی ؟ منالەکە . لە کاتێکدا هەست بە تاوان دەکات‌و ئازاردان دەزانێ . نکوولی لەوە دەکات خەتای ئەو بووبێ . سەربازێك کە مەشق دەکات‌و لە فڕۆکەیەکەوە یەکەم جار بە پەرەشووت بازدەدات . کاتێ لێی دەپرسن ترسی لێ نیشتووە ؟ نکوولی دەکات . چونکە دان بە ترس دانان تێك‌شکاندنە بۆ ئێگۆ «الانا» Ego . بۆ ئەوەی ئەو نموونانەی سەرەوە نکوولی بن لە باری سەرنجی پزیشکی دەروونی بەوە پێویستە خاوەنەکانیان لەو باوەرەدا بن ئەوەی‌و نموونە ڕاستە . چونکە درۆکردنی شعوری بەم مانایە نکوولی نی‌یە .

۲ بیربردنەوە Suppression

بریتی‌یە لە لابردنێکی شعووریانەی هەندێ هەست‌و بیرو یادی نەویستراو لە هۆشیاری . ئێمە تەنیا پالیان پێوەدەنێین بۆ ناوچەیەك «بۆ ئەقلی ژێر هۆشیاری Sub Conscins Mind کە کۆگەی یادەکانمانە» . وە هەر کاتێك بمانەوێ بیان هێنینەوە یاد دەستمان دەیانگاتێ . ئەو یادانەش کە گرنگی‌یان بۆمان نەماوە سەر بەم لایەنەن .

۳ خەفەکردن Pepression

نابێ لەگەل بیربردنەوەدا تێکەلی بکەین هەرچەندە دوو ووشەکە بە ئینگلیزی زۆر لەیەك دەچن (Suppression &Repression) و کاریشیان هەر لەیەك

دەچیٚ .

خەفەکردن بریتی‌یە لە بەدەرنانی بیرو شارەزایی‌و . . بەرگە نەگیراو لە بواری هۆشیاری‌و پالٚپێوەنانیان بۆ «لاشعور Unconsciousness) و هێشتنەوەیان لەوێدا . خەفەکردن میکانیزمێکی لاشعووری تەواوە . بریتی نیە لە هەوڵێکی ئەنقەست‌و هوشیارانە بۆ بە دەرنانی بەشێك لە (خود Self) ، بەڵکو بریتی‌یە لە کردارێکی خۆنەویستی نکوولی کردن‌و لابردن کە یارمەتی کوێرکردنی کەسێك دەدات لە ئاستی ئەوەی لە ناوەوەیدا روودەدات .

ئەگەر خەفەکردن بەنەرمی کاربکات‌و دوودڵی لابەرێت ئەشیٚ یارمەتی دروست کردنی ژیانێکی تەواو گونجاو بدات . ئیتر هەر چۆنیٚ بیٚ ، بریتی لە جۆرێك لە میکانیزمی زیندە بەچاڵ کردن Burying a live مادة خەفەکراوەکە هەمیشە چالاکەو عاتیفەی بەهێزی لەگەڵدایە . لەوە دەچیٚ هەمیشە بە دووی دەربریندا بگەڕیٚ . لەبەر ئەوەی ئەم مادەیە دەربرینی راستەوخۆو هوشیارانەو نەرمی لیٚ قەدەغەکراوە ، هەوڵ‌دەدات دەربرینێکی خۆگۆڕیو Disguised «واتە بە شێوەیەکی رەمزی» بەدەست بێنیٚ‌و خۆی دەربازبکات . لەبەر ئەمە دەبینین ناوەرۆکی ئاڵۆزیی دەمار «هلوسە» و خەون مانادارە ، بریتی‌یە لە دەربرینی رەمزی‌ی مادە ئەقڵی‌یەکانی شعور . ئەبیٚ ئەوەش بوتری کە رەمز زمانی شعوورە .

**٤ – رەمزاندن Symboliztion**

بریتی‌یە لە میکانیزمی هەردوو شعوورو لاشعوور ، بریتی‌یە لە بەکارهێنانی نیشانەیەکی مانادار بۆ نواندنی یا لەبری‌دانانی بیرێك ، سیفەتێك یان شتێك ئیمەرەمزب تەواوی لاشعوور یانەبە کاردە هێنین رەمزێك کە زۆر لەگەڵی ئاشناین . ئاڵای‌و لاتەکەمان ، کە لە راستیدا لە پارچە قوماشێك زیاتر نی‌یە کە رەنگ‌و رێکخستنێکی تایبەتی هەیە ، لەخۆیدا نرخێکی کەمی هەیە بەلاٚم وەك رەمزێك لە جێگەی ولاٚتەکەمان دانراوەو مەیلی ریزو دڵسۆزی‌و خۆشەویستی دروست‌دەکات‌و نرخیشی بیٚ پایانە . هەروەکو زوربەی خۆگونجاندنمان بۆ کەلەپوور لە فێربوون‌و بەکارهێنانی رەمزەوە سەرهەڵدەدات . وشە بریتی‌یە لە تەنیا سیٚ پیتی چاپکراو ، بەلاٚم یەکێکە لە وەسیلەکانی زمان . منالێکی بچووك فێردەبیٚ کە دەنگی «دایە» ئەو کەسە گرنگە دەنوێنیٚ کە بایەخی پیٚ دەدات کەچی دوایی ئەوە فێردەبیٚ کە ئەم پیتانە د – ۱ – ی – ك هەردوو دەنگی دایەو ئەو وێنەیەش دەنوێنیٚ کە دەنگەکە بەرامبەریەتی . تەنیا نیشانە ، یا تەعبیرێك ، ئەشیٚ رەمز بیٚ بۆ ، یا هەموو مانای هەڵویستێکی ئاڵۆز هەڵگرێت .

رەمزایەتی لە منداڵی ئەقڵ نەخۆش‌دا Mentally Tll بەزۆری تێك‌دەچیٚ ، هەندیٚ جار نەخۆشێکی سایکۆزی Psycotic لەخۆیەوە وشەی تازە دروست‌دەکات بامانای تایبەتی دەدات بە هەندیٚ وشە (نیوبولیجزم) ، لە کەسانی ئەقڵ زۆر دواکەوتوودا Profoundly Retarded توانای رەمزاندن زۆر کەمە ، ئیدراکیان لە کەسانی ئاسایی زیاتر مەلموسە Concrete و کەمتر پەتی‌یە Abstract .

**٥ – بیانوو هێنانەوە Rationalization**

میکانیزمێکە زۆر جار لە هەموو کەسێك‌و لە هەموو تەمەنێك‌دا بەکاردەهێنرێت . بە خۆشی‌و زەوق کەسانی ئاسایی دادەنرێن و فێڵێکی خۆخەڵەتاندنە . بیانوو هێنانەوە بە ئاسانی بریتی‌یە لە دۆزینەوەی هۆیەکی مەنتیقی بۆ ئەو شتانەی کەسێك ئەیەویٚ بیانکات ، یان دۆزینەوەی هۆ یان بیانوو بۆ نەکردنی شتێك کە دەبیٚ بکرێت ، ژنی جوامێر سوورە لەسەر ئەوەی جوامێر دوای بەرچاپی بچێتە دەرەوە چیمەنەکە بدرۆیتەوە . جوامێر دەیەویٚ . بچیٚ بۆ ماسی‌گرتن ، ئەڵیٚ مۆتۆری ئامێرەکە باش کارناکات‌و ئەبیٚ پێش بەکارهێنانی بیبات بۆ بازارو تاقی‌بکاتەوە . جوامێر ئەچیٚ بۆ ماسی‌گرتن . ژنەکەی بەرگێکی گران بەها دەکری گەرچی پێویستیشی نیە . کرینەکەی بەوە پەساودەکات لە بەرگەکە ئەوەندە چاك‌و بە رەونەق بووە نەیتوانیوە نەیکریٚ لەگەڵ ئەوەشدا ئەتوانیٚ چەند ساڵێك وەك بەرگی سەرەکی لە بوخچەکەیدا بەکاری‌بهێنیٚ ، واتە سەرەنجام پارە بۆ (جوامێر) دەگێرێتەوە .

**٦ – چوونە قاڵب Identification**

لە سایکۆلۆجی‌دا دوو مانای کەمێك جیاوازی هەیە . بریتی‌یە لە بەدەست‌هێنان‌و زەوق وەرگرتنێکی دووەمی «ئانوی» لە رێگەی کەسێکی تر یان کۆمەڵێك کەسەوە ، وەك یانە ، یا برادەرایەتی . یان ئەشیٚ بریتی بیٚ لە چوونە قاڵبی عاتیفی دووەمی کە لە فلیمێك یان خوێندنەوەی چیرۆکێکەوە بەدەست‌دێت ، بە نموونە «منداڵێك»ی ناکۆمەڵایەتی ئەشیٚ زەوق‌و ئارەزووی منداڵێکی کۆمەڵایەتی ببینی بەوەی بیٚ بە هاورێیەکی دڵسۆز . منداڵێك کە لە لەشی

تەواونەبێ ئەشێ خۆی هەڵواسێ بە یەکێکی جوانو سەرنجڕاکێشدا ، تا بەمە بەشداری سەرکەوتوویی ئەو بکات . هەروەها ئەو کەسەی خۆی دەخاتە قاڵبی کەسانی شانۆگەری‌یەك یان کتێبێکەوەو بە خۆشی‌یان پێ‌دەکەنێ‌و بە داخیان دەگری .

دووەم : – بریتی‌یە لە وەرگرتنی کەسان ، بیر لە ئایدیالی دەرەوەی (خود) کە لەگەڵیاندا وا هەست‌دەکات بەشێکن لە خود وە دواجار دەچنە بەرگی کەسایەتی ئەو کەسەوە . هەموو منداڵان دەچنە قاڵبی باوانیانەوەو هەڵسوکەوتەکانیان لاسایی دەکەنەوە . کچێکی بچکۆڵە سەیری دایکی دەکات کە منالەکەی دەگۆڕێ‌و شیری دەداتێ ، ئەویش بووکە شووشەکەی بەدەستەوە دەگرێ‌و هەنگاو هەنگاو لاسایی دایکی دەکاتەوە . کوری بچووك سەیری باوکی دەکات کە لە دوکانەکەیدا مێز دروست‌دەکات ، ئارام ناگرێ تا بەدەستی خۆی هەموو ئەو شتانە دەکات (یان بەیاری) وە هەموو جوڵانەوەکانی برینەوەو نەخشەکێشانو ڕنینی پارچە تەختە تاقی نەکاتەوە . زۆر کرداری فێربوونی منداڵ لە ڕێگەی «چوونە قاڵبەوە» Identification ڕوودەدات . کاتێ کەمێك گەورەتر دەبێت دەچێتە قاڵبی مامۆستاکان ، وێنە ئەفسانەیی‌یەکان پاڵەوانەکانو خواکانەوە . لە یاریدا خۆی دەکات بە سەرباز ، کاوبۆی‌و نوێنەر «یان ئەستێرەی» فیلم . تەنانەت دوای پێگەیشتنیش مەیلی ئەوەمان هەیە کارو ئاکاری ئەو کەسانە لاسایی بکەینەوە کە بە گرنگیان دەزانین . ئەگەر ئەو شتەی دەچینە قاڵبیەوە چاکە بێت ئەوا کاریگەری لە سەرمان بەکەڵك دەبێ ، خۆ ئەگەر خراپ بێ ئەوا دەشێ کاریگەری‌یەکی رووخێنەری لەسەرمان هەبێ .



### ٧ – برێتی Compensation

هـــەروەك چۆن سروشت تۆڵەی‌نەخۆشی‌و ناتەواوی‌یەکانی لەشمان دەکاتەوە «وەك ئەوەی کوێر گوێی سووك دەبێ یان هەستی دەست‌لێدانی زیاد دەکات» ئاواش ئێمە بیروڕاو سیفەتی کەسایەتی لەبارەی خۆمانەوە بەدەست‌دەهێنین وەك هۆیەکی لەبری‌دانی



جۆرەها نەگونجاوی . کابرای کورت بەزۆری هەوڵدەدات کورتی باڵاکەی بەوە داپپۆشێت کە خۆی شازو بەرزو شاناز دەربخات ، کەسێکی شەرانی ئەشێ لە هەموو بۆنەیەکدا رادە بەدەر بە نەرمی بجوولێتەوە بۆ ئەوەی شەرانی‌یەکەی خۆی لە خەلکی و بەتایبەتی لە خۆی بشارێتەوە . کاتێ برێتی لە رادە بەدەر دەبێ پێی دەگوترێ Over Compasation یان Reaction formation . ئەو کەسەی ئەم جۆرە (برێتی‌یە) بەکاردەهێنێ عادەتەن گوێگرەکەی پەست‌دەکات نموونەیەکی باوی (برێتی) ئەو دایکەیە کە زۆر چاودێری منالەکەی دەکات و زۆر لەگەڵیا نەرمە ، گەرچی لاشعووریانە رقی لێ‌یەتی . ئەم رەفزکردنو دوژمنایەتی‌یەی بەرامبەر منالەکەی لە رووی شعوورەوە قبوول نی‌یە بۆیە هەڵسوکەوتێکی دەرەکی‌ی بایەخی زۆرو گرنگی پێدان بەدەست دێنێ تا نایەڵێ هەستی «هوشیاری‌ی» بەم هەستانەی ناوەوەی بزانێ .

هەرچۆنێ بێ ، برێتی ساکار ئەشێ بۆ کەسایەتی زۆر بەکەڵك بێ ئەگەر بۆ سیفەتی سوودبەخش بەکاربهێنرێت لە جیاتی سیفەتێکی رووخێنەر یا نادیار یا یەکێك کە ئەو کەسە نەیتوانیوە بە سەرکەوتوویی بەکاری بهێنێ . بۆ نموونە کچێکی ناشیرین کە ناتوانێ بەربەرەکانێی خوشکە جوانەکانی بکات ، ئەشێ بریار بدات گەشە بەئەقلی ، یا جۆرە زیرەکی‌یەکی بدات لەجیاتی نەبوونی جوانی لەشی . بەربەرەکانی بەزۆری برێتی دروست‌دەکات .

### ٨ – گەرانەوە Regression

برێتی‌یە لە گەرانەوە لە نموونەی ئێستاوە بۆ ئاستی هەڵسوکەوتی رابردوویی کاتێ کاری ، یا دەوروبەری کەسێك وا لە (خود) دەکات بە قووڵی هەست بە نارەحەتی‌و دوودڵی بکات ، (خود) ئەیەوێ بەدوای ئاستێکی نزمتری خۆگونجاندنو دەربرین‌دا بگەرێ «هەڵسوکەوت» ، ئەیەوێ بگەرێتەوە بۆ ئاستێکی زووتری هەڵسوکەوت کە لەوێ‌دا ململانێ کەمترو دواجاریش دوودڵی‌یەکی کەمتریش دەبینێ .

هەندێ کەس دەگەرێنەوە بۆ هەڵسوکەوتی منداڵانە چونکە منداڵی ئەو کاتە بووە کە تەگەرە لەچاو خۆیدا کەم‌بووەو کەمیان لێ چاوەرێ کراوە . ئەوان بە غەریزە بەدوای ئەو ئاستەی هەڵسوکەوتی رابوردوویاندا دەگەرێن کە کەمتر تەگەرەی هێناوەتە رێیان . بۆیە یەکێك ئەشێ تەنیا چەند ساڵێك بگەرێتەوە ، یەکێکی تر هەڵسوکەوتی پێنج ساڵی دەکات وە جارجار ئەشێ یەکێك بە جۆرێ بگەرێتەوە کە لەبارەی ساواییدا خۆی گرموڵە بکاتو بەبێ جوولە بمێنێتەوە .

«گەرانەوە» میکانیزمێکی تەندروستیانە نیە ، خۆگونجاندنێکی حەزلێکراو نادات .

شێوەو پلەی ناماقوولی گەڕانەوە ئەبێتە هۆی نارێکوپێکیو مەترسی کەسایەتی. شێوەیەکی سادەو زۆر بینراوی گەڕانەوە کاتێ ڕوودەدات کە بالقێك An Adult بە شێوەیەکی کاتی پەنا دەباتە بر هەڵسوکەوتی منالأنە بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێکی تایبەتی «بۆ نموونە کەسێك ئەگەر نەتوانێ ئەوەی دەیەوێ بیکات ئەشێ بداتە پرمەی گریان ئەگەر ئەم کەسە لە تەمەنی زوویدا بۆی دەرکەوتبێ گریان زۆر جار ئەنجامێکی هەیە.

**٩ – گۆڕین Conversion**

گۆڕین ئەو میکانیزمە یا پرۆسێسەیە کە بەهۆیەوە ملمڵانێی عاتیفی Emotional Conflict بەشێوەی نیشانەی فیزیایی «لاشەیی» دەردەبڕێن. هەمووومان بەهۆی دوودڵییەوە تووشی سەرئێشە بووین. قوتابییەکی کۆلیژ کە بۆ تاقیکردنەوە دەخوێنێو لە دەرچوون زۆر بە گومانە دەشێ سەر ئێشەیەکی توند بگرێ. ئافرەتێك کە بۆ ئاهەنگێك بانگکراوەو زەوقی لێی نییە، ئەشێ نیشانەی نەخۆشی گەدەو ریخۆڵەی لێ دەربکەوێ تا بەهۆیەوە خانەخوێیەکە لە نەچوونی ببوورێ. زۆر جار کە کاتی ئەو وەختە بەسەر ئەچێ کە دەبوو تیایدا حازر ببوایە نیشانەکان خۆیان چاکدەبن.

**١٠ – هیستیریای گۆڕان Conversion Hysteria**

بریتییە لە گۆڕانی ململأنێی عاتیفی بەهێز بۆ نیشانەی فزیولوجی وا کە ئەبێتە هۆی دەستەپاچەیی Helpleness کەسەکە بەمەش ململانێکە چاردەبێت، بۆ نموونە سەربازێك لە مەیداندا ئەشێ زۆر بەوە تێکبچێ بکوژێت یا بکوژرێت. ئەو ناتوانێ دان بەم ترسنۆکییەی خۆیدا بنێ چونکە ئەمە ئیگۆی دەرووخێنێ، پێی برینێکی سادەی تووشدەبێ، دەبرێت بۆ خەستەخانە، لەوێ قاچی تووشی ئیفلیجی دەبێت. دکتۆرەکان ناتوانن هیچ هۆیەك بۆ ئەم ئیفلیجییە کوتوپڕە بدۆزنەوە بەڵێ ناتوانی قاچی بجولێنێتەوەو بەتەواوی بێ ئاگایە لەوەی کە ئیفلیجییەکەی بەهۆی ترسانییەوەیە. لە گەڕانەوە بۆ مەیدانی شەڕ. مادام قاچی تووشی ئیفلیجی بووە لە ڕووی فیزیۆلۆجییەوە ناتوانێ ئەوە بکات، بەم جۆرە ململانێ کەی حەلدەبێ. لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا زۆر کەس تووشی ئیفلیجی بوونو لە سەنگەر دوورکەوتنەوە. کاتێ کە هەواڵی شەڕ وەستان بلأوکرایەوە ئەم سەربازانە توانیان لە پڕێکا قاچو دەستە بادارەکانیان بەکاربهێنن. ئەم شارەزاییە وای لە دکتۆرانی جەنگ کرد باوەڕ بەوە بهێنن کە هەندێ ئیفلیجی میکانیزمی بەرگریی لاشعوورێن.

نموونەیەکی تری ئەم میکانیزمە ئەو منداڵەیە کە ئەوەندە ڕقی لە باوکی بوو بەجۆرێ ئەیویست ئازاری پێ بگەیەنێ لەبەر ئەوەی ترس ڕێی نەئەدا ئەمە بکات ئەیتوانی ئەو دەستەی تووشی گۆجی بێ کە ئەمەش بۆ ئەو دوو شتی تێدایە: یەکەم ململانێکە حەلدەکات «ناتوانێ لە باوکی بدات ئەگەر حەزیش بکات»، دووەمیش برێکی باش سۆزو بایەخپێدانی تێدا دەست دەکەوێ.

بەلأم، گەڕانەوە بۆ گۆڕانی باوترو کەمتر دراماییی کە تیایدا دوودڵی بە گۆڕان بۆ نیشانەی فزیۆلۆجی جۆراوجۆر ئاساندەکرێت، ئەم کەسانە نیشانەکانی بە سەربەستی دەردەبڕن «وەك قسەکردن لە بارەیانەوە» و لەوە دەچێ پێیانەوە بەسترابن. ئەمان خۆیان بە نەخۆش پیشان نادەن «بەلأم بەراستی هەست بە بەدحالی دەکەن» وە دکتۆرەکان ناتوانن هیچ بنچینەیەکی لاشەیی بۆ ئێشو ئازارەکانیان بدۆزنەوە. نەخۆشییەکانیان لەوە دەچێ جێگرێك بێ بۆ عاتیفەو ناچاری حەزلێنەکراو وە ئەمان بەرگری هەر هەوڵێکی ڕاست دەکەن بۆ یارمەتیدانیان چونکە لاشعوریانە نەخۆشییەکەیان بەکاردەهێنن بۆ ڕاکردن لە ئەنجامی کارەکانیان..

**١١ – هەڵنان Sublimation**

بریتییە لە میکانیزمێکی ئەقڵی کە بەزۆری بەکەڵکە «دروستکەرە». بریتییە لە ئاراستەکردنی پاڵنەرێکی Drive بەهێزو ناکۆمەلأیەتی بەشێوەیەك کەکۆمەڵ بە باشی بزانێ. بۆ نموونە هونەرمەندێك ئەشێ پاڵنەرێکی جنسی زۆر بەهێزی هەبێ. دەربڕینی ئەم پالنەرە بەشێوەیەکی یەکسەری لە ڕێزو پایە کەمدەکاتەوە.

بەلأم ئەگەر بەشێوەیەکی تر دەریببڕێ وەکو وێنەکێشانی ئافرەتێکی ڕووتی دلڕفێن ئەوا بەشێوە دەربڕینێکی تەواو قبوولکراوی عەشق Eroticism دادەنرێن. ئەو نەك هەر لای کۆمەڵەوە قبوولدەکرێت، بەڵکو ئەگەر وێنەکەی بەراستی جوان بێ، خەلأتیشی دەکرێتو ڕێزی لێ دەگیرێت. ئارەزووی پەلأمارAgression ئەشێ هەڵبنرێن بۆ وەرزشو یاری کە نەك هەر زۆر قبوولکراون بەڵکو ئەتوانن یارمەتی گوێگریش بدەنو پەلامارەکەیان بگۆڕن.

### ١٢ – کشانەوە Withdrawal

هۆیەکی پارێزەرە کە مرۆڤ بەهۆیەوە خۆی لە ڕووخانی زیاتری ئارامیی Security لادەدات لە ڕێگەی کشانەوە لە خەڵك‌و خۆلادان لە پەیوەندی نزیکی نێوان کەسان . ئەشێ وەك نموونەیەکی کاتی یا دەگمەن ڕوودات ، یا بە شێوەیەکی تەواو بەجۆرێ ئەو کەسە گوێ نەدات بە دەوروبەرو ئاگای لێ نەبێ . کاتێ کشانەوە بەسەر هەڵسوکەوتدا زاڵ دەبێ ، تەنیایی پەیدادەبێ . شێوەیەکی سادەی کشانەوە لەو کەسانەدا بەدیدەکرێت کە پەیوەندییەکی ڕووکەش بە جۆرەها کەسەوە دەکەن . ئەمان هاوڕێی ڕاستەقینە ناگرن نەوەك تووشی پەیوەندی عاتیفی قووڵ بن . ئێمە بەمانە دەڵێین لە ڕووی سۆزەوە ساردن .

کشانەوە سیفەتێکی زاڵی شیزوفرینیاییە . ئەم نەخۆشانە نەك هەر ناتوانن پەیوەندی عاتیفی تەواو بە خەڵکەوە بکەن بەڵکو شان بە شانی میکانیزمی کشانەوە میکانیزمێکی تری بەرگری بەکاردەهێنن – میکانیزمی گەڕانەوە . شیزوفرینیا گەورەترین کۆمەڵی نەخۆشانی سایکۆلۆژی دەگرێتەوەو . تەنیا نەخۆشیشە کە جار جار لە منالدا دەبینرێت .

### ١٣ – پەلاماردان Agresion

ئەشێ دەربڕینێکی شەڕفرۆشی بێ . شەڕفرۆشیش . ئەشێ بە ئاشکرا یا بە ڕەمز دەرببڕێت . پەلاماری کراوە Open Aggresion . وەك لێدانی کەسێك یا قسە پێ وتن‌و جنێو پێدانی . گومانی تێدا نیشانەی تۆڵەسەندنەوەن . تۆڵەش بەدەوری خۆی مەترسییە بۆ ئازاری . کەواتە دەربڕینی دەرەکیی پەلاماری ئاشکرا ئەشێ سەرەنجامی شوومی هەبێ .

هەندێ کەس کە ناتوانن شەڕفرۆشییەکەیان دەرنەبڕن ، بەڵام لە تۆڵەسەندنەوەش دەترسن ، ڕووی دوژمنایەتییەکەیان دەکەنە خۆیان بەشێوەی لێدان‌و سزادان یا ڕاستتر خۆ سزادان Self-Punishment دەریدەبڕن . ئەم جۆرە خۆسزادانە لەناو ئەقڵ دواکەوتوواندا The Mentally Relarded باوە .

شێوەیەکی فێڵاوی تری پەلامار بەکارهێنانی هەمیشەیی گاڵتەپێکردنە ، زۆر لەبیر چوونەوەی ناوو ژووان ئەشێ نیشانەی شەڕفرۆشی بێ .

پەلامار ئەشێ بەسەر دەوروبەریشدا بچەسپێنرێت وە مرۆڤ ئەشێ زۆر ڕووخێنەر بێ بەرامبەر بە شتە ماددییەکان ، هەموومان کەسی کەم چیکڵدانەمان دیوە کە کەمترین کۆسپ وای لێ دەکات پەنا بەرێتە بەر کرداری پەلاماردان . هەروەها ئاگادارین کە هەندێ کەس لەژێر کاریگەری ئەلکهوولدا زۆر ڕووخێنەر دەردەچن . ئەم کەسانە ئەشێ لە کاتی لە هوشیاریدا نەرم . هاوڕێ . دۆست وە بەرپرسیار بن بەڵام کاتی کاریگەری ئەلکهوول ناوەوەیان دەردەخات بە شێوەیەکی شەڕفرۆشانە وەڵام دەدەنەوەو حەزدەکەن شەڕبکەن‌و شتومەك بشکێنن .

جۆرێکی پەلامار کە بەدەگمەن هۆکەی دەزانرێت بریتییە لە دڵتەنگی زۆر Severe Depression . کەسی زۆر دڵتەنگ جۆرێك لە خۆ پەلاماردان یان ئازاردان دەنوێنێ . کەواتە دەبینن پەلامار ئەشێ کراوە یا ڕەمزی بێ . بەهەر شێوەیەك دەربڕێت . پەلامار میکانیزمێکی باوی بەرگرییە .

### ١٤ – پرۆجێکشن Projection

بریتییە لە سەرزەنشت‌کردنی کەسێکی تر بەرامبەر هەڵەو نەهاتی‌و کەوتنەکانی خۆت . قوتابییەك دێتەماڵەوە بەتوندی سکاڵا دەردەبڕێ «من لە تاقیکردنەوەی مێژوودا خراپ بووم چونکە ماموستا ڕقی لێمە» . بنووسێك «کاتب» سەرزەنشتی ژنەکەی دەکات لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە لە کارەکەیدا سەربکەوێ . حکوومەتێك لۆمەی یەکێکی تر دەکات بۆ پەیمان شکاندن‌و بەدکاری‌و گومانداری . کەسی ئەقڵ نەخۆش ئەڵێ هەموو ئەو کەسانەی لێرەدان شێتن ، ئەبێ لێرە بڕۆم ئەگینا منیش شێت دەبم .

زۆر جار تێبینی ئەو کەسانە دەکرێت کە بە سەختی لە کەسانی تر دەگرن لە هەمان ئەو هەڵانەدا کە خاڵی لاوازی کەسایەتی خۆیانن ، بێ ئەوەی بزانن خۆیان ئەم سیفانەیان هەیە . ئەو کەسانەی هەمیشە گومان لە نیهادی «دوافع» کەسانی تر دەکەن ، عادەتەن خۆیان جێی باوەڕی خۆیان نین . ئەوانەی هەمیشە داخیانە لەدەست هاوڕێیانی چەنەباز ، ئاگایان لە زمانی درێژی خۆیان نییە ، ئەوەی پرۆجێکتەر لە خەڵکیدا «واتە ئەو کەسەی Projection دەکات» دەیبینێ ئاوێنەی خودی خۆیەتی . بە لکاندنی سیفەتە نەویستراوەکانی خۆی بە کەسانی ترەوە ، خۆی لە خۆ لۆمەکردن‌و تاوانباری دەربازدەکات . بە ڕەخنەلێگرتن‌و نارەزایی دەربڕینی لە سیفەتە نەویستراوەکانی «خراپەکانی Undesirable Qualities کەسانی تر ئەو لە بەردەم خۆیدا ئاسوودە دەبێ . بەم جۆرە ئەو خەڵکی تر



به خۆی تاوانبار دەکات . ئەنجامی ئەم میکانیزمە ئەوەیە ئەم کەسانە وا هەست دەکەن کەسانی تر هۆی بەدبەختی ئەوانن ، ئەمەش بە زۆری ئەبێ بەهۆی رەخنەلێ گرتن ، زیاندان ، بێ ئارامی ، رق بە خەیاڵی ناماقووڵ وە گومانو تاوانبارکردنی ناراست . کاتێ پێویستی خۆپاراستن لە پاڵنەرو جووڵێنەری بەرگەنەگیراو زۆر زیاد دەبێ ، ئەمانە ئەشێ بەشێوەی «واهیمە» ، بەتایبەتی واهیمەی چەوسانەوە ، یا هەست کردنی خەیاڵی ، هەلوەسە ، دەربکەوێت «هەلوەسە زۆر جار لە شێوەی دەنگی وادا دەبێ کە ئەوی کە تاوانبار دەکات یا هەرەشەی لێ دەکات» .

**١٥ – گواستنەوە Displacement**

بریتی‌یە لە گواستنەوەی عاتیفە لە شتێك ، هەلوێستێك یا بیرێکەوە بۆ یەکێکی تر . سەرۆك پارەیەکی زۆری لەدەست دەچێ ، توورەیی‌و رقەکەی بەسەر یەکێك لە فەرمانبەرەکانیدا هەڵدەرێژێ . فەرمانبەرەکە کە ناوێرێ رەتی بداتەوەو بەرگری لە خۆی بکات ، بەدرێژایی رۆژ مۆن دەبێ‌و کاتێ دەچێتە ماڵەوە بەتوندی رەخنە لە ژنەکەی دەگرێ‌و کە بۆچی شێو لەسەر مێزەکە ئامادە نیە . ژنەکەی کە بە ئازاری ئەم لۆمە نارەوایەوە ئەتلێتەوە شەپازیللەیەك لە منداڵە پێنج ساڵەکەی دەدات چونکە لە ماڵەکەدا قیژە-قیژی کردووە . منداڵەکەش رادەکاتە دەرەوەو دەرگاکە توند بەیەکا دەدات‌و نووکە شەقێ لە سەگەکەی دەدات کە بەسۆزەوە بەرەو لای رادەکات .

هەندێ جۆری ترسی ناماقووڵ‌و فۆبیا Phobia دیسان گواستنەوەن ، بۆ نموونە ترس‌و رقێکی زۆر لە پشیلە Ailurophobia عادەتەن گواستنەوەی دوژمنایەتی‌و ترسە لە کەسێکەوە بۆ گیانەوەرەکە . لەبەر ئەوەی ئەترسین دوژمنایەتی بە کراوەیی بەرامبەر کەسێك بەکاربهێنین کە ئەتوانێ تۆڵە بسەنێتەوە ، دەچین دوژمنایەتی‌یەکەمان بەسەلامەتی دەگوێزینەوە بۆ پشیلەکە ناتوانێ تۆڵەمان لێ بکاتەوە . گواستنەوەی هەستی قووڵی خۆشەویستی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر پێی دەگوترێ گواستنەوەی ئیجابی Positive Displacement ، ئەگەر عاتیفەکە رق بوو ئەوا پێی دەگوترێن گواستنەوەی نێگەتیف یا سلبی Negative Displacement

**١٦ – هەڵسوکەوتی دووبارە : –**

بریتی‌یە لە هەڵسوکەوتێکی یەك شێوەو دووبارە بۆ دەست بەسەردا گرتنی خود یا دەوروبەر . ئەمە بە فراوانی لە کەسانی ئاساییدا دەبینرێت وەکو عادەت کە هەمیشە بە هەمان شێوە دووبارە دەبنەوە . عادەت پێویستی بریار دەرکردن کەم‌دەکاتەوەو تا رادەیەکیش بەدەست‌هێنانی هەمان ئەنجام دابین‌دەکات . ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە ئەگەر تا رادەیەکی نائاسایی زیاد ببێت ئەبێ بە هەڵسوکەوتی ناچاری Compulsive Behavieor «واتە کاتێ پاڵنەرێکی بەرگری نەکراو بۆ وتنی یا کردنی یا بیرکردنەوە لە ، شتێك رێ لە هەڵسوکەوتە ئاسایی‌یەکانمان دەگرێت» ئەمە ئەشێ کار لە ژیانی کۆمەڵایەتیمان بکات .

هەڵسوکەوتی دووبارە بە ئاسایی لە پێناوی کەم‌کردنەوەی دوودڵی‌دا

کاردەکات بەڵام ئەو دوودڵی یەی هەڵسوکەوتی ناچاری لای دەبات کاتی یە چونکە دوودڵی دیسان دروست دەبێتەوەو هەڵس وکەوتی ناچاری ئەبێ دووبارەو سێ بارە بکرێتەوە .

هەموو شێوەکانی هەڵسوکەوتی ناچاری لەوەدا هاوبەشن کە مەیلێکی بەرگەنەگیراو هەیە بۆ وتنی ، کردنی ، یا بیرکردنەوە لە شتێك کە نەخۆش بە دوولی یەکی زۆرەوە بەرگری دەکات و پاشان خۆی دەدات بەدەستەوە . بەم جۆرە بەشێوەیەکی کاتی لە دوودڵی یەکەی رزگاری دەبێ .

ناچاربوونی ناکۆمەڵایەتی Antisocial Compusions زۆر باون . دزینی ناچاری Kleptomania کاتێ تێ دەگەین ئەگەر بزانین ئەو کەسەی کە شتی وا دەدزێ نەپێویستی یەتی نە زەوقی لێ یەتی ، ناتوانێ خۆی بگرێ و دزی نەکات وە بەمە تەنیا ئاستی دوودڵی یەکەی کەم دەکاتەوە . زوربەی ئاکارە جنسی یە شازەکان لەم جۆرە ناچاری یەن .

هەموو فۆبیاکان هاوبەشن لە هەبوونی ترسێکی زۆر لە کەسێك ، شتێك ، یا هەڵویستێك کە دەردەدارەکە خۆشی ناتوانێ روونی بکاتەوە بۆچی ، کەچی ئەگەر بخرێتە ئەو هەڵویستەوە کە لێ ی . ئەترسێ زەندەقی دەچێ .

**١٧ – ئەو شتانەی واقیع لێل دەکەن .**

ئەمانیش بە ئەنجام میکانیزمی بەرگرین بەکاردەهێنرێن بۆ پاڵپشتی بەسەربردنی ژیان . ئەلکهول و دەرمان بەزۆری بەم رێگەیە بەکاردەهێنرێن . ئەمانە مادەی ژەهرن ئەگەر زۆریان لێ بخورێت هۆشیاری لێل دەکەن و رەخنە لەخۆگرتن کەمدەکەنەوە بە جۆرێك دوودڵی گرژدەکەن . ئەم رێگەیەوە هەستێکی ئاسوودەیی و بروا بەخۆ بوون و دڵنیایی بەرهەمدەهێنن . بەکاریگەری ئەمانە ، کە دوودڵی نەماوە یا بەلای کەمەوە زۆر چۆتە یەك ، دەردەدار چی تر بیرو قسەو کاری رێ ی لێ نەگیراوە ، بۆیە ئەتوانێ هەست و ئارەزووە راستەقینەکانی دەربرێ .

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە هەموومان ، چ منال و چ گەورە ، دوودڵی هەر لە بێشکەوە تا گۆر دوودڵی تەنگی پێ هەڵچنیوین وە شێوەی خۆگونجاندمان بۆ ئەم هەڵویستانە کەسایەتیمان دیاری دەکات .

هەڵسوکەوتەکانمان ، بە دەوری خۆیان ، ئەو خەتانەی پەرەسەندنی کەسایەتیمان ، دەردەخەن کە تیاماندا رووی داوە .

ئەم باسە لە کتێبی Mental Health&Mental Illmess-Philadlphia 1976 وەرگێردراوە .



# کێشەکانی شانۆی کوردی

* لەو چەند ساڵانەی دواییدا ، شانۆی کوردی ، گەشایەوە ، لە قۆناغە تازەکەی خۆیدا ، گەلێ دەنگی نوێو روخساری نوێی هێنایە کایەوە ، کە تەقینەوەو سەرەتایەکی نوێو موژدەیەکی گەورەیان بە تەختەی شانۆی کوردی بەخشی . . رۆژبەرۆژ ، لەگەڵ هەنگاوی نوێ لە بەردەم شانۆی کوردیدا ، گەلێ خۆزگەی نوێو خەونی پیرۆز دێنە پێشەوەو خواستی گەورەتر بەرامبەر بە شانۆی کوردی سەرهەڵئەدات . . «رۆشنبیری نوێ»ش ، لە چوارچێوەی بایەخدانی فراوانتر بە بزووتنەوەی هونەری کوردی ، چەندەها دانیشتنو کۆری دەربارەی چەند مەسەلەیەکی دیاری شانۆی کوردی سازکردو والێرەدا چەند هونەرمەندێکی کورد ، هەریەکە بەپێی باری سەرنجی خۆی ، لە لایەنێکی شانۆی کوردی ئەدوێ . .

* هونەرمەند (سەعدون یونس) دەرچوی پەیمانگای هونەرە جوانەکانەو تائێستا چەندەها شانۆگەری دەرهێناوەو بەشداری لە نواندنی چەندەها شانۆگەریی کردووە . . لێمان پرسی : ئایا شانۆی کوردی دروستبوە ؟ . بەرای تۆ چۆن ئەتوانین لەبەر هەمی کرچو کاڵ رزگاربینو شانۆیەکی زیندوو بێنینەکایەوە کە لەگەڵ ئاواتی مرۆڤی ئەم سەردەمەو خواستە پیرۆزەکانیدا یەکتر بگرنەوە ؟ ! .

+ ئاشکرایە ئێمە لە ساڵێکا چەندەها کاری شانۆیی پێشکەش ئەکەین ، بەڵام ، بەرای من زۆریی ژمارەی شانۆگەریی نوێ مانای ئەوە ناداتە دەستەوە ، کە ئێمە شانۆیەکی تەواومان هەیە . . ماوەی پێشکەشکردنی یەکەم نۆبەرەی شانۆمان خۆی لە (پەنجا ساڵ) تێپەڕ ناکات . . ئەمەش راستەوخۆ ئەوە

دەگەیەنێ کە ئێمە کەلەپووری شانۆی کوردیمان نیە . لە هەمان کات کە قسە دەربارەی شانۆ دەکەین . دەبێ ئەوەمان لەبەرچاوبێ کە رەگەزی بنەرەتی ی لە شانۆدا دیار بکەین . کە بریتین لە دەق شانۆو کۆمەڵانی خەڵك و ئەکتەرو دەرهێنەر .

• باشە بەرای تۆ مەسەلەکە تەنیا لە قات و قری ی دەقەوە سەرهەڵئەدات . . یان شتی ترو . . هی تر ؟ !

تێ‌روانینێك بە شانۆی کوردی . ئەوە ساغ ئەکاتەوە . کە تەقەللایەکی بچووك هەیە بۆ مەسەلەی «دەق» . . بەلام جەماوەری ئەوتۆمان بۆ دروست نەبوە کە کاری داهێنەرانە شێ بکاتەوە لە رووی (بیرو هونەرەوە) . . لەلای تر . ئەکتەری داهێنەرو لێ‌هاتومان بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێ . هەروەها دەرهێنەریش ! .

هەرچەندە من دڵنیام کە ئەم راستی‌یانە ، تاڵن ، بەلام نامەوێ بیان‌شارمەوە

• کەوابێ . بەلای تۆوە . وەك هونەرمەندێك چاری ئەم دیاردانە چۆن ئەبینی ؟ ! . .

+ چاری راستەقینە ئەوانەیە کە باسم کردوون دەبێ بگەرێینەوە بۆ کەلەپوور ، لەوێ‌وە سەرچاوەی راستەقینەو روونی شانۆی کوردی سەر هەڵئەدات و دەبێ بەزووترین کاتیش تەقەللای راستگۆیانە بخەینەکار ، خۆمان لە «خۆویستن» دوور خەینەوە . . ئەدی چۆن ئەتوانین ئیدعای سەرهەڵدانی نوێ بکەین و لە هەمان کاتیش هەریەکە لەلای خۆیەوە واتێ‌بگات کە تەنیا ئەو ئەتوانێ بەتاقی تەنیا شانۆی کوردی دروست بکات ؟ ! .

• هونەرمەند (فتاح خەتاب)یش دەرچوی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە . . لەم ماوەیەدا چەند بەرهەمێکی شانۆیی دەرهێناو بەردەوامە لە تەقەللای خۆی . . ویستمان دەربارەی لایەنێکی وونی شانۆی کوردی قسە بکات کە باسی لێ‌نەکرابێ ئەویش مەسەلەی «شێوازە» . . .

• کاك فتاح ، بەرای تۆ ، تائێستا هونەرمەندی کورد توانیویەتی بەتەواوی مامەڵەی داهێنەرانە لەگەڵ «شێواز»ی دەرهێنان بکات و بیبەستێتەوە بە خۆزگەی بینەرو سەرکەوتن بەرامبەر بەجەماوەر دەست بخات ؟ ! .



+ بەلای من مەبەست لە دەرهێنان شێوازە دەرهێنەری سەرکەوتووش ئەو کەسەیە کە پێڵووی هەردو چاوەکانی بکاتەوە . بۆ ئەوەی باشترین شێوازو نزیکترین شێواز بێنیتەکایەوە ، هەروەکو چۆن دەق شانۆیی فەرزی دەکات بۆ ئەوەی لەو نیگایەوە دنیای خەون و ژانی گەورەی شێواز سەرهەڵبدا . بەلای منەوە ، یەکەم هەنگاو لە هەموو کارێکی شانۆیی‌دا ، مەیسەرنابێ ئەگەر دەرهێنەر ، خۆی ، نەخشەیەکی ووردو فراوانی نەبێ بۆ ئەوەی بێتە بەردی بناغەی کاری درامی .

مەسەلەی «شێوازی دەرهێنان»ی تێدا روون بێتەوە !؟.

+ ئاسانە . شانۆگەری «هەبو ، نەبوو»ت بینی کە «قاسم محمد» دوبارەی کردۆتەوە و بە کوردی پێش کەش کرا . شانۆگەرییەکە «مەکەمی ی» بوو لە رووی نووسین و دەرهێنانەوە . بەلاَم ، شتێکی رێکەوت بو کە لێرە بە شێوەیەکی «ئاوسی ی» بینیمان بە پێچەوانەی رەسەنایەتی خۆی و یەکتر ناگرنەوە . «ووشە» دەبێتە قوربانی دیکۆری رەونەقدارو لە نێوان پرۆجکتۆرە رەنگاورەنگەکاندا دەیەوێ وونمان کات . بە نموونە : کە (بەندە) کە دێتە لای (پاشا) و داوای سەربەستی ی لێ دەکات ، پاشاش بریاری بۆ دەردەکات . لە کاتێکا کە نزیکترین کەس «کچەکە»ی خۆی ئازاد ئەکات و هاوەڵەکانی ئەچەوسێنێتەوە . . نازانین بۆچی دەرهێنەر دەیەوێ «پاشا» بە پیاو چاك نیشان بدات . . لەلایەکی تر وا لە کرێکارێك ئەکات کچی پاشا نەخوازێ و بە مرۆڤێکی گێر مامەڵەی لەگەڵ دەکات و لە ئەنجامدا کۆتاییەکە بە پێچەوانەی کارەکەی «قاسم محمد»ی لێ دێ . ئەبێ مردنی (رەجەب)یش لەیاد نەکەین ، کەوای لە بینەر کرد بگری . . لەگەڵ ئەوەی کە دڵنیاین «مشهد»ەکە بۆ نیشاندانی «حالة» . . نەك فرمێسکی رووت ! ! . .

• «نەرمین ناکام»ی هونەرمەند ، لە ساڵی ١٩٥٨ لە شانۆی کوردیدا دەرکەوت . بەدرێژایی چەند ساڵە وەکو ئافرەتێکی هونەرمەند بەردەوامە . . تۆبڵێی دوای ئەو چەند ساڵە چەندە هەڵوێستی تاڵ و شیرین روو بەرووی بووبێتەوە . . ! بەلاَم ئێمە جارێ لە هیچێك لەوانە ناپرسین و دەمانەوێ بزانین بەرامبەر بەو پرسیارە دەڵێ ی چی : بۆچی ئافرەت ئەوەندە لە نێو ئێمەدا لە تەختەی شانۆ دەترسی و لێ ی بوە بە ئەژدیهاو ناوێرێ توخنی کەوێ ؟ ! .

+ کاکە شێرزاد ببوورە ، لەگەڵ تدایم نانێم بەوەدا کە ئافرەتی کورد روحی لە شانۆ چوە . بەلاَم پیاو ، لە شێوەی خزم و براو کەس و کاردا نایەڵن بەردەوام بێ . . ئەگینا بڕوابکە ئافرەتەکە ، وەك پیاو ، کانیاوی هونەر لە دەروونیا هەڵدەقوڵێ و بەتاسەوەیە لەسەر شانۆ دەرکەوێ و تا دواهەناسە لێ ی جیا نەبێتەوە . بەلاَم ، کۆمەڵ ، خۆی دەیترسێنێ بە هەمو شێوەیەکەوە لەوترسە گەورەی رادەهێنێ . .



• باشە بەرای تۆ ، ئەگەر ئاێستا بینەری کورد دوچاری دەرهێنەرێك نەبووبێ کە «شێوازی تایبەتی» هەبووبێ ، مانای ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە چاو لە کارە ناتەواوەکان بپۆشین ؟ !

- نەخێر . هەقی خۆیەتی چاو لەوانە نەپۆشرێ کە لە ئەنجامی نەزانینی خۆیان بەرامبەر بە شانۆ کاریان کردۆتە سەر داهێنەرانی شانۆی کوردی و بەرهەمەکانیان بەشێوەیەکی «خۆنیشان دان» بوە و ئاستی شانۆیان پوکاندۆتەوە . .

• حەز ئەکەین ، باسی شانۆگەرییەکانت بۆ بکەی ، کە



• «قاسم عزیز»یش وەك ئەکتەر . دەیەوێ ناخی خۆی دەربڕێ . . بەڵام پێش ئەوە . ئێمە خۆمان دەمانەوێ بپرسین : بۆچی ئەکتەری کورد زیاتر لەسەر شانۆ هەوڵ ئەدات «لاسایی» بکاتەوەو ناتوانێ شتێکی نوێ بخاتە سەر توانای هونەریی خۆیو شانۆی کوردی بە گشتیی ؟ .

: بەڵام حەزئەکەم کە باسی شانۆ دەکەین هەمولایەنەکان وەربگرین . بۆ نموونە کە بمانەوێ لە «ئەکتەر» بدوێین ، دەبێ ئەوەمان لەبەرچاوبێ . کە ئەکتەریش وەك شانۆی کوردی لە قۆناغی بنیاتناندایە . جا . ئەگەر بێتو سەراپای مەرجو پێویستی راستەقینە بەسەر ئەکتەری کورد بسەپێنین . دەبینین . زۆربەمان سیفاتی ئەکتەری راستەقینەمان نیەو زۆر بەشمان لە ئەنجامی خودی خۆمانەوەو بەبێ .دەرچون لە هیچ قوتابخانەو پەیمانگایەکی هونەریی دێینە سەرشانۆ . سەرای ئەوە . دەرهێنەرەکانمان کەمتر بایەخ بە مەسەلەی نواندنی ئەکتەر ئەدەنو تائێستا .لە کام تیپی هونەرییدا ستۆدیویەك هەیە بۆ راهێنانی ئەکتەر ؟ . لە کاتێکا کە زۆربەی ئەکتەرەکان «متشنج»نو لە کاتی تواندندا لە «کەسایەتی» دەورەکە ناپێچنەوە . .

• بەڵام کاکە قاسم . ئەوەت لەیادنەچێ . زۆر دەرهێنەر گەلێ کەسانیوا دێنینە سەر تەختەی پیرۆزی شانۆ کە فریان بە نواندن نیە . .

+ ئەمەشوایەو . . دەبێ ئەوانەش کە ئێستا هەن . هەوڵی خۆ دروستبوون بدەنو لە قالبێك نەمێننەوە . چونکە پاشە رۆژی شانۆی کوردی لە چاوی ئەوانو دەستو پەنجەی داهێنانی ئەواندا سەر هەڵئەدات .

• کاك «کەمال عبدالله قادر»یش هونەرمەندێکی ترەو لە «فەقێ ئەحمەدی دارەشانە» و «حەمە وەی وەی» دەورێکی سەرکەوتوو ئەبینی . . لێمان پرسی : بۆچی زوربەی ئەکتەرەکانمان موتالاو خوێندنەوە و تێگەیشتنیان لە مەسەلەی شانۆ سستو کزەو هەندێ بە تەمبەڵی دێنە سەرشانۆو . . کە هاتنە خوارەوە تەواو ! ! .

: بەرایمن مەسەلەکە لەوەدایە کە زۆربەی ئەکتەرەکان لە ئەنجامی رۆشنبیریو خۆشەویستی قوڵیان نەهاتوونەتە سەر شانۆی کوردی . . هەندێ ئارەزووی ساکارانەیان هەیەو . . هەندێکی تر لاساییکردنەوە وەك لەگەڵ کاك قاسم باست کرد . . زۆربەی ئەکتەرەکان بەم حاڵەتە دێنە سەر شانۆ ! ؟

• بەڵام گوناهی بینەری کورد چیە ؟ .

- گوناهەکە لە ئەستۆی ئەوەدایە کە دەرهێنەران رۆڵی خۆیان نابینن . . هەوڵ نادەن هونەر لە ئەکتەر بگەیەننو لیی دەکەن بە قەڵایەکی سەختو بێئەوەی بیر لەوە بکرێتەوە کە ئەگەر هونەرمەند زەمینەیەکی «فیکری» نەبێ . چۆن دەتوانێ دۆستایەتی لەگەڵ هونەردا بکات و بەزدەوامبێ . چونکە مەسەلەی هۆشمەندیی بنەرەتییە . . هونەرمەندیش ناتوانێ رۆڵی خۆی لە گۆرانکاریدا ببینێ ئەگەر بە عەشقێکی گەورە بۆ شانۆ نەسووتێ .

• سوپاس بۆ هەمووتان .



# شانۆگەرییەکی بەناوبانگی شاعیری ئەڵمانی شیللەر

هێمن عبد الکریم محمود
لەعەرەبییەوە وەری گێڕاوە

قەراغە بەرداوییەکەی دەریاچەی «لوسیرن»ە لە سویسرا . . . ڕەشەبایەکی توند بەسەر ئەم ناوچەیەدا هەڵدەکا . . . ڕاوکەرو شوانەکان بەشوێن داڵدەیەکدا دەگەڕێن تا تیایا خۆیان لەو ڕەشەبایە بپارێزن. بۆمجارتن – جووتیارێکە لە دەست پۆلیس ڕایکردووە . چونکە خەزنەداری دەوڵەتی کوشتووە کاتێ



ویستوویەتی دەستدرێژی بکاتە سەر ژنەکەی دێتە ژوورەوە . لە ترس و هیلاکیاندا ڕەنگی پەڕیوە . بە هەناسە برکێوە بە ئامادەبووان دەڵێ : «بە شوێنمەوەن . . یارمەتیم بدەن . . بمپەڕێننەوە بۆ ئەو پەڕی دەریاچەکە» . . . هەموویان بە دڵ بەزەیی‌یان پێدا دێتەوە . بەڵام هیچیان لە ترسی ڕەشەباکە ئامادە نین بیپەڕێننەوە : «سەیری ئەو شەپۆلە کەفاوی‌یانە بکە . زۆر زەحمەتە بە بەلەمێکی بچووك خۆت بخەیتە ئەو گێژاوەوە . هەر هەوڵدانێك لەم ڕووەوە مانای خۆکوشتنە» .

لە کاتێکد بەم جۆرە لێیان دەپارایەوە تا یارمەتی بدەن . ڕاوکەرێکی تر کە ناوی «ولیم تل»ە دێتە ژوورەوەو خۆ خستنە ناو ئەو گێژاوە دەخاتە ئەستۆی خۆی لە پێناوی بۆمجارتن داو بە سەربەرزی‌یەوە دەڵێ : ڕەنگە دەریاچەکە بەزەیی پێدا بێتەوە . بەڵام فەرمانڕەوا بەزەیی پێدا نایەتەوە» .

ئەچنە ناو بەلەمەکەوە . هەر پاش ڕۆیشتنی ئەوان بە ماوەیەکی کەم هەندێ سەرباز بە سواری پەیدادەبن . دەستدەکەن بە ئازاردانی خەڵك و سوتاندنی ماڵەکانیان و تالانکردنیان لە تۆڵەی ئەوەی کە بومجارتن دەربازبووە . . لە کاتێکدا ئەم - لەگەڵ ولیم تل‌دا - بە سەلامەتی دەگەنە ئەوبەری دەریاچەکە .

لە دیمەنی دووەمدا هەندێ بەنا دەبینین کە خەریکی دروستکردنی بەندیخانەیەکی گەورەن لە شێوەی قەڵایەکدا بۆ بەندکردنی ڕۆڵە ئازادی‌خوازەکانی وڵات . بۆمان دەردەکەوێ کە «جسلر» بە چەپۆکێکی ئاسنین فەرمانڕەوایی سویسرا دەکات . زەوی لە جووتیاران زەوت‌دەکات . . . کاتێ نارەزاییش دەردەبڕن ئەیانخاتە بەندیخانەوە . تا وای لێ هاتووە بەندیخانە کۆنەکان جێگای بەندێکی تریان تێدا نابێتەوە . لەبەر ئەوە فەرمانڕەوا بیری لە دروستکردنی بەندیخانەیەکی تازە کردەوە لە «ئەڵتدۆف» تا بەندی‌ی تری تێ باوێ . .

ولیم تل چاوی بڕیوەتە ئەو کرێکارانەی کە خەریکی دروستکردنی «گۆڕستانی سەربەستی» تازەن . وای دێتە پێش‌چاو «هاوڕێکانم . . . ئەوەی دەست دروستی‌بکات . هەر دەستیش دەتوانێ تێکی‌بداتەوە» چونکە زۆرداری ماکی لەناوچوونی خۆی لە خۆیایەتی . دەستەڵات بۆ هیچ ستەمکارێك تا سەر نابێت . تەنانەت ئەگەر یەکێکی وەك «جسلر» یش بێت و وەك ئەویش خۆپەسەند بێت .

بەڵام وا دیارە جسلر ئاگای لەو یاسا

سروشتی‌یە نی‌یە کە «هەموو چەوساندنەوەیەك شۆرشی لە دوایە» . بۆیە فەرمان بە سەربازەکانی دەدات کە کلاوە «بەرێزەکەی» بە داری ئەو ئاڵایەدا هەڵواس کە بەرامبەر بەندیخانە تازەکەیە ، بۆ ئەوەی هەر کەسێك بەمێدا تێپەری کرنووش بۆ کلاوەکەی بەرێت . خۆ ئەگەر نەیکرد ئەوا سزاکەی مردنە .

● بەرامبەر بەم زۆرداری‌یە تازەیە خەڵکی بە نهێنی‌یەوە نارەزایی دەردەبرن ، ئەم نارەزایی‌یەش لە ئەنجامدا لە شێوەی یاخی‌بوونێکی ئاشکرادا سەرهەڵدەدا کاتێ جسلر فەرمانی هەڵکۆڵینی چاوی پیاوێکی پیر دەدات لەبەر هەڵەیەکی بچووك .

بەم جۆرە – ئەرنۆڵد – ی کوری ئەو پیاوە پیرەو دوان لە سەرۆکەکانی جووتیاران کە «ورنر ستوفاشەر» و «والتر فیرست» ن کۆمەڵێکی نهێنی پێك دەهێنن بۆ دژوەستان بەرامبەر بە زۆرداری‌یەکانی جسلر .

ولیم تل کە – زاوای والتر فیرست – ە نایەوێ هاوکاریان لەگەڵدا بکات بە بیانووی ئەوەی کە هەموو کەس پێویستە بۆ هەموو ئیشێك پشت بە خۆی بەستێ . ئەویش کە تەنیا راوکەرێکە بروای بە هێزی کۆمەڵانی نی‌یە . بەڵام پەیمانیان دەداتێ کە پشتیان بەرنەداو هەر کاتێ داوای یارمەتی‌یان لێ کرد بەدەنگیانەوە دەچێ ، «براکانم ئامۆژگاری‌یەکانتان بۆ خۆتانێ . کە رۆژی خۆی هات دەتوانن پشت بەم شان‌و قۆڵە ببەستن» .

سەرۆکەکانی شۆرشگێرەکان دەنگی خەڵکی دەدەن بۆ کۆبوونەوەیەکی گشتی لە دارستانەکەدا لە نیوە شەودا بۆ گفت‌وگۆکردن لەبارەی پلانەکانیان و رێك‌کەوتن لەسەری .

**ستوفاشەر : ئێمە لە پێناوی ژنانماندا دەجەنگین .**

**فیرست : بەڵکو لە پێناوی سەربەستیماندا .**

**ئەرنۆڵد : وە لە پێناوی باوکدا . کە ناتوانێ رۆژی سەربەستی ببینێ** . بەڵام بێ گومان گوێی لە سروودەکەی دەبێ .

● لەم دیمەنەدا خۆمان لە ماڵی بارون «ئەتینگهۆزن» دا دەبینین کە پیرێکی (٨٥) ساڵی خانەدانە بە سۆزەوە لایەنگری کێشەی جووتیارانی دەکرد – بە پێچەوانەی کورە برا میراتە گرەکەی «رۆدینز» کە لایەنگری زۆردارەکان دەکا ، چونکە زریقی‌و باقی دەرباری فەرمانرەوا کوێری کردووە ، و خۆشەویستی‌ی برتائۆف برۆنیك – «کە کچێکی جوانەو پارەیەکی زۆری هەیەو سەر بۆ راسپاردەکانی جسلر شۆردەکا لە رێ لای‌داوە .

**ئەتینجهۆیزن** – رۆدینز لەگەڵ مندا بمێنەرەوە . . لایەنی جووتیارەکانت بگرە . . بەهێزترین پەیوەندی جیهان پەیوەندی ماڵ‌و نیشتمانی بچووکە . تۆ سەر بە جیهانی زۆرداران نی‌ی ، جیهانی ساردی‌و فێزو لەخۆ بایی‌بوون ، بێ گومان وەك غەریبێك دەبی لەنێوانیاندا .

**رۆدینز** : نەخێر مامە . . . ! بەئاگایی وا لە پیاو دەکات کە هەوڵ بدات پایەو رێز لای پیاوە بەهێزەکان بەدەست بێنێ ، ئەمەوێ هەر لە ئێستاوە ئەو تۆوە بروێنم بۆ ئەوەی لە دوا رۆژدا بەرهەمێکی زۆر بدورمەوە .

**ئەتینجهۆیزن** – رۆڵە ئەمە عەقڵە ؟ پایەت لای ستەمکار دەست دەکەوێ ؟ خۆراکیان لێ‌دەستێنێ ، خوێنیان دەمژێ بۆ خۆراکی جەنگەکانی .

**رۆدینز** – ئێمەی رەش‌و رووت دژی ئەو هێزە گەورەیە چیمان لەدەست دێ .

**ئەتینجهۆیزن** – وا دیارە میللەتەکەی خۆت ناناسی ! . . . گەلێکن بە سەربەستی لەدایك‌بوون ، و لە پێناوی سەربەستیشیاندا ئەجەنگن ، رۆدینز جێمان مەهێڵە . . پێویستمان بە بازووی بەهێز هەیە .

**رۆدینز – بەڵام من بەستراومەتەوە . . بەڵێنم داوە .**

**ئەتینجهۆیزن – ئم . . م . . م . . . تۆ بە تۆری ئاوریشمینی خۆشەویستی بەستراویتەوە ! کورم خۆت دەستخەرۆ مەکە ئەو کچەت بۆ دەکەن بە چەشە :**

**بەڵام رۆدینز گوێ لە ئامۆژگاری‌یەکانی مامی ناگرێ‌و . بەڵکو دەچێت پاڵ بە داوو دەزگای جسلرەوە بداتەوە . . ئەتینجهۆیزن بە داخەوە چاوی تێ‌دەبرێ و لەژێر لێوەوە دەڵێ «ئەو نەزانە هەڵەشەیە رۆیشت . لەوانەیە ئەو لاوانە بریقەی هێز هەڵیان دەخەڵەتێنێ دوای بکەون . . . ئای ئەو مرۆڤە چەند بەختیارە کە لەپێش ئەوەی سەرکەوتنی زۆرداران ببینێ دەمرێت .**

● **بەڵام لەم دیمەنەدا . جسلرو دەستو پێوەندەکانی بۆ راو چوونەتە دارستانەکە . لە کاتێکدا کە رۆدینزو برتای خۆشەویستی خۆیان بر داوە .**

**رۆدینز** – لەناو ئەو هەموو سوارچاکانەدا من کێم هەتا بەتەمای خۆشەویستی تۆ بم ؟ ! . . . ئەوان خاوەنی ناوبانگ‌و سامان‌و گەلێ شتی ترن . کەچی من هیچ شك نابەم پێشکەشتی بکەم تەنیا دڵێکی پر لە دڵسۆزی نەبێ .

**برتا** – بەراستتە . . . ! ! تۆ گەلەکەی خۆتت بۆ تەنیا بزەیەکی زۆردارێك فرۆشت ! !

**برتا** – بەڵکو بەزەیم پێتدا دێتەوە . . ئەگەر بمتوانیایە پیاوەتی لە دەروونتدا هوشیار بکەمەوە دەمتوانی خۆشم بووێیت !

**ڕۆدینز** – ئای . . ی . . ی برتا ، لە بجەنگی ، ئەو کاتە ئەتوانی خۆشەویستی من بەدەست بێنی ! تەنیا دوژمنێکە دڵی هەموومانی پڕکردووە لە ترس و تۆقین ، بەڵام ئەو زەبرەی یەکێکما ڕزگار دەکا هەمووومان ڕزگار دەکا !

● لە بەشی سێهەمدا ولیم تل دەبینین خەریکی هاتنە دەرەوەیە لە ماڵەوە



بۆ سەردانی – والتر فیرست –ی خەزووی ژنەکەی لێ‌ی دەپارێتەوە کە لە ماڵەوە بمێنێتەوە نەوەکو تووشی بەڵایەك ببێت بەهۆی ئەو پشێوی‌یەی وولاتی گرتۆتەوە .

**ژنی تل** – تۆ گوێ بە هیچ نادەی ! ! بە ناوجەرگەی ئەو شەپۆلە کەفاوی‌یانە دا بۆ ڕزگارتنی پیاو کوژ دەپەڕێنیتەوە ، ئایا لەو کاتەدا بیرت لە ژن و منداڵەکانت نەکردەوە ؟

**تل** – بەڵێ ! بیرم لێ کردبوونەوە ، هەر لەبەر ئەوەش پەڕاندمەوە ، ویستم باوکێك لە پێناوی منداڵەکانی ڕزگار بکەم .

**ژنەکەی – بەڵام فەرمانڕەوا زۆردارێکی دڵ ڕەقە .**

**تل** – بۆ من نەهاتووە لە فەرمانڕەوا بترسم ! پێناوی خۆشەویستی تۆدا لە هیچ کارێك ناپونگێمەوە .

**برتا** – کەواتە پەیمانم بدەرێ کە ببیتە ئەو پیاوەی پێویستە ببیت . . گەلەکەت ڕزگاربکەی . لە پێناوی نیشتمانەکەتدا

**ڕۆدینز** – تێت ناگەم ! ! ئەی تۆش یەکێك نیت لە هاوڕێیانی جسلر ؟ !

**برتا** – من قینم لە جسلەرە . . . ، لەناو هاوولاتی‌یە ئازاردراوەکانت دڵم خوێنی لێ دەچۆڕێ ، ئەوان هەرچەندە دڵ نەرمن ، بەڵام زۆریش بەهێزن .

**ڕۆدینز** – برتا . . ، ڕقت لێمە ؟ ! !

دڵنیام لەوەی ئازارم پێ ناگەیەنێ ،
**ژنەکەی** – دڵنیای لەوەی دەیڵێیت ؟
**تل** – بەڵێ ماوەیەك لەمەو بەر لە گەرووێەکی تەنگەبەری شاخاوی رووبەڕوو تووشی هاتم ، کە چاوی پێم کەوت ، بیری کەوتەوە کە من ئەو کەسەم کە دەبێ جەزایەکی زۆر گەورەم لێ بستێنێ چونکە هەڵەیەکی بچووکم کردبوو . ڕەنگی هەڵبزرکا . . لای وابوو کە دەست بەجێ دەیکوژم ، بەڵام بەزەییم پێیدا هاتەوەو وازم لێ هێنا بەرێی خۆیدا بڕوات .

سەرەڕای قسەکانی (تل) ، ژنەکەی هێشتا دڵنیا نی یەو سوورە لەسەر ئەوەی کە بمێنێتەوە ، ئەویش بە کەللە ڕەقی یەوە وەڵامی دەداتەوە : –

**تل** – پەیمانم داوە کە بچم .
**والتر** – «کە یەکێکە لە کورەکانی» – لەگەڵیا دەچم !
**ژنی تل** – دایکت جێ دێڵێ ! ؟
**والتر** – دڵنیا بە شتی جوانت لەلای باپیرم بۆ دێنم .

ولیم تل تیرو کەوانەکەی هەڵدەگرێت‌و لەگەڵ کورەکەی‌داو لە ماڵەوە دەردەکەون ، ژنەکەی هەر دڵی لایانەو هەست بە دڵتەنگی یەکی زۆر دەکات .

تل‌و کورەکەی بەو شوێنەدا تێ‌دەپەڕن کە کڵاوەکەی فەرمانڕەوای تێدا هەڵواسراوە ، والتر سەرنجی باوکی بەلای کڵاوەکەدا ڕادەکێشێ‌و دەڵێ :

**والتر** – سەیر کە باوکە . . سەیری ئەو کڵاوەی بکە کە لەوێدا هەڵواسراوە .
**تل** – چیمانە بەسەریەوە ، بارێگای خۆمان بگرینە بەر .
**پاسەوانی یەکەم** – بوەستە ! بەناوی ئیمپراتۆرەوە دەتگرم چونکە نەتویست کڕنووش بۆ کڵاوەکەی فەرمانڕەوا بەریت . چەند کەسێك بۆ یارمەتی دانی تل دێن . . . . لەم کاتەدا گوێیان لە دەنگی شەیپوور دەبێ .
**پاسەوانی دووەم** – فەرمانڕەوا .
**پاسەوانی یەکەم** – یاخی بوون ! شۆڕش ! فریامان کەون ! .

جسلر بە سواری دەردەکەوێ‌و تابوورێك لە دەست‌و پێوەندەکانی – کە رۆدینزو برتاشیان لەگەڵدایە – بەدوایەوەن

**جسلەر** – کێ‌یە داوای فریاکەوتن دەکات ؟
**پاسەوانی یەکەم** – گەورەم . . ئەم پیاوە نایەوێ کڕنووش بۆ کڵاوی بەرێزتان بەرێت
**جسلەر** (ڕوو دەکاتە تل) – چی دەڵێی بۆ بەرگری‌کردن لە خۆت ؟
**تل** – لێم ببوورە گەورەم . . . نەمزانی .
**جسلەر** – بیستوومە تیر هاوێژێکی دەست‌ڕاستی ! !
**والتر** – بەڵێ گەورەم . . باوکم لە دووری دە یاردەوە سێوێك دەپێکێ .
**جسلەر** «ڕوو دەکاتە تل» – ئەمە کوڕتە ؟
**تل** – بەڵێ گەورەم .
**جسلەر** – باشە ئێستا دەست‌ڕاستی خۆتمان بۆ دەسەلمێنی ، نیشان لە سێوێك بگرەوە کە لەسەر سەری کورەکەت دادەنرێ ، ئەگەر نەتپێکا دەتکوژم .

دەنگی نارەزایی لە لایەن ئامادەبوانەوە بەرزدەبێتەوە . تل بە چۆکا دێت‌و لە **جسلەر** دەپاڕێتەوە تا لە فەرمانە درندانەیی یەکەی پەشیمان ببێتەوەو ژیانی کورەکەی نەخاتە مەترسی یەوە ، و سنگ ڕووت دەکاتەوە وەك بەڵگەیەك بۆ خۆبەبەخت‌کردن لە پێناوی کورەکەی‌دا ، بەڵام جسلەر لە قاقای پێکەنین دەداو دەڵێ : – «ژیانی خۆتم ناوێ : – بەڵکو تیرەکەت بەڵگەی دەست ڕاستیت .
**والتر** – بابە تیرەکەت بهاوە . . مەترسە ! پەیمانت دەدەمێ کە بوەستم‌و نەجووڵێم .

لێرەدا دوو تیر دەردێنێ‌و دەیانخاتە بەر پشتێنەکەی ، بەڵام ئەم کردارەی تل چاوە بزەکانی جسلەر بەرەو خۆی ڕادەکێشێ . لەم کاتەدا رۆدینز لە فەرمانڕەوا دێتە پێشەوەو دەڵێ .

**رۆدینز** – گەورەم . . گاڵتەت لە ڕادە بەدەر بردۆتە دەر . .
**جسلەر** – ئەم ئازایەتی یە لەپڕەت لە کوێ هێنا ؟ !
**رۆدینز** – زۆر دەمێکە هەڵس‌و کەوتە ستەمکاری یەکانت سەرنجیان ڕاکێشاوم ، بەڵام خۆم بێ‌دەنگ کردبوو ، بێ‌دەنگی لەمە زیاتر خیانەتە بۆ نیشتمانەکەم .
**جسلەر** – چی . . . ! ؟ بەم جۆرە لەگەڵ گەورەتدا گفتوگۆ دەکەی ؟
**رۆدینز** – بێجگە لە ئیمپراتۆر گەورەی ترم نی یە . . .

لەم کاتەدا ولیم تل تیرەکەی دەهاوێ‌ت‌و سێوەکە دەکا بە دوو کەرتەوە ، والتر بە شانازی یەوە هاوار دەکات : «بابە ها ئەوە سێوەکە ، دڵنیا بووم لەوەی نامپێکی . بەڵام تل بە چۆکا دێت‌و لە خۆشیانا باوش دەکا بە کورەکەی‌دا .

**جسلەر** – تل . . . قسەیەکم هەیە . . بینیم تیرێکی تریشت خستە بەر پشتێنەکەتەوە . . بۆ وات کرد ؟

تل «بێ پەروا چاوی دەبڕێتە فەرمانڕەوا» – ئەگەر تیری یەکەم بەر

جگەرگۆشەکەم بکەوتایە . دووەم تیرم دڵی دەپێکا .

تل دەگرن‌و دەستی دەبەستنەوە بۆ ئەوەی سواری بەلەمێکی بکەن بەرەو بەندیخانەی «کوسناخت» ی ساماناك ببەن . خەڵکی «دەوری ئەو پاڵەوانە دەدەن» – دڵیان لەگەڵتایە .

**تل** – خوا حافیز

**والتر** – ئوف . . باوکە . . باوکە . . باوکی خۆشەویستم .

**ستوفاشر** راسپاردەیەکت بۆ ژنەکەت نی یە ؟

**تل** «کورەکەی بە سنگی‌یەوە دەنووسێنیّ» – پیّ بڵێن کورەکە ساغ‌و سەلامەتە ، بەڵام من خوا ئاگای لێم دەبیّ . . .

لە کورەکەی دوور دەکەوێتەوەو دوای سەربازەکان دەکەویّ .

● لەم دیمەنەدا بۆمان دەردەکەوی کە تل توانیویەتی لە دەست سەربازەکان رابکات‌و لە کاتی دەست‌پیّ‌کردنی گەرداوێکدا . دەبینین کە چیرۆکی راکردنی بۆ ماسی گرێکی هاوڕیّی دەگێڕێتەوە – «ئەیانویست بمبەن بۆ بەندیخانەی «کوسناخت» . کاتیّ گەرداوەکە هەڵی‌کردو دەستیان کردمەوە . چونکە من تەنیا کەس بووم کە بتوانم بەلەمەکە لیّ‌بخورم بەناو ئەو شەپۆلە توورانەدا . منیش رووی بەلەمەکەم کردە نزیك‌ترین ووشکایی کە لێیانەوە دیاربوو . کاتیّ کە نزیك بووینەوە لە ووشکایی‌یەکە خۆم فریّ‌داو بە قاچیش پاڵم بە بەلەمەکەوە نا بۆ ناو دەریاو بەزەیی شەپۆلەکان .

**ماسی گر – ئێستا بەتەمای چیت ؟**

**تل** – ئێستا بەتەمای کردارێکم کە لەسەر دەمی هەموو کەسیّ بیّت .

● لەم دیمەنەدا . . دەردەکەویّ کە ئەتینجهۆیزن لە گیاندان دایە ، چەند جووتیارێك دەوری پێخەفەکەیان داوە . «سەردەمی دەرەبەگان بەسەر چوون ، گەل جێگایانی گرتەوە ، سەربەستی ئاڵا سەرکەوتووەکەی دەردەخات ، براینە خۆگر بن . . یەك بن» وە دوا هەناسەی دەدات .

کاتیّ رۆدینز دەگات بەو نیازەی بە مامی رابگەیەنیّ کە هاتۆتە ریزی ئەوانەوە ، بەڵام درەنگ دەگات . وکە دەبینیّ مردووە ، بە جووتیارەکان رادەگەیەنیّ کە ئیتر لەگەڵ ئەواندا دەجەنگیّ‌و پشتیان بەرنادا ، ئێستا ئامانجێکی تایبەتی‌ی هەیە لە جەنگیندا ، چونکە دەست‌و پێوەندەکانی فەرمانرەوا برتای خۆشەویستیان فڕاندووەو بردویانەتە شوێنێکی نەزانراو .

ئەرنۆڵد «کوری ئەو پیاوە پیرەی کە فەرمانرەوا چاوی هەڵکۆڵی» – تۆ سەرکردەمان بە . .

**رۆدینز** – جاریّ خۆتان چەکدار کەن . . چاوەریّی ئەو نیشانەیە بن کە بە ئاگر لەسەر لوتکەی شاخەکە پیشانتانی دەدەم ، کە بینیتان پێویستە خۆتان ئامادە کردبیّ بۆ هەڵمەت بردنە سەر دوژمنی زۆردار ئەوساش بیّ گومان سەرکەوتن هەر بۆ ئێمە دەبیّ .

● ولیم تل کەوانەکەی دەکاتە شان‌و تیرەکانی بە دەستی‌یەوە دەگریّ‌و لەسەر دوندی شاخێکەوە کە دەڕوانێتە ئەو ڕێگایەی جسلەر پێیدا دەڕوات بۆ بەندیخانەی کوسناخت دادەنیشێت . ڕێبوار زۆرن لەو ڕێگایەدا لە ڕاوکەرو ، جووتیارو ، دەرۆزەکەرو کەژاوەی دوو بووك ، جسلەرو دەست‌و پێوەندەکانی دەردەکەون ، ژنێکی جووتیار کە ناوی «ئەرمجارت» ە لەگەڵ حەوت منداڵی ڕێگای پیّ گرتووە .

**ئەرمجارت** – بەزەیی گەورەم . . لێیان ببوورە .

**جسلەر – لەسەر ڕێم لاچۆ ، بێلە تێپەرم .**

**ئەرمجارت** – مێردەکەم خراوەتە بەندیخانە ، منداڵەکانم لە برسا ئەتلێنەوە ، بەزەییت پێیان بێتەوەو باوکیان بەربدە .

**جسلەر** – بچۆرە قەراغ ڕێگاکە کچیّ . . ئەگینا وەڵڵاهی ئەتخەمە ژێر سمی ئەسپەکەمەوە .

**ئەرمجارت** – با ئەسپەکەت لاشەکانمان پشێلێ .

منداڵەکانی لەسەر ڕێگاکە پاڵ دەخات‌و خۆشی بە تەنیشتیانەوە پاڵ‌دەکەویّ .

**جسلەر** فەرمانرەوایەکی دڵ نەرم‌و خاوەن بەزەیی بووم لەگەڵ ئەم گەلەدا . . . بەڵام لەم کاتەوە بەدواوە زۆر دەگۆڕڕێم . یاسایەکی نویّ دەردەکەم کە . .

لەم کاتەدا تیرێك سنگی دەپێکیّ‌و نووکەکەی لە پشتیەوە دەردەچیّ ، دەستی دەخاتە سەر دڵی‌و بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە دەڵیّ : «ئەمە ئیشی (ولیم تل)ە» .

**ئەرمجارتە** – مرد . . مرد . . ئەوا لەسەر ئەسپەکەی دەکەوێتە خواریّ ! !

**جسلەر** – خوایە . . بەزەییت پێما بێتەوە . .

**ئەرمجارتە** – منداڵینە سەیرکەن . . زۆرداران ئاوا دەمرن .

● **رۆدینز** لەسەر لوتکەی شاخەکان ئاگر دەکاتەوە کە نیشانەی شەڕ

دەست‌پێ‌کردنە . جووتیارە چەکدارەکان هێرش دەبەن بۆ زۆرداران بۆ گرتنی ئازادیخوازان دروستیان کردبوو ، و لە یەکێك لەو قەڵایانە «برتا» دەدۆزنەوەو ڕزگاری دەکەن لە کاتێکدا لایەکی قەڵاکە ئاگری گرتبووو خەریك بوو برمێ بەسەریدا . هەر لەم کاتەشدا بلاودەبێتەوە کە ئیمپراتۆر کوژراوە .

**فیرست** – ئیمپراتۆر ! ! . . پێویستی بەوە نەدەکرد . .

خەباتی ئێمە دژی فەرمانڕەوا بوو نەك ئیمپراتۆر . . ئەبێ کێ بێ توانیبێتی ئەم تاوانەی کردبێ ؟ !

جووتیارێك : برازاکەی . . . ئا ئا برازاکەی ! !

**فیرست** – بەڵام . . بۆ ؟

جوتیارەکە - بۆ ئەوەی شوێنی بگرێتەوە !

**فیرست** - ئەم کارە هیچ پەیوەندی‌یەکی نی‌یە بە خەباتی ئێمەوە چونکە خەباتی ئێمە لە پێناوی سەربەستی‌دایە . ئەو پیاوەی ئێمە قەرزارین تەنیا «ولیم تل»ە .

**جووتیارەکە** – ولیَم تل . . ! ! با بچینە لای لە ماڵەوەو سلاوی پێ بگەیەنین چونکە ڕزگارکەری نیشتمانەکەمانە .

● لەم دیمەنەدا خۆمان لە کوختەکەی ولیم تل دەبینین ژنەکەی‌و دوو منداڵەکەی دانیشتوون .

**ژنی ولیم تل** - رۆڵە خۆشەویستەکانم . ئەمڕۆ باوکتان دەگەڕێتەوە . . نیشتمانەکەمان قەرزارێتی .

**والتر** – دایە گیان منیش لەم تێکۆشانەدا هاوبەشیم کرد .

دایکی ماچی دەکات . لەو کاتەدا قەشەیەك لە بەردەمی دەرگای کوختەکەدا دەردەکەوێ کە نیشانەی برسێتی‌و ماندوویی لە دەم‌و چاوی‌دا دیاری دەدات

کوڕ – فەرموو ئەی باوکی پیرۆزمان . . . دایکم نانت دەداتێ .

قەشەکە «ڕوو دەکاتە ژنی ولیم تل» بە تەنیایت ؟ کوا مێردەکەت ؟

**ژنی تل** – هەموو کات چاوەڕێ‌ی گەڕانەوەیم . . . بەڵام گەورەم چیتە ؟ . . لە سەیرکردنتا شەڕ دەبارێت ! ! دەست مەدە لە جلەکانم . .

**والتر** «هەڵدەستێتە سەر پێ» دایکە . . . ئەمە باوکم گەڕایەوە کوڕی دووەم (لە دەرەوە پێ‌ی دەگات» : باوکە ولیم تەل‌و رووکورەکەی کە بەرەوپیری جوونە دەرەوە دێنە ژوورەوە . . .

هەر کە ژنەکەی چاوی پێ دەکەوێ لە خۆشیانا چاوی پردەبێ لە ئاو بەڵام لەم کاتەدا قەشەکە پرسیارێکی لێ‌دەکات قەشەکە – تورتەل ی ؟ بۆئەو پاڵەوانەتە کەفەزمان ڕەوای کوشت . گەلەکەی ڕزگارکرد ؟

**تل** بەڵێ من ئەوم . . ئەم ڕاستی‌یەش لە کەس ناشارمەوە

**قەشە** منیش دوژمنێکم لەناو برد «ئیمپراتۆر»

**تلّ** – تۆ . . . ! ! دۆق ئەستریا . . . ئەوەی کە مامی کوشت هێشتاش هەر زیندووی ؟ ! !

کوشتن بۆ سوودی خۆی زۆر جیاوازە وەك لە کوشتن بۆ سوودی گشتی‌و لە پێناوی سەربەستی‌دا . . . لەگەڵ ئەمەش دا «تل» بەزەیی بە دۆق ئەستریادا دێتەوەو ئەو ڕێگەیەی پێ دەڵێ کە پیایا بە سەلامەتی دەرباز بی‌و لە سنوور بچێتە دەرەوە . . ئینجا ڕوو دەکاتە ژنەکەی – کە تا ئێستاش نازانێ ئەم قەشەیە لە ڕاستی‌دا کێ‌یەو چ کارەیە : – شتێ بدە بەم پیاوە هەژارە با بیخوا چونکە ڕێگایەکی دوورو درێژو سەختی لەبەردەمە . پاشان رووی خۆشت وەرگێڕەو پشتی تێ بکە با نەزانی چ ڕێگایەك دەگرێ‌و بۆ کوێ دەچێ» .

لەم کاتەدا جەماوەرێکی زۆر بەرەو کوختەکەی ولیم تل دێن‌و دەشت‌و دەر پردەکەن . . وە رۆدینزو برتاش لەناو ئەم جەماوەرەدا وەستاون .

**جەماوەر** بژی ولیم تل . . . قەڵفان‌و ڕزگارکەرمان .

**برتا** ئەی هاوولاتیان . . . هاوڕێ‌یان . . . بە ئەندامێکم قبووڵ بکەن لە کۆمەڵەی ئازادیخوازاندا .

**جەماوەر** – بەخێر بێ‌ی . . . بەخێر بێ‌ی . . . قبووڵمان کردی .

**برتا** – ئێستاش پڕ بە دڵ دەستی خۆم دەنێمە ناو دەستی رۆدینز .

**رۆدینز** - منیش لە ئێستاوە هەموو کۆیلەکانم ئازاد دەکەم «پەردە» .



# بەرەوپێشکەوتن

## زیانی جگەرەکێشان تەنیا بە نەخۆشی ی دڵو شیرپەنجەوە ڕاناوەستێت

ئەمفیزیما نەخۆشی ی نالەبارە تووشی قورگو سی و دڵ دەبێتو . . نەخۆشی یەکی پڕ مەترسی یەو دەبێتە هۆی مردن ئەگەر هەوکردنی قورگی لە گەڵدابوو . . زۆر جاریش لە گەڵیدا دەبێت .

ئەم نەخۆشی یە بووەتە هۆی مردنی ٣٥ هەزار کەس بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نزیکەی ٣٠ هەزار کەس بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ، ئەمە تەنیا لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لە ساڵی ڕابوردوودا .

ناوی ئەم نەخۆشی یە کریگی ی کۆنەو واتای ئاوسان یان گەورەبوون دەگەیەنێت ئەمەیش لەگەڵ ناوە پزیشکی یەکەیدا یەك دەگرنەوە .

چونکە ئاوسانی سینگو باکردنی هەردوو سی لە نیشانەکانی ئەمفیزیمان لەگەڵ تەنگە نەفەسی دا . . هۆی ئەم نەخۆشی یەیش هەندێك جار لە باوكو دایکەوە بۆ نەوەکانیان دەمێنێتەوە . . تاکو لەم دوایی یەدا دەرکەوت کە جگەرەکێشان یەکێکە لە هۆیەکانی سەرهەڵدانی ئەم نەخۆشی یەو هەموو جگەرەکێشێك تووشی نیشانەکانی ئەمفیزیما دەبێت .

## سیر زۆرجار شوێنی پەنسەلینو دەرمانی تر دەگرێتەوە

هەر لە زۆر کۆنەوە خەڵکی سیریان ناسیوەو خواردوویانە . . ئەمە بە ڕێژەی بابلی یەکانەوە ڕاستەکە بەڵگەی ئەوە دۆزراوەتەوە پێش شەش هەزار ساڵی لەمەوبەر سیریان خواردووە ، هەروەها ئەوانەی ئەهرامیان دروست کردووە کە پێش ٥٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر سیریان بە باشترین خواردن داناوە . . هەروەها خەڵکی هندستانو چین بەر لە دوو هەزار ساڵ زیاتر سیفاتی باشی سیریان بۆ دەرکەوتووە .

پزیشکایەتی نوێیش سیفاتی چارەسەری سیرو قازانجەکانیان پشت گوێ نەخستووە . . لە وانەیش کە سیر میکرۆب دەکوژێتو سیر کراوەتە دەرزی و بە ناوی (لیسین) بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەکاردەهێنرێت ، بەڵام پزیشكو زانایانی چین لەم ساڵانەی دوایی یەدا بایەخێکی گەورەیان بە سیر داوە .

تیپێك لەو پزیشکانە لێکۆڵینەوەو تاقی‌کردنەوەیان لە سەر چارەسەری یەکانی سیرو توانای چارەسەرکردنی هەوکردن ئەنجامداوە .

بۆیان دەرکەوتووە کە بەکارهێنانی سیر بۆ ئەو کەسانەی

تووشی نەخۆشیی (سەحایا) دەبن ، چاکیان دەکاتەوەو وەکوو جارانیان لێدێتەوە ، ئەم بەکارهێنانەیش بە هۆی خواردنی سیرەوە دەبێت یان بە هۆی شرینقەوە .

## یەخچاڵێك بەبێ کارەبا ئیش دەکاتو دەگوێزرێتەوە

لەم دواییەدا یەخچاڵێکیان دروست کردووە ، بێ کارەبا ئیش دەکاتو بۆ سەیرانو سەفەرکردن باشە چونکە بە دەست هەڵدەگیرێت ، ئەم یەخچاڵە نوێیە بچووکە قەوارەکەی ١٧٥ ئینجی سێ جایەو ، لە مادەی پلاستیك دروست کراوە کە ساردی ناداتە دەرەوەو گەرمیش ناداتە ناوەوە بەم چەشنە ساردیی ئەو خواردەمەنیو خواردنەوانە بۆ ماوەیەکی درێژ دەپارێزێت . لە هەمووی گرنگ تریش ئەو سنووقی فرێزەرەیە لە ناو یەخچاڵەکەدایە . ئەم سنووقە (بەفری شین)ی تێدایە کە کەرەستەیەکی ساردکەرەوەیە وەکوو بەفری لێدێتو دەوروبەری خۆی سارد دەکاتو ئەم بەفرە دەستکردە بە ساردیو ووشکی ماوەی رۆژێکی تەواو دەمێنێتەوە .

داهێنانی نوێ

## گڵۆپی کارەبایی : زۆر هەڵ دەکاتو کەمیش سەرف دەکات

لە سەرەتای ساڵی (١٩٨١)ەوە گڵۆپی کارەبایی نوێ دەکەوێتە بازارەوەو شوێنی گڵۆپە کۆنەکان دەگرێتەوە . . ئەو گڵۆچانەیش چلو شەستو هەفتاو پێنجو سەد واتین . . ئەم گڵۆپە نوێیانە تەنیا ٧٠٪ی ئەو کارەبایە سەرف دەکەن کە گڵۆپی ئاسایی سەرفی دەکەن و ئەم گڵۆپە نوێیانە بەردەوام حەفت هەزارو پێنج سەد سەعات ئیش دەکەن ئەگەر لەگەڵ ئەو گڵۆپانەدا بەراوورد بکرێن کە ئێستا بەکاردەهێنرێن . . نرخیشیان لە نێوان دە تا دوازدە دۆلاردایە .

## کارتێکردنی داوو دەرمان لە مرۆڤو لە نەخۆشیی پیس

زانایانی پزیشکی لە کۆبوونەوەیەکدا کە لەم دواییانەدا لە شاری (کان)ی فەرەنسایی سازیان دا لە تەنگو چەڵەمەی داوودەرمانی نوێو کارتێکردنی لە ئادەمیزاد کۆڵانەوە سەرەرای هیوای نوێی چارەسەرکردنی هەندێك نەخۆشی ترسناك وەکوو شێرپەنجەو نەخۆشی پیرێتیو نەخۆشییەکانی دڵ .

رەنجەکانی ئێستایش بۆ زانینی ئەو تێکچوونانەیە کە دەبنە هۆی نەخۆشی لە شانەکانی لەشی مرۆڤدا ئەنجا دۆزینەوەی ئەو دەرمانە کە دەتوانێت لەسەرەتاو سەرکۆنی بکات سەرەرای ئەوەیش کە هەوڵی ئەوە دەدەن چەند دەرمانێکی ئارامهێنەر دروستبکەن کە کارتێکردنی لاوەکییان هەیە .

بەرهەمی نوێ لە کتێبخانەی کوردیدا

## ● دوو سروودی کێوبی ●

پێنجەمین کۆمەڵە شیعری کاك شێرکۆ بێ کەس لە ژێر ناونیشانی (دوو سروودی کێوبی) و قەوارەی (١٥ سم×٢١ سم) و لە بەرگێکی قەشەنگدا کە هونەرمەند (عەلی مەندلاوی) کێشاویەتی ، کەوتە بازاری چاپەمەنیی کوردییەوە ، ئەم کۆمەڵە هۆنراوەی کاك شێرکۆ بریتییە لە دووهۆنراوی درێژ، یەکەمیان لەژێر ناونیشانی (کۆچ) دا کە (٥٧) لاپەرەی دیوانەکەیەو لە ساڵی ١٩٧٥ دا نووسراوەو ئەوی تریان لەژێر ناونیشانی (برایمۆکو گۆرانی بەفرومنداڵیم ، دایە کە (١٥) لاپەرەیەو لە ساڵی ١٩٧٦ – ١٩٧٩ دانووسراوەو لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی (الطليعة) یە لە کەرکووکو لە چاپخانەی (الأديب) لەچاپ دراوە .

شایانی باسیشە کۆمەڵە شیعرییەکانی شێرکۆبێکەس کە لەمەوپێش دەرچوون ئەمانەی خوارەوەن :

تریفەی هەڵبەست ، کەژاوەی گریان ، من تینوێتیم بە

گرنەشکێ ، کازیوە ، سەرەڕای کاوەی ئاسنگەر کە شانۆگەری‌یەکی شیعری‌یە .

## ● ژیلەمۆی ڕاز ●

لە بلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی دووەمین کۆمەڵە شیعری شاعیری لاو کاك مکرم رشید تاڵەبانی لە ژێر ناونیشانی (ژیلەمۆی‌ڕاز)دا کەوتەبازارەوە .

دیوانەکە بریتی‌یە لە چل‌وچوار هۆنراوەی کورت‌و مام ناوەندی‌و درێژ سەرەڕای هەندێك چوارین کە لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٤ تاکوو ساڵی ١٩٨٧ نووسراون‌و لە ٢٣٢ لاپەڕەی ١٤ سم×٢١ سم دان‌و بە بەرگێکی قەشەنگ‌و چاپێکی جوان لە چاپخانەی (دار الحرية) لە چاپ دراوە .

## ● تۆ لەنێوان کۆچی شەووماچی ڕۆژدا ●

لە بلاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی سێیەمین دیوانی کاك عبد الله عباس کەوتە بازارەوە .

ئەم دیوانەی کاك عبد الله عباس چواردە هۆنراوەی تێدایەو لە ٧٨ لاپەڕەی قەوارە گەورەدایە . . شایانی باسیشە هۆنراوەکان هی ئەم ساڵانی دوایی‌یەن تاکۆتایی ساڵی ١٩٧٨ ، لە چاپخانەی (عەلاء) لەبەغدا لەچاپ دراوە .

## ● دیوانی‌خادیم . . بەشی‌یەکەم ●

لەم دوایی‌یەدا بەرگی یەکەمی «دیوانی خادیم» کە جەمال محمد محمد أمین ئامادەی کردووەو ساغی کردووەتەوەو لە قەوارەی گەورەی ١٧×٢٤ سم و لە ٣٧٦ لاپەڕەدایە کەوتە بازارەوەو لەلایەن دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌یەوە لەچاپ‌دراوە .

ئەم بەرگەی دیوانی خادیم بریتی‌یە لە پێشەکی‌یەك سەبارەت چۆنەتی لەچاپدانی ئەم دیوانەو ژیان‌و سەرگوزەشتەی حاجی میرزا عەبدوڵلای خادیم ، ئەنجا هۆنراوەکانی کە بەپی‌ی پیتی هەجا ڕیز کراون ، پاشان لەکۆتایی‌دا فەرهەنگێکی بۆ ووشەی نێو هۆنراوەکان کردووە .

## ● وێنەی باوەشی دیوارەکان ●

لەبلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی کۆمەڵە چیرۆکی جیهان عومەر (وێنەی باوەشی دیوارەکان) لە قەوارەیەکی ١٤ سم×٢١ سم و ٦٦ لاپەڕەیی‌دا کەوتەبازاری چاپەمەنی‌ی کوردی‌یەوە .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بریتی‌یە لە دە چیرۆکی کورتی نووسەر لەم ساڵانەی دوایی‌یەدا نووسیونی .

## ● گۆڤەندو بەهی ●

لەبلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاو کردنەوەی کوردی دیوانی یەکەمی کاك صدیق حامد (گۆڤەندو بەهی) بەشێوەی بادینی کەوتە بازارەوە .

ئەم دیوانە بریتی‌یە لە ٢٤ هۆنراوە کە بەشێوەی کۆن‌و نوێ نووسراون‌و لە ٦٨ لاپەڕەی قەوارە ١٤×٢١ سم دایەو لە چاپخانەی (دار الحرية) لەچاپ‌دراوە .

## ● پەرستگا ●

لە بلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی کۆمەڵە چیرۆکی کاك عبد الله عزیز خالد بەناونیشانی (پەرستگا) کەوتە بازارەوە .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بریتی‌یە لە نۆ چیرۆکی کورت‌و لە ١٠٨ لاپەڕەی مام ناوەندیدایەو لە چاپخانەی (دار الحرية) لەچاپ دراوە .

# یانەی ڕۆشنبیران

**هاوڕێیانم**

بەرلەوەی بکەوینە گفتوگۆ لەگەڵ نامەو بەرهەمەکانتاندا با پێشەکی لەگەڵ خۆتاندا کەمێ بدوێین.

دەزانن کە گوڤارەکەتان گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» پێی ناوەتە نێو جیهانێکی ترەوە، کە جیهانی ڕۆشنبیریی گشتی یەو بابەتەکانی ئێستای لە هی جارانی جیاوازە.. ئەوەتا بایەخێکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی زانستی و ڕۆشنبیری هەمەجۆر دەدات و دەیەوێت بە تەواوی خۆی بۆ ئەم مەبەستەیان تەرخان بکات.. بۆیێ ئەو نامانەی پێمان دەگات و بەرهەمی ئەدەبی یان تێدایە – شیعرو چیرۆك – ئەوە دەیانخەینە بەردەستی کارگێرانی گۆڤاری بەیان و هەفتەنامەی هاوکاری.

هەر لەم بارەیەوە پێویستە ئەوە بدرکێنین کە بابەتی ڕۆشنبیریی گشتی وەك زوربەی بابەتە ئەدەبیەکان نیە کە زادەی بیرو خەیاڵی نووسەرانمان خۆیانن.. بەڵکو ئەویان پیویستی زۆری بە پشکنین و گەڕان هەیەو بەشێکی گرینگیشی لە ڕێی وەرگێڕانەوە مەیسەر دەبێت.. بۆیێ تکا لە هەموان دەکەین کە هەرگیز ئەم لایەنە پشتگوێ نەخەن و سەرچاوەو دەقەکان کە وەرگێڕراون یاسوودیان لێ وەرگیراوە بە وردی دەسنیشانی بکەن تابتوانین خوێنەران و خۆشمان لە ئەمانەتی بەرهەمەکە دڵنیا بکەین لەگەڵ سوپاس و ڕێزماندا.

ئەمانەش ئەو بەرهەمانەن کە تا ئێستا پێمان گەیشتوون و دەستەی نووسەرانی (ڕۆشنبیری نوێ) تێبینی یان لە سەریان هەیە.

**• کاکە عەبدولکەریم عەبدوڵلا حەویزی – لە هەولێر..**

هاوڕێی شیرین

بەڕاستی ئەرکێکی زۆرت کێشاوە لەو بابەتەدا کە بەناونیشانی «هاریکاریی نیوان ماڵ و قوتابخانەو کۆمەڵ بۆ پێگەیاندنی نەوە».. ئەو زانیاریانەی تیای دا خستبووتە ڕوو بەنیسبەت مامۆستایان و دایك و باوکی مندالانیشەوە سوودمەند بوون.. دەتوانرا کەمێ کورت و پوختتر بکرایەتەوەو بەزمانێکی ڕەوانتر بنووسرایە.. بۆیێ چاوەڕوانی بەرهەمی بوختترو ڕەوانترت دەکەین..

**• کاکە ئەزوەر حەمەد لە هەولێر..**

وتارەکەت بەناونیشانی «بەراوردێك لە نیوان کچە ئەکتەرەکانی سینەمای ئەمەریکایی دا» لە مێژەوە بەدەستمان گەیشتبوو.. بەڵام لەبەر ئەوەی کە هیچ سەرچاوەیێکت دەسنیشان نەکردبوو بۆمان ڕوون نەبوەوە کە وەرگێڕراوە یانووسراوە.. بۆیێ تکا دەکەین کە بۆ ئەم بابەتانە سەرچاوەکان دەسنیشان بکەن و هەروەها وێنەو نەخشەی ڕوونکردنەوەش لە مەسەلەی سینەمادا زور پێویستە.. نامەمان لێ مەبڕن.

**کاکە موحسین محەمەد لە هەولێ..**

براکەم.. ئەو وتارەی بە ناونیشانی «سەرهەڵدانی شانۆی تەعبیری و قۆناخەکان» بۆت ناردووین و.. بە سەرەتایەکی دەستپێکردنی نووسینیت دای دەنێیت.. هەوڵ و کۆششی زۆری لەگەڵ دا بێت خراپ نیە.. بەڵام بۆچی بڵاومان نەکردەوە.. چونکە بە هەمووی لاپەڕەو نیوێك بوو.. نیوەشی

باسی شانۆ نەبوو . . هیواداوین کە بەردەوام بخوێنیتەوە و لەم بوارەدا خەریکی خۆپێگەیاندنو خزمەتیش بیت .

**• کاکە هاوڕێ قادر – لەبەغداوە –**

کورتە (چیرۆکەکەت) بە ناونیشانی «گومان» گەیشت . . نەمان نارده چاپەنیەکانی ترمانو مەبەستمان بوو لێرەدا وەڵامت بدەینە . .

سەرەتای چیرۆکەکە (خۆگورینو چوونەدەرەوە) بەشداری لەگەلا لە کردنی – گومانە – کەوا ناکات . . ئەمجا – چاكو چۆنی .لەگەڵ دووکاندارەکەش‌دا . . تا دەگاتە داوای ژمارەکردنی نەقلیاتیش – کە نیوەی چیرۆکەکەتە . . پێوەندی بە دروست کردنی گومانەکەوە نیە . . ئەوی تریشی پەشیمان بوونەوەیە لە گومانەکەی – کە داوای لێبوردن لە خوشکی دەکات – بەڵام ئەمەشیان پێویست نەبوو . . چونکە خوشکی پاڵەوانەکە ئاگای لەم گومانەش نیە . .

سەرەتاییکی خراپ نیە . . بەردەوامیت لە خوێندنەوەی چیرۆکی بێگانەو کوردی‌دا بەهرەت دەگەشێنێتەوە .

**• کاکە محەمەد حەسەن رەسول لە سەید سادق .**

نامەکەتمان خوێندەوە ، وا هەندێ لە ژمارەکانی لەمەوبەری گۆڤارەکەمان بۆ ناردی ، وە بۆ ژمارەکانی لەمەودواش ، تکایە جاروبار سەر لە نووسینگەی دەزگاکەمان لە سلێمانی بدە ، تاکو بەدەستت بگات ، لەگەڵ ڕێزمان .

**• کاکە حەکیم حەمە عەزیز – لە سێوسێنان –ەوە**

بەرهەمەکەت بە ناونیشانی «ڕاوەکەو» دوو بابەتت تێدا تێکەڵاو کردبوو . . یێکەمیان «پەخشان» کە شیعر ئامێزیشت کردبوو . . دوەمیان «وتار» کە باسی جۆرەکانی ڕاوی کەوە لەسەر هەردوو دیوی پەڕەکەشت نووسی‌بوو . . کاکی برام بۆ ؟ ! دەتوانیت بە تەنیا باسی جۆری ڕاوەکەمان بۆ بنووسیتو سوود لەو ڕاوچیانە وەربگریت کە لەو ناوچەیەدان . . بەبێ پەخشانو شیعر . . لەگەڵ سوپاسمان‌دا . .

**• کاکە سەردار عەبدولکەریم صالح لە کەرکووکەوە**

نووسینە وەرگێڕراوەکەت دەربارەی (ئەلبێرتۆ مۆراڤیا) ڕەوان نەبوو . . قسەی خۆمانێ خەتەکەشت بە زەحمەت دەخوێنرایەوە . . سەرەڕای نووسین لە هەردوو دیوی پەڕەکە . . کاکی برا . . بمانبەخشە لە بلاو نەکردنەوەی . . بەڵام نامەمان لێمەبڕە .

**• بۆ کاکە – ك . و – لە هەڵەبجەوە .**

(چەپکێك بیروڕای سەربەست بۆ یەکسانی مرۆڤ)

سەرەتایەکی بە پێتو بە پێزە بۆ چوونە ناو بابەتێکی ناسكو گرینگی وەك (یەکسانی نیوان مرۆڤ) . . ئەو دیاردانەی کە لە هی (گورگ و مەڕ) دەچێ دەبینرێتو لە زۆر شوێنی ئەم گۆی‌زەمینەدا بەردەوامە . . ئەمانە هەمووی لە گەڵتاین . . ئەی چار ؟ !

هاوڕێکەم . . لاچوونو فەوتانی ئەو هاوکێشە لاسەنگو نالەبارانە بە (خۆزگە) ی ڕووت نایەتەدی . . بۆ هێنانەدی خۆزگەو ئاواتەکانمان . . بیرو کاری لێوچانی دەوێت . . تکا دەکەین کە بەردەوام بەرهەممان بۆ بنێریت .

# دەقی تەواوی وتارەکەی سەرۆکی فەرماندە دەربارەی هەڵوە شاندنەوەی ڕێکەوتنەکەی جەزایر

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

برایان . ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی :

لەسەر بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بۆ ئەم دانیشتنە جیایە بانگمان کردن تا ئاگاداری هەندێ باری چارەنووسی بن . کە پەیوەندی بە نیشتمان و نەتەوەوە هەیە . لەباوەڕی سەرکردایەتی حزبو شۆرشەوە بو دەوری تواناداریتان بۆ پتەوکردنی خواستی نیشتمان . دووپات کردنەوەی بەکارهێنانی دیموکراتیەت کە شانازی پێوە ئەکەین . بە گوێرەی ئەوەی کە پایەیەکی بنەرەتی یە لە پایەکانی تاق کردنەوەی شۆڕشگێڕیمان . دەربرینێکی ڕەسەنە لەو پەیوەندی یە قوڵەی نێوان جەماوەرو سەرکردایەتی حزبو شۆرشو . دەزگا نیشتمانی یە سەرکردایەتی یەکان .

**برایان**

مەسەلەو گیروگرفتی نیشتمانیو نەتەوەیی لە مێژووی نیشتمانیو نەتەوەیمان جیانابێتەوە ، کۆنو نوێ : ، کەوابوو ئەبێ لە مێژوومان بکۆڵرێتەوە . وەرگرتنی وانە بنەڕەتی یەکانی بۆ زانینی ئەو ڕاستی یە جەوهەریانەی ئێستا هەیە .

ئیمپریالیزم بە درێژایی چاخەکانی کۆن هەموو هۆیەکی دەسکەوتووی بۆ لاوازکردنی نەتەوەی عەرەبو کرنۆش پێ دان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە و زەوی و فەرو کەڵکەکانی بۆ خۆی بەکاربهێنێ . مەترسی دارترین شت کە ئیمپریالیزمی بەریتانیاو فەرەنساو . ئیمپریالیزمی ئەمریکاو ، هەموو هێزێکی ئیمپریالی چاخی نوێ دژی نەتەوەی عەرەب کردوویانە . دروست کردنی قەوارەی زایۆنی یە . لە سایەی دۆخێکی مێژوویی زانراودا . بۆ مانەوەی پارچە پارچەیی نەتەوەی عەرەبو . لاوازکردنی ، واتە تەخت کردنی ڕێگای چەوساندنەوەو دەسەلات بە سەریا پەیدا کردنە .

دوای ئەوەی کە لەزەوی خاکی فەلەستینی داگیر کراودا قەوارەی زایۆنی دروست بوو ، قازانجو خواست و سیاسەتی تایبەتیشی پێکهات کە هەندێکیانی لە قازانجو مەبەستو سیاسەتی ئیمپریالیزمەکانەوە وەرئەگرت ، لەکاتێکدا کە هەندێکی تر لەوان تایبەتیەکی دەستنیشان کراوی دەست ئەکەوت . قەوارەی زایۆنی لە دروست بوونی یەوە تا ئەمرۆ هەر لەلایەن ئیمپریالیەتی جیهانی یەوە نەپارێزراوە . بگرە لەلایەن ئەو زایۆنزمە جیهانی یەوە کە لەگەڵێ وولاتانی جیهاندا هەن کە هۆی مەترسی داری بۆ دەستەلاتو کار تێ کردن . خزمەتی ئەم قەوارەیە ئەکەن و بە هۆو بەهێز یارمەتی ئەدەنو . پیلانە فراوان کردنە دوشمنایەتی یەکەی دژی نەتەوەی عەرەبی بۆ ئاسان ئەکەن ، قەوارەی زایۆنی نەك هەر مەخفەرێکی پێشەوەیێ بۆ ئیمپریالیەت . بگرە هەر لەو کاتەدا لەم ناوچە بەکەڵکەی جیهاندا بۆ زایۆنی ڕەگەزپەرستیو . بۆ خواستو قازانجو مەبەستی بلاوبونەوەی . بۆتە مەخفەرێکی پێشەوە .

قەوارەی زایۆنی لە ماوەی سی ساڵدا لە ڕۆژی دروستبوونیەوە تا ئەمرۆ پێویستی خۆی لە پارچە پارچەکردنو لاوازکردنی توانای نەتەوە لە ڕاپەڕینو پێشکەوتن دا جێ بەجێ کردووە . . هەروەك جێ بەجێ ی کرد . کە هەڵی بۆ ڕێکەوت ـ بۆ دەست درێژیو بلاوبوونەوە لە خاکی عەرەب دا .

بەلام پێشەوا ڕۆشنبیرەکانی ناو نەتەوەی عەرەب ئەوانەی کە بە تێگەیشتنو ووریایی یەوە ئاگاداری پیلانەکانی زایۆنیزمی جیهانی یەو دژی تێ ئەکۆشی . ئەوە ئەزانێت کە هێزی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم لەوە دەرچوون کە هەر بەو پارچە پارچە کردنە دەست بەردار

نابێ کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بەسەر نەتەوەی عەرەبیدا سەپان . بگرە کاری ئەوە ئەکات کە وولاتانی عەرەب پارچە پارچە بکاتو بەجۆرێك هەریەك لە پارچەکان یان هەردووکیان ئێستا یەکگرتوو نەبێ کە یەکێکیان بۆ ئەوی‌تر ببێتە قولایی‌یەکی بازار بۆ ئەوی کەیان . کە ئەکەونە نزیك ترین سنووری قەوارەی زایۆنیەوەو ئەتوانن هەڕەشە لە قەوارەی زایۆنی بکەن یاخود پیلانی بەرپەرچی بلاوبونەوەیی و خواستەکانی لە نیشتمانی عەرەبدا بدەنەوە .

عیراق لە پێش ئەو وولاتانەوە بوکە ئەم پیلانە زایۆنی‌یە ئیمپریالیزمی‌یە پیسە مەبەستی بوو .

**• تەقەللای ئیمپریالیزمانە بۆ پارچە پارچەکردنی عیراق . .**

لەبەر ئەو هۆیانەی کە پەیوەندی بە شوێنی جوگرافی‌و ئەو هۆیە سیاسی‌و ئابوری‌و مێژوویانەو بە هۆی سروشتی تێکۆشەرانەی گەلەکەی و ئەو دەورەی کە بەدرێژایی مێژوو گێراویێتی بۆ بەرگری کردن لە کەرامەتی نەتەوەی عەرەبو سەرفرازی‌و ، لەبەر ئەو توانایەی کە هەیەتی بۆ راپەرینو پێشکەوتن ، ئەگەر ئەوەی پێویستە دەستی‌کەوێ . . ئیمپریالیزمو زایۆنیزم لەبەر ئەم هۆیانە لەرێی بەرپاکردنی تایبەتیەکانی ناوخۆ لە عیراقداو لە نێوان سەر بەنەتەوەی عەرەبی ، بە بەرپاکردنی رەگی ناوچەیی جیابۆوە ، لەسەردەمەکانی مێژووە نوێ‌کەیدا ، هەروەها تەقەللای دروست بوونی بەربەرەکانیان کردووە لە نێوان نەوەکانیدا . . لەرووی تیرەو ئاینەکانو لە نێوان ئەوەی کە سەر بە نیشتمانو نەتەوەن . . بۆ پارچە پارچەکردنی عیراق .

برایان عیراق پێش شۆڕشی تەمموزی ١٩٦٨ لەسەرمێزی دابەش کردنی باسێلێك‌بووە هێزی ئیمپریالیزمی‌و زایۆنیستی جیهانی بە هەموو شێوەیەکی چەپەلانە تەقەللای پارچە پارچەکردنی عیراقیان داوە کە بیکەن بە چەند نیمچە دەولەتێکی پۆخل . ئەگەر بوایە . . خوا بەو رۆژە نەکات . . بێ‌گومان نەیئەتوانی پارێزگاری ئازادی‌و سەربەخۆیی‌و شەرەفی خۆی بکاتو . عیراق قەدەغەی بەشداری بوونی دلسۆزانەو بەکار ئەکرا لەبەر گری‌کردنی سەربەخۆیی‌و کەرامەتی نەتەوەو وەرگرتنەوەی مافەکانی‌و بەشداری کردنی نامە ،مرۆڤایەتیەکەی ، کەلێنێك ئەکەوتە نێوانی‌و نێوان تێکۆشانی دژی قەوارەی زایۆنی‌و مەبەستەکانی‌یەوەو نێوان ئەو هێزە ئیمپریالیزمیانەی کە لە پشت زایۆنی‌یەوەیەو بە پێویستی‌یەکانی ژیان بەخێوی ئەکات لەگەلْ ئەوەی ئێمە هەست بەوەدەکەین کە گەلی عیراق لەدایك بووەو ، پێش شۆڕشی تەمموز ژیاوەو ، مەردانە دژی هەموو جۆرە پیلانو نەخشە ئیمپریالیزمی‌و زایۆنیزمەکان تێکۆشاوە ، بەلام راستی مێژوویی دووپاتی ئەکاتەوە ئەگەر شۆڕشی تەمموزو سەرکەوتنە مەزنەکەی نەبوایە بۆ چەسپاندنی یەکێتی نیشتمانی‌و ، ئەوەی لە هەموو زەمینەیەکی سیاسی‌یەوە لە پلەی بنیاتنانی نیشتمانی‌یەوە وەدەستی هێنا ، لەوانەبوو تەقەللاکانی پارچە پارچەکردنی عیراق سەری بگرتایە ، هەروەك چۆن پێش شۆڕش توشی لاوازی‌و . جیاجیایی‌و برین هاتبوو بە دەست هێزو تۆرە ئیمپریالیزمی زایۆنیزمەکانەوە .

لە چوار چێوەی ئەم نەخشەیەدا بەرێوەبەرایەتی بە ئیمپریالیزمی‌و زایۆنیزمەکان پێش شۆڕش‌و بەتایبەتی دوای شۆڕش . بە چەکێکی بێ‌پایانی نوێ‌و بەپارەیەکی زۆر یارمەتی سەرکردایەتی‌یە کۆنەپەرستە خۆفرۆشەکەی سەرووی نیشتمانی ئەداو تەنانەت وای لی‌هاتبوو ببووە مەترسی‌یەکی ئەوتۆکە هەرەشەی لە یەکێتی عیراق‌و دوارۆژو نامە نیشتمانی‌یە نەتەوەیی‌یەکەی ئەکرد ئێران بە پشت‌و هاندانی ئیمپریالیزمی ئەمریکاو زایۆنیزمی جیهانی کەوتبووە پالپشت‌گرتنی ئەو سەرکردایەتی‌یە خۆفرۆشە . . بۆ ئەم مەبەستە ئێران توانای سەربازی‌و دارایی و سیاسی‌و راگەیاندن و دەزگای جاسوسیەتی پێشکەوتووی خۆی تەرخان‌کردبوو .

**• جەنگەکانی رۆلە جوانمەردەکانی عیراق**

عیراق ، بە رۆلە جوانمەردەکانی‌یەوە لە هەموو تایەفەو ئاین‌و نەتەوەکاندا لەدژی ئەو تاقە بەکری‌گیراوەو لەدژی ئەوانەش کە لە پشتی‌یەوە وەستابوون خەباتێکی سەختی دەست پی‌کرد ، سوپای عیراقیش ئیلهامی لە شەرەفی عیراق و ئەرکی بەرگری کردن لە یەکێتی‌ی نیشتمانو رابردووی بەرزی نەتەوەی عەرەبو نامەکەی وەرگرتو لە جەنگدا قارەمانانە ئازایەتی نواندو بەنرخترین قوربانی‌ی پێش‌کەش کردو گەشترین نموونەی ئازایەتی‌و نەبەزی خستەروو . . گەلەکەشمان هەموو جۆرە قوربانی‌یەکی قەبوولْ کرد بۆ ئەو جەنگەی کە دوانزدە مانگ لە ئاداری ١٩٧٤ ەوە تا ئاداری ١٩٧٥ درێژەی کێشا کەوا سوپای عیراق زیاد لە شانزدە هەزار پێکراوی زیان لی‌کەوت – بەشەهیدو بریندارەکانەوە – تیکرای زیانی سوپاو گەلی شەست هەزار پێکرابوو لە شەهیدو لەبریندااران .

لەگەلْ ئەوەشدا سوپاکەمان ئازایانە شەری دەکرد لەگەلْ بەکریْ گیراوانو پالپشتەکانیان لە سەهیونی‌و ئەمیریکی‌و

دەسەلاتداریی ئیران . لەگەڵ ئەوەشدا کە دڵو دەروونێکی بەرزو زاتێکی نەبەزی هەبوو بەلام لەتوانادا نەبوو پێویستی‌یە ماددی‌و موضوعی‌یەکان لە جەنگدا پشتگوێ بخرێت . چونکە هەندێ جار بۆ دیارکردنی زۆر ئەنجامی سیاسی‌و سوپایی ئەو پێویستی‌یانە گرنگن و کاریگەرن . گیروگرفتی بنەڕەتی‌ی جەنگەکەمان لەگەڵ یاخی‌بوونە بەکرێ گیراوەکە . ئەوەبوو . تادەهات چەكو ئازوقەی شەر بەلێشاو دەهێنرایە مەیدانەوە . کە بەلای کەممەوە هاوتای ئەو چەكو ئازوقەو کەلوپەلە بێ ژمارانە بێت کە رژێمی ئیرانی بەنوینەرایەتی‌ی ئیمپریالزمی ئەمەریکاو سەهیۆنی دەیخستە بەردەستی تاقە بەکرێ گیراوە یاخی‌یەکەوە .

**• مەترسی‌ی باری سوپایی پێشوو**

تا باری سوپایی گەیشتە رادەیەکی پرلەمەترسی . ئەوە بوو رژێمی ئیرانی تازەترین‌و کاریگەرترین چەکی بەرامبەر بە هێزە ئازاکانمان دانا . بەڵکو کار بەوە گەیشت کە چەند جار هێزەکانی ئیران راستەوخۆ شەری لەگەڵ هێزەکانمان دەکرد . هەروەکو مەشق‌و بزووتنەوەو لەشکرکێشی‌ی بەدرێژایی سنووری رۆژهەلاتمان‌دا بەردەوام بوو بۆ ئەوەی لەچەند بەرەیەکەوە سوپاکەمان خەریك بکات‌و هەڵوێستی سوپایی تاقە بەکرێ گیراوەکە پتەو بکات . . بە ئامانجی ئەوە سوپای ئازامان ببەزێنن ، یان وای لێ‌بکەن کە دەروەستی بەرەنگاربوونی یاخی بوونە گومان لێ‌کراوەکە نەیەت ، دوای ئەوەی کە ئازوقەو چەكو تفاقی نامێنێ . . ئەوسا لەتوانادا دەبێت کە پیلانەکەی ئیمپریالزمی — سەهیونیزم بۆ لەت لەت‌و بێ هێزکردنی عیراق و لەناوبردنی دەوری نەتەوایەتی عیراق بەجێ بهێنرێت .

بەراستی مەترسی گەیشتە پلەیەکی بەرزکاتی‌کە تفاق و ئازوقەی بنەرەتیان بەشێوەیەکی ترسناك لەکەمی دەدا ، بەتایبەتی چەکە کاریگەرو بەکارەکان وای لێ‌هات تفاق لولە تۆپە قورسەکان هاتە سەر نەمان ، لەبۆمبا قورسەکانی چەکی فرۆکەوانی‌دا تەنیا سێ بۆمبا مابوو .

ئێمە ، براینە ، دەزانین کە چەك فرۆشتن بەتایبەتی ئالقە پێشکەوتووەکانی ، لە جیهانی ئەمرۆدا ، ناچێتە ژێر باری بازرگانی‌یەوە ، زۆرتر لەچوارچێوەی تەقدیر کردنی سیاسی‌و ستراتیژیی دەوڵەتە خاوەن چەکەکە دادەنرێت . چەکدارکردنی سوپاکەمان لە پلەی یەکەم پشت بەیەکێتی سوڤیەتی دەبەستێ ، یەکێتی سوڤیەتیش لەو سالانەی رابردوودا ، چەکی پێشکەوتووی پێ‌دداین ، بەلام ئەمەیە راستی لەو رۆژەدا ، لە کاتی تێکۆشانمان‌و کوشتارمان لەدژی تاقە بەکرێ گیراوە یاخی‌یەکە لە باکووری نیشتمانەدا ، ئێمە کە ئەو راستی‌یە مێژوویی‌یە ئاشکرادەکەین گلەیی لە کەس‌ناکەین‌و بیانوش دروست ناکەین ، بەلام دەمانەوێ راستی‌یەکی مێژوویی روون بکەینەوەو لێپرسراوی بخەینە چوارچێوەی تەواوی خۆیەوە .

لە کاتی خۆشیدا راستی‌ی کەمی‌ی ترسناکی تفاق جەنگمان شاردەوەو لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا لە بازنەی سەرکردایەتی‌دا هێشتمانەوە ، بۆ ئەوەی دوژمن بەو نهێنی‌یە نەزانێت و لە پیلان و دوژمنایەتی‌یان‌دا ملهوری نەکەن ، بۆ ئەوەش تازاتی مەعنەویی هێزەکانمان کە بەو چەکانەی تر کە هەیان بوو ئازایانەو سەربەرزانە شەریان دەکرد بێ‌هێز نەبێت .

بەلام ئەم راستی‌یە رەنگدانەوەیەکی گرنگی بۆ سەر دروست کردنی بریاری سیاسی ئێمە لە زۆرانبازیی نێوان ئێمەو ئێران‌دا هەبوو .

**• هەل و مەرجەکانی شەری تشرین**

ئەمە لایەکی مەسەلەکەیە ، لایەکەی تریش ، براینە ، رۆژگارو هەل‌و مەرجی ئەو جەنگەیە کە عیراق لەشەری تشرینی ساڵی ١٩٧٣ دا دەستی‌دایە .

ئەوەبوو بەبێ ئاگادارکردنی عیراق‌و بەبێ‌ئەوەی ماوەیەکی تەواوی ئەوەی هەبێت خۆی ئامادە بکات شەر لەگەڵ قەوارەی زایونیزم‌دا هەلگیرسا ، بە گوێجان لەگەڵ هەڵوێستی عیراق‌و لێپرسراوی‌ی نەتەوەیی خۆیدا ، چار نەبوو دەبوو لەم جەنگەدا بەشداری بکات ، ئیتر ئامانج‌و سروشتی ئەو کەسانەی نەخشەیان بۆ کێشابوو هەرچی‌بوو بێت‌و سروشتی پەیوەندی عیراقیش بەو رژێمانەوە کە لەشەرەکەدا بەشداربوون هەرچونێك بوو بێت . لەو کاتەدا هێزەکانی عیراق لەبەرەی رۆژهەلاتدا هەڵیان دابوو لەدژی دەستدرێژیی ئیران لە زەوی‌ی نیشتمانی لەپارێزدا بوون ، جا بۆ ئەوەی عیراق هەل‌و مەرجێکی لەبار بۆ بەشداری‌کردنی هێزەکانی خۆی لە شەر لەگەڵ زایۆنی‌ی دوژمن سازبکات ، ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆرش لە حەوتی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ دا بەیاننامەیەکی دەرکرد تێیدا دووپاتی کردەوە کە عیراق ئامادەیە لەگەڵ ئێران گیروگرفتەکان بەرێکەی ئاشتی چارە سەر بکات . پاشان هێزە لێدەرەکانی خۆی نارده سووریا ، کەوا شەرافەتمەندیی پاراستنی دیمەشق لە کەوتنە دەست‌و راگرتنی کشانی سەهیونی‌ی بۆ سەر خاکی سووریایان وەرگرت .

دەرکردنی ئەو بەیاننامەیە ، لەلایەنی

واقیعی‌یەوە . مانای وابوو کە عیراق ئامادەیە سەیری داخوازی‌یەکانی ئێران لە (شط العرب) دا بکات .

ساڵی ١٩٧٥یش . کاتێ کە سەرۆك بومدیەن رەحمەتی خوای لێ‌بێ – دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە عیراق‌و بەئێران‌و پێشنیاری کرد کە لە جەزایێردا دەربارەی ئەو مەسەلانەی ناکۆکیان لەسەریان هەیە هەردوولا بکەونە گفتوگۆ . ئەو کارەمان پەسندکردو بەهەلێکی رەخساومان دانا بۆ پاراستنی ئاسایشی عیراق‌و یەکێتیی نیشتمانی‌و ئاسایشی سوپای عیراق . .

لەسەر ئەم بناخەیە سەرکردایەتی‌ی حزب‌و دەوڵەت بڕیارێکی دەرکرد کە لەگەڵ ئێراندا بکەوینە گفتوگۆکردن‌و هێڵی (تالوك) بەهێڵی سنوور لە شط العربدا قەبوول بکەین ئەمەش بەرامبەر بە خۆکێشانەوەی ئێران لەو زەوییانەی عیراق کە لە سەردەمەکانی پێشوودا داگیری کردبوون بە پێچەوانەی بروتوکولی قسطنطینیەی ساڵی ١٩١٣ وپاشکۆیەکەی واتا تۆمارەکانی کوبوونەوەکانی قومیسیرەکانی سنوور بۆ نیشانە کردنی سنووری نێوان عیراق‌و ئێران لە ساڵی ١٩١٤ دا لەوانە ناوچەی (زینەلقەوس)و (سەیف‌سەعد) کەوا بەر لەچەند رۆژێك هێزەکانمان رزگاریان کردن . هەروەها بەرامبەر بەپێش‌کەش نەکردنی هیچ یارمەتی‌یەکی سوپایی‌و جۆری تر بۆ تاقە بەکرێ‌گیراوە یاخی‌بووەکەی باکووری نیشتمان .

## ● رێکەوتننامەی ٦ی ئاداری ١٩٧٥

لەسەر ئەم بناخەیە گفتوگۆ لەگەڵ ئێران کراو رێکەوتننامەی ٦ی ئاداری ساڵی ١٩٧٥ مۆرکرا .

ئەم رێکەوتننامەیە لەکاتی خۆیدا : ڕووداوێکی گرنگ‌بوو . . . ئەوەبوو پاش بڵاوکردنەوەی یەکسەر هێزەکانی یاخی‌بوونە بەکرێ گیراوەکە رووخا یاخی‌یەکان خۆیان بەدەستەوەداو ئەو چەکانەی کە سوپاگرتنی گەیشتنە ١٥٢٠٠٠ پارچە .

**براینە** .

رێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٥ وەختی خۆی بڕیارێکی ئازاو ژیرانە بوو . . بڕیارێکی نیشتمانی‌و نەتەوەیی بوو .

ئازایەتی هەرئەوە نی‌یە لە مەیدانی بەرەنگار بوونی دوژمن‌دا . لە بەرگری‌و پەلاماردا بە چاك بە کارهێنانی تفەنگ‌و شیر بە تەنیا بنوێنرێ . بەڵکو هەروەها لە پلەی سەرکردایەتی‌دا بە شێوەیەکی تایبەتی . بە بڕیاری سیاسی‌ی ئازا . لەبەرگری کردن لە گەل‌و نەتەوەداو لە پاراستنی سەربەرزی‌دا دەنوێنرێ ، کاتێ کە شیرو تفەنگ بە تەنیا ناتوانن ئەو ئامانجانە بهێننەدی .

ئەو بڕیارە ، بەپێ‌ی هەل‌ومەرجی ئەوسا ، لە چەند مەترسی‌یەکی کاریگەر عیراق رزگار کرد کە هەرەشەیان لە یەکێتیی‌و ئاسایش‌و دوا رۆژی دەکرد . هەروەها هەلی بۆ گەلەکەمان ریك خست کە لە شۆرشەکەیدا بەرەو پێش بچێ‌و لە کرداری بنیات نان‌و راپەریندا بەردەوام بێت‌و بگاتە رادەیەکی ئەوتۆی هێزو پێشکەوتن‌و کامەرانی ، کە ئابروومەندیی‌و سەربەرزیی عیراقی‌یەکان بپارێزێت‌و عیراقێکی بە هێزی بە توانا بخاتە سەر رێ‌ی خزمەتی نەتەوەی عەرەب‌و پەیامە مەزنەکەی وەنەبێ بڕیارەکە خۆ بەدەستەوەدانی واقعێکی تاڵ بێت ، ئەگەرچی واقیعەکە تاڵیش‌و بە ترسیش بوو ، بەڵکو پشت نەرم کردنی ئەو واقیعە بوو بە کردەوەیەکی سەرکردانەی بە تواناو لەگەڵ حیسابی هەل‌ومەرج‌و تواناکان هاوسەنگ‌دا . رێکەوتننامەکەی ئادار زادەی زرووفی خۆی‌بوو . . گەلەکەمان لێ‌ی تێ‌گەیشت‌و لە چوارچیوەی ئەو زرووفانەدا بە سەرکەوتنێکی گەورەی داناو بە شادی‌و خوشی‌یەوە پێشوازی لێ‌کرد . لەگەڵ ئەوەشدا کە سوپاکەمان لەگەڵ یاخی‌یەکاندا بە جەرگانە شەری دەکردو بەو راستی‌یە تاڵانەی نەدەزانی کە باسمان کرد دەربارەی کەمی‌ی تفاق بایەخداری . زەبری بە ئێشی بە یاخی‌یە خاینەکان دەگەیاند . ئەویش بە شادی‌یەکی زۆرەوە پێشوازیی لە رێکەوتننامەکە کرد . چونکە لە ناوەرۆکەکەی گەیشت لە چاو یەکێتیی نیشتمان‌و پاشە رۆژیدا ، وە هەل‌و مەرجە بە جێ‌یەکانی نرخاند .

**براینە** . .

پاش مۆر کردنی رێکەوتننامەی ئادار ، گەلێ گفتوگۆو هاموشۆ کرا بۆ ئەوەی بەندەکانی بەجێ بگەیەنرێت ، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە هێڵکێشانی سنوورو چەسپاندنی کۆڵەکە سنووری‌یەکان‌و کاروباری تری شێوە هونەری‌یەوە هەبوو . هەرسێ پرۆتوکۆڵە بنەرەتی‌یەکەی سەر بەو رێکەوتننامەیەش مۆر کران . کە بریتین لە پروتوکولی سنوور کێشانی رووبارو بروتوکولی کێشانی سەر لە نوێ‌ی سنووری ووشکانی‌و پروتوکولی ئاسایشی سەر سنوور . ئەوەبوو هەر زوو لایەنی ئێرانی کەڵکی لە رێکەوتننامەی دیار کردنی سنووری رووبار لە (شط العرب) دا وەرگرت ، بەڵام جێ‌بەجێ کردنی پروتوکولی تایبەت بە سنووری ووشکانی وەختێکی سەرباری پێویست بوو . ئەمەش کارێکی ئاسایی

بوو . . له پاشانیشدا کاری تەسلیم کردنەوەی زەوی‌یەکان بە هۆی باری رژێمی ئیرانی پێشوو لە سالی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ دا دواکەوت . . پاشان دەسەلاتداری ئیرانی نوێ هاتو . . زەوی‌یەکانمان هەر لە دەست لایەنی ئەولادا مانەوە . ئێمەش ئەوەمان رەچاو کرد کە رژێمی نوێ پیویستی بە کات هەیە بۆ ئەوەی بەلێنەکانی خۆی بەپێ‌ی ریکەوتننامەکە بەجێ بهێنێ . کەچی ئێمە . لە رۆژی یەکەمی هاتنە سەر حوکمی ئەو کۆمەلەوە لە ئێران . هەستمان بە هەلوێستی دوژمنایەتی‌ی ئەوان کردو پەیوەندیی هاوسێ‌یەتی چاکیان تێکدا . . گوێمان لێ‌یان دەبوو کە بەرودوا رایان دەگەیاند کە ئەوان دەربەست بە بەلێنەکانی رێکەوتننامەکەی ئادار نین . هەر لە زۆر زووەوە . بەندێك لە بەندە بنەرەتی‌یەکانی رێکەوتننامەکەیان شکاند کاتێ کە سەرکردایەتی‌ی یاخی بوونی بە کرێ گیراویان لە ئەمەریکاوە بانگ کردە ئیران . . بارزانی بە کرێ گیراوو هەندێ کوری ئەویان ئامادە دەکرد بگەرێنەوە ئیرانو چالاکی‌ی دوژمنانەیان لە دژی عیراق دەست پێ بکەنەوە بەلام لای ئاغاکانی وەلی نیعمەتی مردو کورەکانیو سەرەکانی یاخی بوونی بە کرێ گیراو گەرانەوە ئێرانو کردیان بە سەرشاری هەرەشە کردن لە ئاسایشو یەکیتی نیشتمانی‌ی عیراق بە پشتیوانی‌یەکی ئاشکرای کاربەدەستانی ئیران .

هەموو کردەوەکانی کاربەدەستانی ئێران لەو رۆژەوە هاتوونەتە سەر حوکم هەتا ئەمرو . ئەوە دیاری دەکەن کە پەیوەندیی هاوسێ‌یەتی تێك دەدەنو بەلێنەکانی رێکەوتننامەی ئادار ناپارێزن . لە بەر ئەوە ئەوان هەموو لێپرسراوی‌یەکی قانونیو کرداری دەکەوێتە ئەستۆیان لە بەتالْ کردنەوەی رێکەوتننامەکەو کۆتا پی‌هێنانی .

رێکەوتننامەکە لەگەلْ ئەو بارە سەختانەدا کە عیراق لە کاتی مۆرکردنیدا تی‌یدا بوو – لەسەر چەند بناخەیەکی هاوسەنگ دامەزرابوو . واش دانرابوو کە تێکدانی هەر بناخەیەك لەم بناغانە تێکدانی گیانی ریکەوتننامەکە بێت .

لەبەر ئەوەش کە کار بەدەستانی ئێران لە سەرەتای حوکمیانەوە بەهۆی دەست تێوەردانی ئاشکراو بە غەرەزیان لە کاروباری ناوەخۆی عیراقداو یارمەتی‌دانی سەرەکانی یاخی بوون – هەروەکو شا لە پێشوودا دەیکرد – کە لەلایەن ئەمەریکاو سەهیونیزمەوە پشتگیری کراون وە بە هۆی ئەوەوە کە زەوی‌یەکانی عیراق نادەنەوە کە ناچار بە هێز رزگارمان کردن ، من وا لە بەردەم ئێوەدا بلاوی دەکەمەوە کە ئێمە ریکەوتننامەی ٦ ی ئاداری ١٩٧٥ لەلای خومانەوە بە دوا پی‌هاتوو دادەنێین (ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆرش بریاریکی بۆ ئەمە دەرکردووە) . . ئیتر بەم جۆرە دەبێ پەیوەندی قانونی لە «شط العرب»دا بگەرێتەوە رۆژگاری پێش ٦ی ئاداری ١٩٧٥ ، ئەو شەتەش هەروەکو لە مێژوودا هاتووە بەناویشو بەراستیش دەبێتەوە بەعیراقیو عەرەبی ، لەگەلْ هەموو مافی بە کارهێنانی دەسەلاتی تەواوی عیراق لی‌یدا .

برایان

عیراق لە پەیوەندیەکانیدا لەگەلْ هەموو جیهان ئیلتزامی تەواوی‌شەرەفمەندی هەیە بەرامبەر هەموو بەلێنەکانی . دیسان ئیسپاتی کردوە کە ناگونجێ بە هیچ جۆرو شێوەیەك هەرەشەو دوژمنایەتیو دەستدرێژی بۆ سەر رێزو کەرامەتی قبولْ بکات . گەلی عیراقو سوپای عیراق تەواو ئامادەی هەموو شەرێکی ئازایانەن ، هەرچەندە قوربانی گرانبێ لە پێناوی پاراستنی شەرەفو رێزدا .

بریاری مێژوویماندا ، بە چەسپاندنەوەی دەستەلاتی تەواومانی لەسەر خاكو ئاوەکەمانو بەهێزوو تواناوە بەرامبەر هەر بەرپەچێك هەلدەسورێین کە بەرووی ئەم‌بریارە رەوایەدا بوەستێ .

ئێمە بۆ ئێوەی دووپات دەکەینەوە ، هەروەك بۆ جیهانی دووپات دەکەینەوە . وەك چۆن لەمەوبەر وابووین ، چاومان لە دامەزراندنی پەیوەندی دراوسێ باشی‌یە لەگەلْ ولاتانی دراوسی‌دا بەتایبەتی ئێران . عیراق هیچ چاوی لەخاکی ئێران نەبریوە ، دیسان نیازمان نیە هەزگیز بەشەر پەلاماری ئیران بدەین یان بازنەی زۆرانبازی بگەیەنینە دەرەوەی سنووری بەرگری کردن لە مافو رێزمانیو ئێمە بەوانە دەلێین کە لە خۆبایی‌بوون لە ئێران کوێری کردوونو ئارەزووی گومان لی‌کراویان گەیاندونیەتیە ئەوەی بە نهێنیو ئاشکرا لە لایەن هێزەکانی ئیمپریالیو زایونیەوە ، هەلسورێن ، پێیان دەلێین لەسەریانە دەرس لە رۆژانی رابوردو وەرگرن کە سوپای ئازامانی (زين القوس) و (سيف سعد) مەخفەرەکانی سنووریان بە هەلویستی پیاوانی ئازا سەندەوە ، بانگیان دەکەین بۆ وەلام دانەوەی دەنگی حەقو عەقلْ کە داوای پاراستنی دراوسێ باشی‌دەکا لەگەلْ عیراقو نەتەوەی عەرەب ، تەنیا بەوە دەتوانن خزمەتی گەلەکەیان بکەن ئەگەر بەراستی دلسۆزن بۆی ، هەر بەوەشی دەتوانن بیسەلمێنن

شۆڕشگێڕن‌و نووکەری هێزەکانی ئیستعمارو زایۆنی نین‌و ڕەگەز پەرست‌و دواکەوتو نین‌و قین لە دڵ‌و دوژمن نین بەرامبەر نەتەوەی عەرەب کە بیانەوێ فیتنەو ئاژاوە لەریزەکانیان بنێنەوەو دابەش‌و بێ‌هێزی بکەن بە پێی نەخشەی زایۆن‌و یەك‌گرتو لەگەڵیا وەك ئەنجام .

ئێمە لەبەردەم ئێوەو لەبەردەم نەتەوەی عەرەب‌و جیهاندا دەڵێین . ئێمە پەردەی درۆزنیان لە رووی ئەو تاقە حوکم ڕەوایە دری کە لەئێرانە . ئەو تاقەحوکم ڕەوایە پەردەی دینی بەدرۆ بەکارهێنا بۆ ئەوەی لەسەر حسابی ریزی نەتەوەی عەرەب‌و سوودی بەرزی نەتەوەی عەرەب دەستەلاتیان فراوان بکەن‌و فیتنەو ئاژاوەو کەرت بون لەریزەکانیا بلاوبکەنەوە ، لەپاڵ ئەو رۆژگارە گرانەش کە نەتەوەی عەرەب پیا دەرواو ئەو خەباتەی دژی زایۆنی دوژمن‌و هێزە ئیمپریالیەکان دەیکا .

پەردەی دین ، تەنیا پەردەیە بۆ داپۆشینی رەگەزپەرستی فارسی‌و قین لە دڵی بەرامبەر عەرەب ، ئەو تاقە زیرەکانە بۆ ژیاندنەوەی گیانی رەگەزپەرستی‌و قین‌و ناکۆکی نانەوە لەناو گەلانی ناوچەکە بەکاری دەهێنن بۆ سوودی نەخشەی زایۆنی جیهانی جا ئەمە بزانن یان نەزانن .

هەندێ لایەن کە هەندێ هۆی جیاجیا دەیان جوڵێنی‌و ئێستە نامانەوێ باسی بکەین ، دەڵێن خومەینی لە شا جیایە ، بۆ چی وا مامەلەی لەگەڵ دەکەن ؟ ئێمەش دەڵێین ! بەدڵ حەزمان دەکرد خومەینی جیا بوایە لەشا لە رووی هەڵوێستیەوە بەرامبەر کاروباری نیشتمانی‌و نەتەوەیمان‌و بەتایبەتی بەرامبەر مەسەلەی داگیرکردنی خاکی عەرەب ، ماوەیەکی باشیشمان دایە تا ئەوە بسەلمێنی جیایە لەشا ، بەلام ئەوو ئەوانەی لە حوکمدان ئەمرۆ لە ئێران . سەلماندیان لە چاوچنۆکی‌و هەڵوێستی رەگەزپەرستیان بەرامبەر عەرەب جیانین لەشا . بە پێچەوانەی حەقەوە . سووربون لەسەر بەرنەدانی ئەوخاکەی عیراق شاداگیری‌کردبوو . سووربون لەسەر بەرنەدانی دورگەکانی طنب الکبری . وطنب الصغری وابو موسی . هەتا ئەوبانگە وازە داگیرکاریانەیان نوێ‌کردەوە کەشا وازی لێ‌هێنابوو لە ژێر هێزی دەستەلاتی نەتەوەی عەرەب ، بەرامبەر بە عیراق نەیانویست هەتا ئەو زەویانەش بدەنەوە کە شا بەپێی رێکەوتنی ١٩٧٥ موافقەتی کرد لەسەر دانەوەیان .

برایان :

کاتێك کە بە ئازارەوە باس لە رەگەزپەرستێتی رژێم لە ئێران‌و ، هەڵوێستە دوژمنایەتکاریەکانی دەکەین ، لەبیرمانەوە ناچێت کە بەریزەوە هەڵوێستی چاکەی رۆڵە نەبەردەکانی گەلانی ئێران لەبەرچاو بگرین ، لەمانەش فارس ، کە ئێمە سۆزو خۆشەویستیمان بەرانبەریانەوە هەیەو ، پەیوەندی دۆستانە لە گەڵیاندا دەبەستین‌و ، هیواداریت لەو مەینەتە کە ئێستا تیایدا دەژین رزگار بین .

ئێمە سلاوێکی گەرم ئاراستەی برا عەرەبەکانی ئەحواز دەکەین ، کە لە بارودۆخی لە ناوبردن‌و کوشتن‌و چەوسانەوەدا لە ژێر سایەی خومەینی دەناڵێنن زیاتر لەوەی کە لەکاتی خۆیدا لەزەمانی شاە دەیانناڵاندو . سلاو لە خەباتکەرە کوردە بەشەرەفەکان‌و هەموو گەلانی دۆستی ئێران دەکەین‌و بۆیان دوویات دەکەینەوە ، کە ئێمە چاوچنۆکی بستێك خاکیانمان نیەو لە خۆشەویستی‌و سۆزەوە زیاتر هیچ شتێکمان بەرانبەریانەوە نیە .

ئێمە هیوامان وایە کە ئێرانی دراوسێ سەربەست‌و سەربەخۆبێت‌و ، لە دەورە ئیجابی‌یەکەیدا بەشداری لە ناوچەکەو . برووتنەوەی بێ‌لایەن‌و . خەباتی گەلان دەکات لەپێناوی سەربەستی‌و سەربەخۆیی‌و پێشکەوتندا .

برایان :

ئێمە بۆ جیهان دوویات دەکەینەوە . لە کاتی خۆیدا کە عیراق کاروباری کەشتی‌یەوانی لە (شط العرب) دا . بەپێی حەق دەسەلاتی‌پێش ئازاری ١٩٧٥دا بەریوەی دەبرد . لێ‌هاتوویی‌و حەقیقی‌و لێپرسراوی بەرز لەمەدا سەلماندو . عیراق – ئێستا – زیاتر لە توانایدایە ئەرکەکانی – لەم بارەیەوە جێ‌بەجێ بکات‌و . ئێمە داوا لەلایەنە بەرپرسیارەکان‌و ، لەوانە لایەنی ئێرانی دەکەین ، کەریزی دەسەلاتی عیراق بگرێت بە «شط العرب» داو ، بەپێی ئەمە سات‌و سەودا بکات .

برایان :

لە یەکێك لە کۆبوونەوە حزبی‌یەکاندا هاورێیەك لێمی پرسی . ئەو (یەدەگە مسۆگەرەیە) کە هەڵتان گرتوە چی‌یە بۆ رووبەروو بوونەوەی دوژمنایەتی‌ی گومان لێکراوی رەگەزپەرستی رژێمی تازە لە ئێراندا ؟ .

بەو هاورێ یەم ووت : سەرکردایەتی لە عیراقدا گەلی عیراقی وا راهێناوە ، کە هەمیشە (یەدەکێکی مسۆگەری) هەبێت بۆ بەکارهێنانی لە ساتە مێژوویەکاندا بەرانبەر بەدوژمنان وەکو شتێکی کتوپری . بەلام من بەئێوەو ، هەموو عیراقی‌یەکان‌و ، رۆڵەبە شەرەفەکانی نەتەوەی عەرەب دەڵێین کە یەدەگی‌بنەرەتی (مسۆگەر)و

لەروو کەبەنیسبەت پیلانو بەکرێگیراوە گومانلێکرا وەکانەوە لە ئێراندا کە بە ئەقڵی دواکەوتوانەو پالپێوە نەرانەی رەگەزپەرستانەوە دەروانە شتو . ئێمە بەهۆیەوە رووبەرووی هەموو پیلانی دوژمنایەتکاری ئیستعمارو زایۆنیو رەگەزپەرستانە دەبینەوە . گەلی مەزنیی عیراقە بەگیانە راستگۆییەکەیو ، ئامادەبێ بێ لە ئەندازە بەدەری بۆ خەباتو قوربانیدانو ، خۆ بەستنەوە بەهێزەکەی بەمافە رەواکانیو ، هەڵهێنجانیی کە لەپوورە بەرزە مێژوویییەکەی . . کەلەپووری پەیامی مەزنیی ئیسلامییەوەو مێژووی نەمریی نەتەوەی عەرەبو ، گەورەبێ عیراقو . . . سوپای نەبەزی عراقانە کە لەو گیانەوە هاتۆتە کایەوەو ، لە بیروباوەری شۆڕشەوە دەژێتو ، لەژیانو جەنگەکانیدا مێژووی رەونە قداری نەتەوەو مێژووی بەرزی عیراق رەنگدەداتەوە .

یەدەگی مسۆگەر)و ناسراوئێوەنو ، هەموو عیراقییەکی نەبەزو بەشەرەف لە ئەفسەرو سەرباز لە سوپاکەمانو رۆڵەکانی گەلمان ژنوپیاو ، پیرو منداڵانەوە . ئەو گیانە بەشەرەفەی عەرەبەکانە کە دژی دەستدرێژیو تاڵانو جەوساندنەوەو کلکایەتی لە هەموو شوێنێکدا خەبات دەکەنو رەفزی مل کەچی داگیرکەری پۆخڵی فارس دەکەنو هەروەکو چۆن رەفزی داگیرکردنی زایۆنی دوژمن دەکەنو بەهەموو هێزو نەبەردییەوە خەبات دەکەن دژی داگیرکردنی نارەوای زایۆنی بۆ فەلەستینو بەشی تری عەرەبەوە .

برایان :

سڵاوی شەرەف مەندیو بەڵێن تان لێ بێ . . سڵاوی چاکە . . . سوپاستان دەکەم بەرامبەر ئامادەبوونتان لەم کۆبوونەوە نائاساییەداو من دڵنیام گەلەکەمان کە بەدرێژایی مێژوو بەرگەی لێپرسینەوەی نیشتمانیو نەتەوەیی بەلێ هاتویی ئازایانە گرتوە ، لەسەر ئەوری رەوە بەردەوام دەبێو دەوری ئیجابیو بەکاری لەم ناوچەیەو لەرووی دەوڵەتانەوە پتەو دەبێ .

عیراق هەمیشە قەلایی پۆلاینو خۆراگرتو دەبێ بەرووی هەموو داگیرکارو دەست درێژکاریدا عیراق هەمیشە مەرکەزی پاڵپشتی هەموو هێزێکی سەربەستی خوازو پێشکەوتنو خیر خواز دەبێ لەجیهاندا عیراق هەمیشە قەلای نەتەوەی عەرەب دەمێنێتەوە .

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته .



ـ ئەم کێشە سنووریەی ئەمرو کە لە نێوان عیراق‌و ئیران‌دا هەیەو گەلی عیراق پێوە خەریك کردووە ، سەرەتاکەی لە ناوەراستی سەدەیی پانزدە هەممەوە دەستی پێ‌کردووە ، لەوکاتەوە کە ولاتی عیراق یەکێك بو لە ویلایەتە گرنگەکانی ئیمپراتوری عوسمانی ، وەکە بەهوی ئەو کێشەو پێك‌دادانەی نێوان ئیمپریاتوری ناوبراوو ئیمپریاتوری فارس بەدرێژایی چەندەها ساڵ دانیشتوانی عیراق تووشی ئازارو ئەشکەنجەی چەوساندنەوەی دوولایەنی بوبون ، وەکرابونە سووتەمەنی ئاگری جەنگی ئەو شەرو شۆرەی لە نێوان ئەو دوو ئیمپراتورە رووی‌ئەدا . هەرکامێکیان لە ناوچەکە دەسەلاتی ئەگرتە دەست ، لەسەر حیسابی ئەرك‌و رەنج‌و لاشەی گەلی عیراق خۆی بەهێزو تواناتر ئەکرد . . بەم‌پێیە ماوەیەکی مێژوویی دوورو درێژو رۆژانێکی شووم‌و تاریك بەسەر گەلانی ناوچەکەدا بەتێکرایی‌و گەلی عیراق بەتایبەتی تێپەری‌کرد . . تاکو بەرپابونی جەنگی یەکەمی جیهانی ساڵی ١٩١٤ و رووخان‌و هەڵوەشانی ئمپراتوری دووا براوێ عوسمانی . وەئەوەی ئاشکراشە ، بەستنەوەیی عیراق بە دەستەلات و پاشکووی سیاسەتی ئیستعماری بەریتانیا لە ئەنجامی هەڵوەشانەوەی ئەو ئیمپراتورە بو . جا ئیستعماری بەریتانی بۆ ئەوەی بتوانی دەستەلاتی خوی بە باشی‌و فراوانی بەسەر سەرانسەری ناوچەکەدا بسەپێنیت‌و دەستکەوتی چاك وەدی بێنیت ، بەتایبەتی بۆ ئەوەی بتوانی دەستەلاتی بەسەر هاتوچۆکردنی رێگا دەریاییەکانی خەلیج‌و شەتی عەرەب مسوگەر بکات . ئەوکات‌و زروفەی بەهەل‌زانی بە ووردی بەکاری هێناوە سەرلەنوی گێروگرفت و کێشەکانی سنوری نێوان عیراق‌و ئیران‌بووروژێنێت ئەوەبو لەئەنجامدا لەژێر چاوەدێری‌و سەرپەرشتی پسپورانی خۆیدا . چەند پروتوکول‌و نەخشەی سنوری بۆ ناوچەکە رێکخست ، وە لەم رێ‌یەوە توانی دەستەلات‌و مەرامەکانی خوی لەسەرانسەری ناوچەکەدا مسوگەرو دابین بکات . ،

ئەوەی شایانی باسیشە لابەلاکردنی کێشەکە بەم جۆرە هیچ حیسابێکی بۆ بەرژەوەندی گەلانی ناوچەکە تێدا نەکرابو ، وە لەگەل هەست‌و خواستی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌یان رێك نەدەکەوت . . بۆیە بۆ ماوەیەکی درێژ کاروکێشەکە بەو شێوەیە رۆیشت ، تا شۆرشی ١٤ی‌تەموزی ساڵی ١٩٥٨ بەرپابو . ئەو شۆرشەی داوو دەزگای مەلەکیەتی کۆنەپەرستی دۆستی گیانی بەگیانی رژێمی شا – ی ئیرانی رووخاندو رژێمی کۆماری لە شوینیا دامەزراند . ولاتی عیراق لە کۆت‌و زنجیریکی زۆری ئمپریالیست رزگار کرد وە عیراق خستە بەرەی گەلانی ئازادی‌خوازو سەربەخۆ . . ئەلبەت ئەو بارە نوێ‌یەی عیراق دۆخێکی سامناك‌و ترسناکی بۆ شای دکتاتورو کۆنەپەرستی ئیران پێك‌هێنابووە بەتەواوی هەرەشەی لە رێژیم و دەزگاکەی ئەکرد . بۆیە رازی‌بوون‌و چاوچوقانی (شا)و رژێمە کۆنەپەرەستەکەی ئیران لەو گۆرانەی عیراق کارێکی ئاسان نەبو ، هەروەهاش بۆ ئیمپریالیزمی جیهانی بەتایبەتی بۆ ئیمپریالزمی ئەمەریکا کە لە جێ‌بەجێ کردنی سیاسەتی گشتی لە ناوچەکەدا بەپ ی ئەو ستراتیجەو نەخشەو بەرگریانەی کیشابوی بە پشتی شا – ی نوکەری بە تایبەتی ئەو شتانەی راستەو خۆ

بەیوەندی بە دەستکەوتەکانی یەوە لە ناوچەی کەنداوی عەرەب‌و دەوڵەتە عەرەبیەکانەوە هەبو . جا هەست‌کردنی ئەو رژێمە بەکرێگیراو ـ بەمەترسی شورشی ١٤ تەموزو ئەو دەستکەوتە مەزنانەی شورش بۆ گەلی عیراق وەدی‌هێنابو ، ئیران بەهاندانی ئیمپریالیست‌و بەهاوکاری لایەنە کۆنەپەرستەکان کەوتە نەخشە کێشان‌و پلان‌دانان بۆ لێدان‌و بەربەرەکانی شورش‌و گەشەکردنی رێبازە پێشکەوتنخوازەکانی .

بۆیە داوو دەزگاکانی بەتوندی هانداو دەستەو پیاوە چلکاو خورەکانی خوی تاوداو خستینە جموجوڵ‌و پلان. جی‌بەجی‌کردن ، بەتایبەتی دوای هەڵگیرساندنی شورشی ١٧ی تەموز بەسەرکردایەتی حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست ، ئەو شورشەی هیواو ئاواتەکانی گەلی عیراق هێنایەدی وەچەندەها دەستکەوتی نیشتمانی‌و دیموکراتی وەدەست‌هێنا ، کە ئەمەش بو بەهۆی ئەوەی کە رژێمی (شا)ی کۆنەپەرست زورترو توندتر دژی دەوڵەتی عیراق‌و شورشە پێشکەوتنخوازەکەی‌و گەلە خەباتگێرەکەی بوەستی و پتر دەست بۆ کاروباری ناوخۆی عیراق‌دریژبکاو پیلان و دەسیسە بۆ تێکدان‌و ئازاردانی جولانەوەی نیشتمانی و سەرکردە تێکوشەرەکانی بگیرێت ، تاکو گەیشتە ئەورادەیەی بە ئاشکرا کەوتە هێرش بردنە سەر خاك و سنوری پیرۆزو قشلەو مەخفەرەکانی عیراق ، ئەمەو گەلی دەست دریژکردنی‌تر کە تێکرای کردەوەیەکی ناحەزانەو دوژمن کاریەکی تەواوی بەرامبەر گەلی عیراق پیشان ئەدا .

بەڵام دەوڵەتی عیراق لەبەر هەست‌کردن بە پێویستیەکانی سەرشانی لە پاراستنی پەیوە، ی نێوان هەردوو وولاتی دراوسی‌داو ، بۆ رێ‌نەدان بە پیاو خراپ‌و کۆنەپەرست‌و ئاغاکانیان بۆ ئاژاوە نانەوەو هەڵوەرگرتن لەلایەکەوە ، وە سووربوونی سەرکردەکانی شورش‌و باوەری پتەویان بەچارەکردنی گیروگرفت‌و کێشەی نێو دەوڵەتان بەریگای گفت‌و گۆ ئاشتی لەلایەکی‌ترەوە ، عیراق ریککەوتننامەیی ٦ی ئاداری سالی ١٩٧٥ ی لەگەل ئیران‌دا لە جەزائر مۆرکرد ، تاکو بەپی‌ی نەخشەو پروتوکۆلی تایبەتی ئەو کێشە سەرسنوریانەو ئالۆزی ناوچەکە چارەسەر بکات ، بەجۆری مافە رەواکانی عیراق لەخاك‌و ئاوەکەیدا بپارێزیت .

ئەوەبو هەندی بەندو بەشی ئەو ریککەوتنامە جی‌بەجی‌کرا . بەلام هەندی لایەنی گرنگی تری ریککەوتنامەکە لەبەر رانەپەراندنی وەکو خوی مایەوە ، لەوکاتەی کە عیراق زور بەپەرۆشەوە سووربو لەسەر جی‌بەجی‌کردنی هەمو ئەو بەندانەی کە پەیوەندیان جی‌بەجی‌کردنیان لە ئەستوی ئەودابو . .

چونکە ئەم جۆرە ریککەوتنە دووقۆلیانەو جی‌بەجی‌کردنیان پێویستەو پەیوەندی بە دەستورو یاسای دەوڵەتانەوە هەیە . هەرچونی بێت بەلای ئیمەوە ئەو هەڵویستەی رژێمی (شا)و ئەو دوژمنایەتیەی بەرامبەر گەلی عیراق سەیر نەبو سەبارەت بەوەی رژێمیکی سەر بەئمپریالزم‌و گومان لێکراو بو و هەموو تینو هێزی بومانەوەی خۆی لەمەر ئیستعماری ئەمریکی‌یەوەبو . .

بەلام ئەوەی سرنج راکێشیت هەڵویستی دەستەو دایەرەکەی خومەینی بۆ کە پەیرەوبی تەواوی ئەو سیاسەت‌و رێرەوەی رژێمی شایان بەرامبەر گەلی عیراق ئەکرد ، بەڵکو لەوەش زیاتر دەستەکەی خومەینی کەوتنە ئەو ئاستەی کە لە (شا) زیاتر ئازاری عیراق بدەن ، نەك هەر لەبەر پاشەکشەیان لە جی‌بەجی‌کردنی بەندەکانی ریککەوتنامەکەی ٦ ئاداری ٩٧٥ و، بگرە لە دەست دریژکردنیان بۆ ناو خاکی عیراق بە نیازي تێکدانی هیمنی‌و ئاسایش‌و دروست‌کردنی ئاشوب‌و ئاژاوە لە سەرانسەری ولاتی عیراق‌دا . . وە هەر لەم کاتەدا سەرکردایەتی سیاسی هەستی تەواوی بەوە ئەکرد کە پێویستە سنورێك بۆ ئەم دەست دریژی‌و کردەوە ناحەزانەی دەستەکەیی خومەینی دابنێت ، بەلام سەرەرای ئەمانە هەموی شورش بەتەنگ ئەوەشەوە بو کە شتێکی تیابهێلریتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان هەردوولا بەشێوەیەکی یەکجاری تێك‌نەچێت ، پەیوەندی دراوسێتی بمێنێتەوە ، بۆیە شورش لایەنی هیمنی‌و لەسەرە خوبی‌و ژیریەتی بەرامبەر ئەو دوژمنایەتی‌و ناحەزکاری‌یە گرت ، ئەم هەڵویستەش تەنیا لەسەر ریبازی ئەو نەخشە سیاسی‌یەبو کە شۆرش بۆ پەیوەندی‌و هاری‌کاری نێوان خوی‌و دەوڵەتانی‌تر کیشابوی بۆیەو لەبەرتیشکی ئەم ریبازە رووناکە دەوڵەتی عیراق کاربەدەستانی ئیرانی ئاگادار کردو وە تی‌ی‌گەیاندن کە پێویستە خۆیان بەریککەوتنامەی ٦ ی ئادار بەستنەوە وە بەپی‌ی ئەو ریککەوتنامەیە هەموو ئەو مافانەی، عیراق لە خاك‌و دەریایی‌دا کە بریاری لەسەر دراوە دانی پیابنێن‌و جی‌بەجی‌ بکەن ، ئەو ئاگاداری و هوشیارکردنەوەیە بۆ کاربەدەستانی ئیران لەلایەن دەوڵەتی عیراقەوە ، هەموی بەریگای پەیوەندی دیبلوماسی ئاسایی‌و بەڵگە نامە رەسمیەکان‌و بیرخەرەوە تایبەکان بو کە پەیوەندی بەریککەوتنامەکەوە

هەبو . . هەروەها لە هەمان کاتیشدا تیٚ ی گەیاندن کە دەولّەتی عیراق ناتوانی بەرامبەر بەم هەلّویستە دوژمن کاری یەی ئیران بیٚ دەنگ بیٚت و لەوە زیاتر دەستەوەستان بوەستیٚ . . کەچی سەرەرای ئەمانە هەمووی ئەوەبو کاربەدەستانی ئیران گویان بۆ ئەم داواکاریە دلسوزانەیەیی عیراق شل نەکردو ، بەلّکو بە پیچەوانەیی هەموو داب و دەستورو نەریت و یاسای نیٚو دەولّەتان جولاّیەوە و پشتی لەم بانگەوازە کرد ، وە دەولّەتی عیراقی ناچارکرد کە ریککەوتنامەیی ٦ ئاداری سالی ٩٧٥ هەلّوشیٚنیتەوە ، دوای ئەوەی کە بەشی زۆری بەندەکانی ریککەوتنامەکە لەلایەن کاربەدەستانی ئیران بەبی جیٚ بەجیٚ کردن مابووە ، وە ئەو ریگایە بگریتەبەر کە مافە رەواکانی لە خاك و ئاودا بۆ خۆی پیٚ وەربگریٚتەوە ، ئەو مافە رەوایانەی کە کاربەدەستانی ئیران چ لە سەردەمی (شا) وە یان لە فەرمانرەوایی کاربەدەستانی نۆی سەر بە خومەینی دەستیان بەسەراگرتبو . هەروەها بۆ ئەوەی یەکجارەکی بەمە سنوریك بۆ دوژمن کاری و ، دەست تیٚوەردان لە کاروباری ناو خوو ولاّت و هەرەشە لە هاونیشتمانیان دابنیت . . وە لە کاربەدەستانی ئیرانی بگەینیت کە گەلی عیراق بە ژیردەستی و ماف پیٚ شیٚل کردن و دەست بۆ دریٚژکردن رازی . نابیٚت و سەرومالی لە پیٚناوی شەرەف و سەربەرزی خۆی و دەولّەتەکەی بەخت ئەکات ، وە ئەلّبەت ئەم هەلّویستە جوامیرانەی عیراق ئەوە ناگەینیت کە چاوی لە داگیرکرن و دەست بەسەراگرتنی خاکی خەلّکی ترە ، بەلّکو تەنیا بۆ ئەوەیە کە کاربەدەستانی ئیران هەست بەم راستی یە بکەن و تیٚ ی بگەن کە دان پیانان بە مافە رەواکانی گەلی عیراق ، تاکە هۆی چەسپاندنی بناغەی پتەوی بنیات نانی پیٚوەندی برایانەیە لە نیٚوان عیراق و ئیران داو لەسەر بنچینەی بیروباوەری دراوسیٚتی و دابین کردنی بەرژەوەندی هاوبەشی نیٚوان هەردوو گەل ولاّت دا ٥



# هەندێ بەڵگە نامەی عێراق بۆ ئێران

**کۆماری عێراق**
**وەزارەتی دەرەوە**
**دەوڵەتانی دووەم**
**ژمارە – هاوسێی – ٥ – ١ – ٧ – ٩٢٩١١**
**بەغداد ٣١ – ٨ – ١٩٨٠**

وەزارەتی دەرەوە سڵاوو ڕێز پێشکەش بە باڵیۆزخانەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە بەغدادا دەکات ، دەیەوێ ئاگاداری بکاتەوە کەوا قۆمسێری ئێران لە سۆسنکرۆدا نیەتی راستگۆیی ئیلتزامکردن بەراستیو ئەو ڕێکەوتننامانەی لە نێوان هەردوو وڵاتدا مۆرکراوون نیە ، ئەمەش لە میان سوربوونی جێگری قۆمسێری ئێران لە ناوچەکەدا ، لە خۆشاردنەوە لەراستیداو نکۆڵکردنی ڕووداوی دەستدرێژی کردن ، کە لەوەختی رۆژدا ڕوویداو رۆژانی ٢٧ – ٢٨ – ٧ – ١٩٨٠ دووبارە کرایەوە . وەبوونی پاشماوەی تۆپ بارانکردنی ئێشکگەی هەردوو ناوچەی (حلفایة)و (شیب)ی عێراق لەمیان دیتنەوەی پێنج قەزیفەی ئێرانی کە هێشتا لە ناوچەکەدا نەتەقیونەتەوە . ئەمەو سەرەرای شێوازی وەڵامدانەوەی لەسەر ئەسڵی پەڕاوی قۆمسێریە ژمارە ٦٦٠ – ٢ – ٧٢ – ١٠٤١ – ٢٦٣ لە ١٢ – ٥ – ١٣٥٩ داو ڕازی نەبوونی بە پشکنینی هاوبەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی دەستدرێژیکردنو قبوڵنەکردنی کۆبوونەوە بە پێچەوانەی ماددەی پێنجەمو بەندی دوو لە ماددەی (١٠)وە لە ڕێکەوتننامەی مۆرکراو لە نێوان عێراقو ئێران لەمەڕ قۆمسێرانی سنوورەوە .

وەزارەت ئەم هەلەیە بە دەرفەت دەزانی سڵاوو ڕێزی خۆی دەربڕێت .

**لە جیاتی وەزیری دەرەوە**

**نامەیێك لە نوێنەری هەمیشەیی کۆماری عێراق لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا بۆ ئەمینداری گشتی . . . وەلیدوانی بەرێز وەزیری دەرەوە .**

بەپێی ئەو زانیاریانەی لە حکومەتەکەمەوە پێم ڕاگەیاندرا ، جێگای ڕێزە بەمەی خوارەوەتان ئاگادار بکەمەوە :

هەر لەو کاتەی پەیوەندیەکانی نێوان عێراقو ئێران تێکچوو ، هێزەکانی ئێرانی ئاگری ئاژاوە نانەوەی لەسەر سنووردا دادەگیرساندو هەرەشەی دەبردە سەر هاوڵاتیانو دەستیان بەهاتنەناوەو تێکدان دەکرد . وە عێراقیش رەتی دەدایەوە . ئەم

ڕوودانەش کەم‌و خۆجیی‌ی بوون‌و تا ڕۆژی ١٩٨٠/٨/٤ . کە دۆخ لەسەر سنووردا شلەژاوو ئاڵۆزتر بوو . هێزەکانی ئێرانی بۆ لێدانی ئامانجەکانی مەدەنی‌و شارە گەورەکانی پڕ لە دانیشتوانان . تۆپی قورسی (١٧٥ ملم)ی ئەمەریکی بابەت . بەکارهێنا . هەر بەردەوام بوو . هێزەکانی ئێرانی هەردوو شاری خانەقین‌و مەندەلی تۆپ بارانکردو هێزەکانی عیراقیش ناچاربوو ڕەتی بداتەوەو هەردوو شاری (قصر شیرین)و (مهران)ی ئێرانیەوە تۆپ باران بکات .

وە سەرەڕای ئەوەی هێزەکانی ئێرانی دوو شاری عیراق تۆپ باران کرد . دەست‌درێژشی کردە سەر ناوچەی (زین القوس) . کە بەگوێرەی ڕێکەوتننامەکانی نێوان هەردوو ولات‌و بەیمانی سنوورو دراوسێ‌یەتی‌ی نێوان عیراق‌و ئێران لە ساڵی ١٩٧٥ کە لە ئاکامی ڕێکەوتننامەی جەزایر کە لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥ دەکرا دووپاتی کردەوە . ناوچەیێکی سنووری عیراقیە .

دڵنیایین ئەوە دووپات بکەینەوە کەوا لەو کاتەی عیراق داوای ئاسایش‌و هێمنایەتی لەم ناوچەیەدا دەکات . لە هەمان کاتیش‌دا بەرامبەر هەرجۆرە دەست‌درێژی‌کردنێك یان هەرەشەیێکی چەکداری‌ی دەوەستێت کە دژی خاکەکەی یان هاوڵاتیانی بکرێت . وە بەگوێرەی مافی بەرگری‌کردنی ڕەوایی کە یاسای دەوڵەتانەوە بڕیاری لەسەر داوە ، وە دڵسۆزانە ئاواتەخوازە کە دەسەڵاتدارێتی ئێران هەموو ئەو کارانەی کە دەبێتە هۆی ئاڵۆزی نێوان هەردوو ولات بخەنە ئەولاوەو واز لە ڕێزنەگرتنی ئیلتزاماتی دەوڵەتانیەوە بهێنێت .

داوا لە بەڕێزتان دەکەم دەقی ئەم نامەیەو لێدوانی بەڕێز وەزیری دەرەوەی کۆماری عیراق کە لەگەڵی دایە ، وەکو بەڵگەنامەیێکی ڕەسمی لە بەڵگەنامەکانی ئەنجومەنی ئاسایش‌و کۆمەڵەی گشتی ، دابەش بکەن .

لێدوانی بەڕێز وەزیری دەرەوە :

سنووری نێوان عیراق‌و ئێران لە پرۆتوکۆلی «قسطنطنیة»دا کە لە ساڵی ١٩١٣ بەسترابوو و لە کۆبوونەوەکانی قۆمسیرە سنوورییەکانی تورکی‌و فارسیدا کە لە ساڵی ١٩١٤دا مۆرکرابوو دیارکراوە .

وەلەم بەڵگەنامانەدا سنووری نێوان هەردوو ولات دیارکرابوو ، وەبۆ ئەمەش «١٢٥» پێزەی سنوور دانرا ، بەڵام ئێران ، وە لەزۆر کات‌دا ، دەستی بەسەر ناوچەی سنووریی سەر بە عیراق‌دا دەگرت‌و ئێشکگەکانی بۆ ناوخۆی خاکی عیراق پاڵ‌دەداو سوودی لە کێشە ناوخۆیی‌یەکانی عیراق‌و بێ‌هێزی حکومەتەکانی یەك لە دوای یەکی وەردەگرت .

ناخۆشترین دۆخ لە سەردەمی شابوو تاکو ڕێکەوتننامەی جەزایر لە ئازاری «١٩٧٥»ەوە هاتەگۆڕی‌و لەسەر نەخشەدانانەوەی سنووری زەمینی‌ی بەگوێرەی پرۆتوکۆلی «قسطنطنیة»و کۆبوونەوەکانی قومسیرانی سنوور ڕێك‌کەوتین . وە هەردوو لا هاوبەش دەستیان بەداناوەی نەخشەی سنوور کردو سەرلەنوێ پێیزە سنوورییە کۆنەکانیان دامەزراندنەوەو «٥٩٣» پێیزەی تری نوێشیان . بە درێژای هێڵی سنوور . بۆ مەبەستی وردکاری‌و زیاتر ڕوونکردنەوەو بەرگومان نەکەوتنی ڕێچکەی نێوبراو . لە نێوان پێیزە کۆنەکان خستە سەرو ناوچەی سنوور پشکێنراو هێڵی سنوور لەسەر نەخشەی نوێ‌دا دانرا . وە ئەم هەموو شتەش لەرووی لایەنی سیاسی‌و یاسایی و هونەرییەوە بە ڕێکی‌و دروستی کرا . وە پەیمانی سنوورو دراوسێ‌یەتی لە بەغدادا لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ مۆرکراو هەردوو ولات لەسەری ڕازی‌بوون‌و بەڵگەنامەی ڕازی‌بوونیش لە تاران‌دا لە ٢٢ی حوزەیرانی ساڵی «١٩٧٦»ەوە ئاڵوگۆڕکران .

ئەنجامی ئەم هەموو شتە ، عیراق ڕووبەری زەوی‌وزاری سنوور کە ئێران دەستی بۆ درێژکردبوو گەڕاندیەوەو تەنیا کارەکانی دانەوەو وەرگرتنەوە مابوو ، شۆڕش لە ئێران‌دا بەرپابوو ، وەحکومەتی عیراقیش وای بە باش زانی هەندێ وەخت بە ڕژێمی نوێ‌ی ئێران بدات بۆ ئەوەی کاروباری خۆی ڕێك‌بخات‌و توانای تەواوکردنی کارەکانی دانەوەو وەرگرتنی هەبێت . کە چی خاکی نێوبراو بە عیراق نەدرایەوەو بەپێچەوانەشەوە ، بەتێپەڕبوونی کاتەوە نیەتی دوژمندارێتی ڕوون دەبووەوەو ڕێچکەی تەماع‌کاری‌و بەرفرەبوون لەسەر حیسابی خاکی عیراق و عەرەبی‌دا ئاشکرا دەبوو .

حکومەتی شۆڕش ، کە پاراستنی خاکی نیشتمان‌و بەرگری‌کردن لەبەرژەوەندیەکانی ولات‌دا دەگرێتە ئەستۆوە ، کەوتە بەر دۆخێکی وا ناتوانێ خۆ لەم دەست‌درێژی‌کردنە بۆ سەر خاکی نیشتمان بێ‌دەنگ بکات‌و بڕیاری نەهێشتنی‌دا .

وە لە ڕۆژی «٧»ی ئەم مانگەدا . وەزارەتی دەرەوە ڕاپورتێکی دەستنووسی دایە هەڵساو بەکارەکانی باڵیۆزخانەی ئێران لە بەغداداو تیایدا دەست‌درێژی هێزەکانی ئێرانی بەسەر ئەم خاکەو لەوەشەوە ناوچەی «زین القوس»ی ڕوون کردەوە وە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٥ و پرۆتوکۆلی نەخشە

انانەوەی سنووری نێوبراوی زەمینی‌و بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ێکچوونی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات . داوای ەست‌لێ‌بەردانی کرد . بەڵام حکومەتی عیراق هیچ وەڵامی ێ‌نەگەیشت‌و حکومەتی ئێرانیش وەڵامی داوای ڕوونکردنەوەی نەدایەوە . لەبەر ئەمەوە هێزەکانی عیراق ناچارمان هێزەکانی ئێران لەم ناوچەیەدا دەربەڕێنن

وە لە ڕۆژی هەشتی مانگدا . ڕاپۆرتێکی دەستنووسمان دایە هەڵساو بەکارەکانی باڵیۆزخانەی ئێران . تیایدا بۆمان ڕوونکردەوە کەوا هێزەکانی عیراق لەبەر هەڵوێستی ئێرانەوە ناچار بوون بە ئەرکی خۆیان هەڵبسن‌و هێزەکانی ئێران لە ناوچەی «زین القوس»دا ڕابپەڕێنن . ئاواتەخوازین حکومەتی ئێران . بۆ دوورکەوتنەوە لە فراوانبوونی ئاژاوەنانەوە لە نێوان هەردوو وڵاتدا ، کەڵك لەمەوە وەربگرێت‌و دەست لە خاکەکەی تریش بەربدات .

وە هەر بۆ دوورکەوتنەوەی ئاڵۆزیشەوە . لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا . ئەوەمان بۆ هەڵساو بەکارەکانی ئێران ڕوونکردەوە کەوا ڕەنگە بەرپرسیارانی ئێران . زانیاری هەواویان لەهەنگاوەکانی پاش ڕێکەوتننامەی جەزایرەوە نەبێت‌و دەرنەکەوتبنە سەر ئەو ڕێکەوتننامانەی کە مۆرکراون‌و ڕاستی‌ی ناوچەکانی عیراق کە بەردەستی‌درێژی‌کردنەوە کەوتوون . بەهۆی دۆخەکانی ئێرانەوە جا لەبەر ئەمەوە داوایان لێ‌ دەکەین . بۆ ئەوەی بەرهەڵە نەکەون . لەگەڵ دەزگاکانیان بکەونە وتووێژکردن‌و زانیاری لەم بارەیەوە وەربگرن . بەڵام وەزارەتی دەرەوە هیچ وەڵامێکی لەمەڕ ڕاپۆرتە دەستنووس‌و ڕوونکردنەوەکان لە ئێرانەوە وەرنەگرت .

حکومەتی عیراق قەت تەمای ئەوەی نیە شەڕ لە نێوان هەردوو وڵاتدا دابگیرسێ‌و مەبەستی ئاژاوەنانەوەشی نیەو . بە تەنگەوەی پاراستنی ئاسایشە لەم ناوچەیەی جیهاندا . بەڵام سوورێشە لەسەر بەرگری‌کردنی لە خاکی نیشتمان‌و نەهێشتنی دەست‌درێژی‌کردن بۆ سەر ناوچەکانی سنوورییەوە لەلایەن حکومەتی ئێراندا .

هەروەها دەیەوێ‌ ئەوە ڕوون بکاتەوە کەوا بەرپرسیارانی ئێران بەم هەڵوێستە دوژمندارێتی‌یە بەرفرەوایەلە بەرامبەر بە عیراق . هێزی چەکداریان . بەبێ‌ هیچ‌و خۆڕاییەوە دەخەنە بەرئاگرەوە . عیراق شەڕخواز نیەو هیچ تەماعیشی لە خاکی ئێران دا نیە ، بەڵکو دەیەوێ‌ ئەم دەست درێژی‌کردنە سەر خاکی نیشتمان لابەرێت .

ئێمە داوا لە بەرپرسیارانی ئێران دەکەین . پێش ئەوەی خۆیان لەم بەزمەوە وەربدەن . باش بیربکەنەوەو خۆیان لە هاری‌ی‌و ڕەگەز پەرستیەوە پاك بکەنەوە . پاڵپێوەنانی هێزەکانی چەکدار لەم بارودۆخەدا لەوانەیە لەباری‌ی کێشەکانی ناوخۆیی‌و بۆ ئەوەی تەنیا هێزەکانی پاسەوان دەسەلاتداریتی لە وڵاتەوە بگرێتە دەستەوە . بە دوور نەگیرێت .

ئێمە داوا لە گەلانی ئێران . . گەلی عەزەب لە عەرەبستان و گەلی کوردو گشت دڵسۆزە بە ئابرووەکانی گەلانی تری ئێران دەکەین . کەوا بۆ دوورکەوتنەوە لە ئەنجامەکانی بەردەوام بوونی سیاسەتی دەست درێژی‌کردنە سەر خاکی عیراق کە بەرپرسیاران لە حکومەتی ئێرانەوە پێی‌ی هەڵدەستن . ئاگادار بینەوە .

**کۆماری عیراق**
**وەزارەتی دەرەوە**
**دەوڵەتانی‌ی دووەم**
**ژمارە ٥ – ١ – ٧ ١٤٠٢٤**
**بەغداد ١٧ – ٩ – ١٩٨٠**

وەزارەتی‌ دەرەوەی کۆماری عیراق سلاو پێشکەش بە باڵیۆزخانەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە بەغدادا دەکات‌و دەیەوێ‌ پێی‌ی ڕابگەیەنێ‌ لەوەی کە کۆماری ئیسلامی ئێران دەیکات بە لادان لە ناوەرۆکی ڕێکەوتننامەی جەزایر لە نێوان عیراق‌و ئێران کە لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥ بوو . بە دەست‌تیاخستنی بەردەوامی‌ی لە کاروباری ناوخۆیی کۆماری عیراقەوەو باوەشکردنەوە . هەر لە ڕۆژانی یەکەمی گۆڕینی ڕژێمی شاوە . بۆ کەسەکانی دژی عیراق‌و دەست‌تێوەردان لە ئاسایشی ناوخۆیی‌و تێکدانی پەیوەندیەکانی دراوسێ‌یەتی . وە دەست‌درێژکردنە سەر خاکی عیراق‌و نەدانەوەی بە عیراق . کۆماری عیراق ناچار کرد . مافە ڕەواکانی خۆی لە بەرگری‌کردنی ڕاستەقینەی سەربەخۆیی‌و سەلامەتی ناوچەیی بەکار بهێنێ‌و خاکەکەی بەهێز بگەڕێنێتەوە وە لە ئاکامی لێدوانی بەرپرسیارانی‌و کردەوەکانیان بەرێزنەگرتنی ڕێکەوتننامەی ناوبراو . حکومەتی کۆماری عیراق بڕیاری‌دا کە ڕێکەوتننامەی جەزایر لە نێوان هەردوو وڵات کە لە ٦ی ئازاری

١٩٧٥ بوو ، وە پەیمانی سنووری دەولەتی و پەیوەندی هاوسی‌یەتی بەستراو لە نێوان حکومەتی کۆماری عیراق‌و حکومەتی ئیمپراتۆریەتی ئێران‌و هەر سێ پرۆتۆکۆڵە پاشبەندەکان لەگەل پاشکۆکانیدا کە لە بەرواری ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ لە بەغدادا مۆرکراوەو هەر چوار رێکەوتننامەکانی دوای پەیمان‌و پاشبەندەکانی کە لە بەغدادا لە بەرواری ٢٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥ مۆرکراوە، لەگەل نامەی نێوان‌و کۆبوونەوەکانی هاوبەش ، کۆتایی پێ بهێنێت ، دوای ئەوەی لەلایەن حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە نەبەووتەو نە بە کردە رێزی نەگیرا ، وە بەگوێرەی بەندی (چوارەم) لە رێکەوتننامەی جەزایرو ماددەی (چوارەمین) لە پەیمانی دەست‌نیشان کراودا .

حکومەتی کۆماری عیراق داوا لە دەسەلاتدارێتی حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات بەدۆخی نوێ رازی‌ببێت‌و بەکارامەیی‌و ژیرییەوە لەگەل ئەم کردەیەی عیراق بۆ سەربەخۆیی‌و مافە رەواکانی لە گشت ناوچەی زەمینی‌و دەریایی لە کەنداوی عەرەب‌دا ، هەروەك دۆخی پێش رێکەوتننامەی لە سەرەوە نێوبراوی جەزایر ، هەلس‌وکەوت بکات .

وەزارەت داوا لە بالیۆزخانە دەکات ، ئەوەی باسمان کرد بە حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە رابگەیەنێت ، وە ئەم هەلەیەش بە دەرفەت دەزانێ رێزو سلاوی خۆی بۆ بالیۆزخانە دەربېرێت .

**کۆماری عیراق**
**وەزارەتی دەرەوە**
**ژمارە ١١ - ٨١ - ٢٠ - ١٠٤٤٧**
**بەغداد ٧ - ٩ - ١٩٨٠**

وەزارەتی دەرەوە سلاو پێشکەش بە بالیۆزخانەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە بەغدادا دەکات‌و دەیەوێ ئاگادار ئەمەی بکاتەوە : -

- دەست‌درێژی‌کردنی عەسکەریی ئێران‌و بەردەوام‌بوونی دەست‌درێژی‌کردنە سەر ناوچە جیاجیاکانی عیراق بەپێی هێلی دەولەتی‌ی سنووری کۆماری عیراقەوە و لەمانە بۆوێنە ، نەك بۆ دیارکردن ناوچەی «زین القوس» و ناوچەکانی تر بە پێچەوانەی پەیمانی سنوورو دراوسی‌یەتی مۆرکراو لە نێوان هەردوو ولات لە سالی «١٩٧٥»داو یاسای دەولەتان‌و پەیوەندیەکانی هاوسی‌یەتی ، بۆ حکومەتی عیراق سەلمێندرا .

جا لەبەر ئەمەوە وا پێویستە خکومەتەکەتان بە نەهێشتنی دەستبەجی‌ی ئەم دەست‌درێژی‌کردنە بە کشاندنەوەی عەسکەرتان لەم ناوچانەی دەست‌درێژی‌کراوەتە سەر ، ئاگادار بکەنەوە .

وەزارەت ئەم هەلەیە بە دەرفەت دەزانێ کە رێزو سلاوی دەربېرێت .

**لە جیاتی وەزیری دەرەوە**

# هەندێ لە بەیاننامەکانی جەنگ

**فڕۆکەوانە ئازاکانمان تاران دەخەنە ترس‌ولەرز**

بەیاننامەو بانگەوازەکانی رادیوی رژێمی فارسی ئەو بارەی ترسنوکی‌و ناسەقامگیری‌یە گەورەیەی دەرخست کە بەشاری تارانەوەو شارە سەرەکیەکانی تردا بلاو بۆتەوە لە ئەنجامی بۆردومانی ئازایانەو بەردەوامی فڕۆکەکانماندا بۆ سەر دامودەزگا عەسکەری‌و ئابوری‌یەکانیان .

بەدرێژایی ئیشارەتی وریا کردنەوە لە رادیوی رژێمی فارسیەوە لێ‌دەهراو نەیتوانی ئەو زیانە گەورانەش بشارێتەوە و دانی بەوەدانا کە زیانێکی گەورە لە بەشی عەسکری فڕۆکەخانەی میهرئاباد کەوتوە هەروەها زیانێکی زۆر لە کارگەی نەوتی رۆژئاوای تاران‌و تەوریزو شارە سەرەکیەکانی تر کەوتون .

**هێزەکانی خومەینی شاری مەهابادیان بۆردمان کردووە**

پاریس - ٢٥ - ئا . د . ع : چەند هەواڵێکی رۆژنامەنووسی لە پاریس دووپاتیان کردووەتەوە کە هێزەکانی رژێمی فارس شاری مەهابادیان بۆردمان کردووەو نیوەیان بە تەواوەتی وێران کردووە .

رۆژنامەی لاکروای فەرەنسی بەزمانی چەند سەرچاوەیەکی کوردەکانی ئێرانەوە ووتوویەتی چەندین شاری تری کوردەکان لەلایەن هێزەکانی خومەینی‌یەوە بۆردمان کراون ئەمەیش بووەتە هۆی کوشتنی دوو سەد کەس .

پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران رایگەیاندووە کە پاسەوانەکانی خومەینی کوشتارێکی نوێیان دژی هاووڵاتی کوردەکان بەرپا کردووە لە گوندی ئەکدیهاس‌و یوسف‌کەند کە نزیکی شاری مەهابادن .

لە بەیاننامەیەکدا حزبی دەری کردوە هاتووە پاسەوانەکانی خومەینی لە چواری مانگی رابوردوودا هێرشیان بردووەتە سەر هەردوو گوندەکەو ٥٣ کەسیان لە دانیشتووانی هەردوو گوندەکە کوشتووە . کە ژمارەیەک ئافرەت‌و منداڵیان تێدایە .

٤ی کانونی یەکەم ١٩٨٠

**فڕۆکە جەنگی و هیلوکۆپتەرەکانمان هێرش دەبەنە سەر چەندین بنکەی دوژمن لەخەفاجیەو عەبادان و ئەمیرئابادو راستەوخۆ دەیانپێکن .**

• سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان رۆژی ١٨ - ١١ - ١٩٨٠ بەیاننامەی ژمارە (١٤٧) ی دەرکرد کەتیایدا هاتووە

ڕۆڵەکانی سوپای مەزنمان لەم ڕۆژە پیرۆزەدا کە تێیدا سەرکردەی شەهیدان حسین کوڕی علی سلاوی خوایان لێ بێت و هاوڕێ سەربەرزەکانی لەسەر ڕێگای هەق و بیروباوەڕ شەهیدبوون . . کوڕەزاکانی حسین کوڕی علی پاڵەوانانی هێزە چەکدارەکانمان ئەمڕۆ بۆ داکۆکی کردن لە بیروباوەڕو ئەو بەهایانە دەجەنگێن کە سەرکردەی شەهیدان لە پێناویاندا شەهید بوو ئەویش دژی دەستدرێژی ی فارسی ڕەگەزپەرستی مەجووس و لە پێناوی وەدەست هێنانەوەی مافەکانی گەل و نەتەوەو پاراستنی سەربەرزی و شکۆمەندی لەسەر سنووری ڕۆژهەلاتمان . .

ئەنجامی چالاکی ی هێزەکانمان ئێوارەی ١٧ – ١١ و سەر لە بەیانی ی ١٨  ١١ – ١٩٨٠ بەم چەشنەبووە .

زیانەکانی دوژمن : ٨٨ کوژراو . تێکشکاندنی سێ تانك و شەش ئۆتۆمبیل کە چواریان پڕ زەخیرەو تەقەمەنی بوون و نەفەربەرێکی زرێلی ئەمەو دوژمن لە ناوچەی عەبادان ویستویەتی شەڕ بە پارچەکانی سوپامان بفرۆشێت کە بە توندوتیژی پاشەکشێ ی پێ کردووەو ئەم زیانانەی لێ داوە :

١٥٠ کوژراوو ژمارەیەکی زۆری بریندار . تێکشکاندنی چوار ئۆتۆمبیل و چوار تۆپهاوێژی «١٠٦» ملم و بنکەیەکی مووشەك .

زیانەکانی دوژمن لە کەرتەکانی تر ١٨ کوژراوو تێکشکاندنی سێ تۆپهاوێژو یەك ئۆتۆمبیل بووە .

لەلایەکی تریشەوە هێزەکانمان هێرشیان بردووەتە سەر بنکە دەریایی یەکانی دوژمن لە سەرووی کەناری عەرەب داو سێ پارچەی دەریایی مام ناوەندی دوژمنیان سەرنگوم کردووە

ئەمەو فرۆکە هیلیکۆپتەرەکانمان هێرشیان بردووەتە سەر بنکەسوپایی یەکانی دوژمن لە ناوچەی خەفاجیە سووسنگرد و عەبادان و لە کەرتی باکووری بەرەی جەنگ و ئەم زیانەیان لێ داوون

تێکشکاندنی پێنج تانك و یەك بنکەی موشەك و پێکانی ڕاستەوخۆی چەندین مۆڵگەی سەربازەکانی دوژمن سەرەڕای تێکشکاندنی مۆڵگەکانی دوژمن لە نزیکی گوندی سەلمان لە ناوچەی عەبادان بەتەواوەتی و ئاگر تێ بەردانی چوار ئۆتۆمبیل و چەندین زەخیرەی کەڵەکە کراو .

ئەمەو هەموو فرۆکە هیلیکۆپتەرەکانمان بە ساغی بۆ بنکەکانیان گەڕاونەتەوە یەکێکیان نەبێت کە لەناوچەی خەفاجیە لە مەیدانی جەنگ کەوتووەتە خوارەوەو هەردوو فرۆکەوانەکەی بەساغی هێنرانەوە بۆ نێو هێزەکانی پێشەوەمان بەمەوە سەرجەمی زیانەکانی دوژمن پاش نیوەڕۆی ١٧ – ١١ و سەر لەبەیانی ی ١٨–١١ بەم چەشنەبووە . . «٢٥٦» کوژراوو – ٨ تانك و – ١٥ – ئۆتۆمبیلی هەمە چەشن کە چواریان زەخیرەیان تێدا بووەو ٧ تۆپهاوێژی هەمە جۆرو یەك نەفەربەری زرێلی و دوو بنکەی مووشەك و چەندین سنووقی تەقەمەنی و مۆڵگەی ئامێرو سەربازەکانی دوژمن و سێ پارچەی دەریایی مام ناوەندی .

زیانی ئێمەیش ٢٦ شەهید لە هەموو کەرتەکانی جەنگ و . تێکشانی سێ ئۆتۆمبیل بووە .

لەلایەکی ترەوە دوو فرۆکەی دوژمن لە کاتژمێری ٩٢٥ ی ١٨ – ١١ – ٨٠ هێرشیان هێناوەتە سەر ناوچەی فاو لە بەسرە کە هێزەکانی بەرەنگاری زەمینی تەقەیان لێ کردوون و یەك فرۆکەی – فانتۆم  یان لێ خستنە خوارەوەو ئەوی تریان هەلات .

## پاككردنەوەی محەمەرەو ئابلۆقەدانی عەبادان

پاڵەوانی ڕزگاری ی نەتەوایەتی موهیب ڕوکن صدام حسین مژدەی سەرکەوتنی مەزنی پاككردنەوەی محەمەرەو بڵند کردنەوەی ئالای عیراق بە ئاسمانی ئەو شارەدا لە جێگری سەرکردەی گشتی ی هێزە چەکدارەکان وەزیری بەرگری فەریق ڕوکنی یەکەم عدنان خیراللە وە پێ گەیشت .

ئەمەیش لە پەیوەندی یەکی تەلەفۆنیدا بوو لەگەڵ بەرێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین دا پاش نیوەڕۆی هەینی ڕابوردوو بەرێز جێگری سەرکردەی گشتی ی هێزە چەکدارەکان بۆی کردبوو .

بەرێز وەزیری بەرگری سلاوو پیرۆزبایی هێزەکانی سوپای پاڵەوانمانی بە سەرۆکی فەرماندەو سەرکردایەتی ی گشتی ی هێزە چەکدارەکان و جەماوەری گەلی عیراق ڕاگەیاند ئەویش بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنەی کە هێزە چەکدارە سەرکەوتووەکانمان بە دی یان هێنا .

سەرکردایەتی گشتی ی هێزە چەکدارەکانیش بەیاننامەیەکی دەرکرد تیایدا ڕای گەیاند کە شاری محەمەرە بەتەواوەتی لە هێزەکانی دوژمن پاك کرایەوەو ئالای عیراق بەسەر بینایەی قایمقامیەی شارەکەدا بڵند کراوەتەوە .

هەروەها لە بەیاننامەکەدا هاتووە کە شاری محەمەرە لە هێزەکانی خومەینی ی دەجال پاك کرایەوەو محەمەرە لە بەرگێکی بووکێنی ی نوێدا باوەشی بە شط العرب دا کرد . . ئا بەم جۆرە

داگیرکەرەکان لە شاری محەمەرەدا تێکشکانو ئالاًی سەرکەوتن بەسەر مەیدانو قەدوبالاًی‌دا بەرزکرایەوە ئەم سەرکەوتنە مەزنەی ڕاگەیاند کە هێزە نەبەزەکانی محەمەرە وەدی‌یان هێنا پاش ئەوەی خوێنی گەشیان لە پێناودا ڕشت .

هەروەها لە بەیاننامەکەدا هاتووە کە جەنگاوەرەکان پاڵەوانی بە جەرگ بوون لە محەمەرەدا جەنگان لە ئێمەوەو لە گەلی مەزنەوە هەموو واتایەکی چاکی ناوهێنانو خۆشەویستیو شانازی‌یان لێ‌بێت . نەمریو سەربەرزیو ڕەحمەتی خوایش بۆ شەهیدەکانمان .

## بەیاننامە مێژوویەکەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ بەرپەچدانەوەی چاو چنۆکی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی ئێران

ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕش بڕیاری‌دا فەرمان بەهێزەکانی سوپای بەجەرگمان بدرێت دەستی توند لە بنکە سوپایی‌یەکانی ئێران بوەشێنن بۆ سەرکوت کردنی پیلانەکانی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی فارس کە دەیەوێت لە قەرەی دەستەلاتی عیراق بکەوێت بەسەر خاکو ئاوی نیشتمان‌دا .

ئەنجومەن لە بەیاننامەیەکدا کە ئێزگەکانو تەلەفزیۆنی عیراق بلاًویان کردوە کە ئەم بڕیارە بۆ وەلاًمی بەردەوام‌بوونی فەرمانڕەوایانی ئێران کوڕەزاکانی مەجووسی‌یەکان لە کارەسوپایی‌یە کوێرانەکەیان‌داو هەوڵدانیان بۆ لە کارخستنی کەشتی‌ڕانی لە شط العرب و لە کۆتایی‌یەکانی‌دا کە دەچنە سەر هێڵی کەشتی‌ڕانی لە کەناری عەرەب‌داو هەڵمەتی ئاسمانی چڕو فراوانیان بۆ سەر سوپای پاڵەوانمان و ڕاگەیاندنی نەفیری گشتی و ئاسمانی ئێران بەستن ئەو کارەی کە ئەوە دوویات دەکاتەوە کە ئەوان بازنەی بەربەرەکانی‌ی سوپایی‌یان فراوان کردووەتەوە .

بەیاننامەکە ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە هێزەچەکدارەکانی عیراق لەو زەوی‌وزارەی ئێران دەکشێتەوە کە کارڕێکخستنی داکۆکی سوپایی و ئاسایشی سوپایمان وا پێویست دەکات تیایدابن تەنیا بەوەی کە ئێران ددان بە دەستەلاتمان‌دا بنێت بەسەر خاکی خۆمانداو ڕێزی بەرژەوەندی‌یە – زیندووەکانمان بگرێت .

بەیاننامەکە داوای لە ئەفسەرو سەربازە ئازاکانمان کردووە بەبەزەیی بن لەگەلً ئەوانەی خۆبەدەستەوەدەدەنو توندوتیژبن لەگەلً ئەوانەی مل‌هوڕێتی مێشك‌وبینایی کوێر کردوون .

ئـەمـەی خـوارەوەیش دەقی بەیاننامەکەیە : –

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان .

بەیاننامەیەك لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕشەوە .

ئەی گەلی مەزنی عیراق جەماوەری نەتەوەی نەبەردی عەرەبمان .

لەو باوەڕەدابووین کە تاقمە فەرمانڕەواکەی ئێران لە پەندەکانی ڕۆژانی ڕابوردوو سوود وەردەگرن پاش ئەوەی هێزە چەکدارە. نەبەزەکانمان خاکی داگیرکراومانیان لەسەر سنووری ڕۆژهەلاًتی عیراق ڕزگارکردو پاش ئەوەی دەستەلاًتی نیشتمانی بەسەر شط العرب دا گەڕایەوە بەلاًم کوڕەزاکانی مەجووسی‌یەکان ئەوانەی لە کۆنەوە ڕقیان لە عیراقو نەتەوەی عەرەب هەڵگرتووەو دەستیان لە نەخشە گومان لێ‌کراوەکان‌دا هەیە لە بێ‌مێشکێتی‌ی خۆیانو کارە دژە سوپایی‌یە کوێرانەکەیان‌دا بەردەوام بوونو لە دوو ڕۆژی ڕابوردووداو لە ئەم ڕۆژەش‌دا چەند هەوڵێکیان دا بۆ ئەوەی هێڵی کەشتی‌ڕانی لە شط العرب و لە کۆتایی‌یەکانیدا لە کاربخەن ئەوانەی دەچنە سەر هێڵی کەشتی‌ڕانی لە کەناری عەرەب‌دا ئەویش بە بۆردومان کردنی کەشتی‌یە ناسوپایی‌یە

عیراق و بێگانەیانە کە دێنە شط العرب و
لێی دەچنە دەرەوە هەروەها هێرشی
ئاسمانی زۆرو فراوانیان کردووەتە سەر
سوپای پاڵەوانمانو نەفیری گشتی یان
راگەیاندووەو ئاسمانی ئێرانیان بەستووە ئەو
کارەی کە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەوان
بازنەی بەربەرەکانی ی سوپایی یان فراوان
کردووەتەوەو باریان گەیاندووەتە رادەی
جەنگی فراوان لەبەر ئەوە ئەنجومەنی
سەرکردایەتی ی شۆرش بریاری دا فەرمان
بەهێزە بەجەرگەکەمان بدرێت دەستی
توندوتیژ لە بنکە سوپایی یەکانی ئێران
بوەشێنن بۆ سەرکوت کردنی نەخشەکانیانو
نەخشەکانی گەورەکانیان کە دەیانەوێت
خۆ لە قەرەی دەستەلات و ئاسایشی عیراق
مەزن بدەن .

ئەی هاوولاتی یە بەجەرگەکانی عیراق
ئەی کورەزاکانی علی کوری ابی طالب و
عمرو حسینو صلاح الدین ئەیوبی و
مثنی . . ئەی سوپای پاڵەوانی عیراق ئەی
روخساری عیراقو ئەی شانازی ی
نەتەوەی عەرەب ئەی کورەزایانی مثنی
وسعد کوری ابی وقاص و قەعقاع و خالد
کوری ولید . . ئەوەتا سەرلەنوێ ئالای
قادسیەو شکۆمەندی ی پەیامە ، عیراق و
عەرەب داویانەتە دەستتانو خستویەتە
ئەستۆتانەوە . . ئێمە لەوە دلنیایشین کە
ئێوە شایانی ئەوەن و ئەمانەتەکە دەپارێزنو
دەستەلات و شەرەف و رەوشتی خاکو
گەلو مێژووی پیرۆزتان دەپارێزن .

ئەی ئەفسەرو سەربازە پاڵەوانەکان
بەبەزەیی بن لەگەڵ ئەوانەی کە
خۆبەدەستەوە دەدەنو توندو تیژبن لەگەڵ
ئەوانەی مل هوریتی مێشكو بینایی کوێر
کردوون . .

ئەی گەلی مەزنی عیراق
ئەی رۆڵەکانی نەتەوەی نەبەردی عەرەب
ئەی رۆڵەکانی ئێران لە هەموو نەتەوەو
ئایینو تایەفەیەك . . ئێمە مەبەستمان ئەوە
نەبوو زیانتان پی بگەیەنینو هیچ
تەماحیکیشمان بە خاکی ئێوە نی یە بەلام
خومەینی ی ستەمکاری دەجالو
دەستەودایەرەکەی ویستیان بیکەنە
جەنگێکی ستەمگەری دژ بە ئێمە رقێکی
بێبیانوو و نەزانراو بەرانبەر بە عیراق و
نەتەوە پاڵی پێوە ناوونو ویستیان پیلان بۆ
عیراق و نەتەوە دروست بکەن (انهم
یکیدون کیدا واکید کیدا) – صدق الله
العظیم – .

تاقە گومان لێکراوو پاشکەوتووەکەی
خومەینی سەرەرای کارە وێرانکاری یەکانی
دژ بە ئاسایشی عیراق ئەوا دەستی لە
دەستەلاتی عیراق بەسەر زەوی و خاك و
ئاوی نیشتمانی ی دا وەشاندووە لە شط
العرب و قەڵەمرەوی لە کەناری عەرەب
مافەکان و دەستەلاتی نەتەوەی عەرەب و
ئاسایشی ، ویستیشیان پیلان بۆ عیراق
دروست بکەن بە کارە سوپایی یە
دوژمنکاری – یەکانیان ئەمرۆو دوێنی و
پێری هەروەها ئێمەیش -چۆن بووین فەرمان
بەهێزە چەکدارەکانمان بدەین کاری سوپایی
توندوتیژ بە ئەنجام بدەن بۆ وەلامی
کارەدوژمنکاری یە ترسناکەکانیان کە دژی
هێزەچەکدارەکانمان و دەزگاکانی
ئابووریمانو هێڵەکانی کەشتیرانیمان
ئەنجامیان دا . ئێمە نامانەوێت دەست لە
جێگا مەدەنی یەکان بوەشێنین ئەو کاتە
نەبێت کە لایەنی ئێرانی لە دەست وەشاندن
لە جێگا مەدەنیەکان بەردەوام بوو لەو
زەوی وزارەی ئێرانیش دەکشێنە دواوە کە
کارریکخستنی داکۆکی کردنی سوپاییمان و
ئاسایشی سوپا پێویستییان پێیەتی تێیدا بن
تەنیا بەددان نانی ئێران بە مافەکانی
دەستەلاتداریتی لەسەر خاکمانو ریزگرتنی
بەرژەوەندی بەزیندووەکانمان

ئەی گەلی مەزنی عیراق
ئەی رۆڵە ئازاکانی هێزە
چەکدارەکانمان . . بەیارمەتی خودا بە ئێوە
سەردەکەوین وەك چۆن لە جەنگەکانی
پێشوودا سەرکەوتین و دەست درێژ کەر
داگیر کەرەکان ژێردەکەون ئیتر سلاوتان
لێبێت .

صدام حسین
سەرۆکی ئەنجومەنی
سەرکردایەتی ی شۆرش
فەرماندەی گشتی ی هێزە
چەکدارەکان لە ٢٢ ئەیلوولی
١٩٨٠ دا .

[redacted]

# هەندێ لە بارەی پەیوەندیە کانی عیراق بە ئێرانەوە

● هەر لەکاتی بەرپابوونی شۆڕشی پیرۆزی عیراق لە ١٧ ی تەمموزی ساڵی «١٩٦٨»ەوە ، ئەوەی هەردوو رژێمی پێشوو و ئێستای نەزانو بۆگەن لە ئێراندا ، بۆ هێنانەدی خەونە بێ سنوورەکانیانو داگیرساندنی ئاگری بەگوڕی ئاژاوەنانەوەو داگیرکردنی خاکی پیرۆزی نیشتمان ، دەیکەن ، لاپەڕەیەکە لە نەخشەی پیلانگێڕانی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستان دژی عیراقی شۆڕش بۆ ئەوەی خۆی بدات بەدەستەوەو بچێتە ڕیزی ولاتە سەرشۆڕو بێدەسەلاتەکانەوە ، ئەوسا هێدی هێدی ، بۆ بەرژەوەندی هێزە خوێنمژو چەوسێنەرەوەکان ، سمێڵی خۆی بە خێراتی ئابووری ولات چەوربکاتو گاڵتە بە داخوازی جەماوەر بکات !!

ئەو ئەرکانەی بە هەردوو رژێمی پێشووو ئێستای ئێران راسپێردراوەیەکە رێبازی سیاسی رژێمی خومەینی رەگەزپەرست ، لە بواری پەیوەندی لەگەڵ عیراقدا ، بەردەوامیو کشتاندنەوەی ڕێبازە پێشووەکەی شای گۆڕبەگۆڕ چووی بەکرێگیراو پێك دێنێن ، جا چ لەبارەی دەستدرێژیکردن بۆ سەر گەلو شۆڕشەکەی ، چ بۆ داگیرکردنی خاکەکەی ، یان دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆیی ولاتدا بێت .

جا بەم جۆرە جلەوی سیاسەتی حکومەتەکانی ئێران بەرامبەر بە عیراق پڕ لە رقو کینەو دوژمندارێتی ی بەردەوامەو رێزنەگرتنی بێ شەرمی ی پەیمانو بەڵگەنامەو یاساکانی دەوڵەتانەوەیە .

هەمیشە ئێران لەگەڵ عیراقدا مـــــێژوویـــــکی دووردرێژی دەستدرێژیکردنو هەڕەشەبردنە سەر سنوورو دێهاتەکانیە . زنجیرەیێکی پڕ لە تەماعکاریو هیواو خواستی بۆگەنی [illegible]نە چارە . ئەم دوژمندارێتیەش تەنانەت لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ بەردەوامە ، بەڵکو بەرەو زیادبوونە ، بەگوێرەی پێویستیەکانی سیاسەتی ئیمپریالیزمو زایۆنیستو کۆنەپەرستان لەم ناوچەیەدا لە دژ بەرزبوونەوەی دەنگی نەتەوەیی شۆڕشگێڕی ی گەلی عیراق نەبەزو خەباتگێر .

جەنگە درێژخایەنەکانی نێوان دەسەلاتدارێتی عوسمانلیو دەوڵەتی فارسەکان ، هەمیشە عیراق کۆچی قوربانی بووەو ، هەروەها خاکەکەشی گۆڕەپانی شەڕ ، وە هەر لەو کاتەی عیراق سەربەخۆیی وەرگرت ، کێشەی نێوان هەردوو دەوڵەتو زێدە رقو کینەی فارسی بوو بە میراتی . ئەوەبوو کە لە (٤) ی تەشرینی یەکەمی ١٩١٣ دا پرۆتۆکۆلی تاران بەستراو سنووری عوسمانلی – ئێرانی دیارکراو دەوڵەتی عوسمانلی مافە ڕەواکانی عیراقی کردە خۆراکی دەمی چاوبرسیو دەست درێژانی ئێران تا بە ناچاری لە ٢٩

بکات . له ئه‌نجام عیراق رازی بوو به‌وه‌ی که کێشه‌که بخرێته به‌رده‌م «دادگای دادی ده‌وڵه‌تان»ه‌وه له ساڵی ١٩٣٥ . به‌ڵام ئێران – هه‌روه‌کو جاران ناره‌زایی خۆی ده‌ربڕی خۆی خسته سه‌رپشت‌و گوێ نه‌دان .

وابوو له ٤ی ته‌مموزی ساڵی ١٩٣٧ دا . په‌یمانێك له تاران به‌سترا عێراق «عصبة الامم»ی به‌به‌ستنی په‌یمانه‌که‌و کۆتایی پێ‌هێنانی ناکۆکی نێوانیادا . ئاگاداری کرد . وه له‌شه‌شی ئاداری «١٩٣٨ ، عێراق به‌شێوه‌یه‌کی ره‌سمی په‌یمانه‌که‌ی مۆرکرد . به‌ڵام ئێران هه‌نده‌ی نه‌برد هه‌روه‌کو پێشو . بیانوی ده‌دۆزییه‌وه بۆ هه‌لوه‌شاندنه‌وه‌ی په‌یمانه‌که‌و په‌ره‌سه‌ندنی ناخۆشیو ناکۆکی له‌نێوانیاندا . له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش‌دا . عێراق هه‌میشه هه‌وڵی دۆزینه‌وه‌ی چاره‌سه‌رکردنێکی ره‌واو راسته‌قینه‌ی . کۆتایی پێ هێنانی کێشه‌کانی له‌گه‌ڵ ئێران‌دا ده‌دا .

ئه‌وه‌بوو له (١١) ی ته‌مووزی ساڵی ١٩٦٩ له راپۆرتێك‌دا بۆ ئه‌نجومه‌نی ئاسایش عێراق ئاماده‌یی خۆی ده‌ربری که جارێکی تر مه‌سه‌له‌که بخرێته به‌رده‌م دادگای دادی ده‌وله‌تانه‌وه . که‌چی ئێران سوور بوو له‌سه‌ر ناره‌زایی خۆی به‌رامبه‌ر به‌م کاره .

به‌رپابوونی شۆرشی (١٧) ی ته‌مووزی ١٩٦٨ به‌سه‌رکردایه‌تی پارتی به‌عسی عه‌ره‌بی سۆشیالیست . شای گۆربه‌گۆر چوو . زیاتر هه‌نگاوی دوژمنداریی و ئاژاوه نانه‌وه‌و ده‌ست‌درێژی کردنه سه‌ر گه‌ل‌و شۆرشی‌و خاکی عێراق هاویشت . بێ‌گومان ئه‌مه‌ش ده‌گه‌رێته‌وه سه‌ر چه‌ند هۆیه‌ك . که گرنگه‌که‌یان ئه‌وه‌یه که‌وا شاو چڵکاو خۆرانی‌و سه‌ردارانی له‌زایۆنستی رووره‌ش‌و ئیمپریالیزمی ئه‌مه‌ریکا ، که‌وتنه بیری ئه‌وه‌وه که عیراق به توانای به‌شه‌ری‌و ماددی‌و مێژووی دوورو درێژی خه‌باتی بێ‌وچانیه‌وه ، گه‌ر هاتوو سه‌رکردایه‌تی‌یه‌کی دلێرو دڵسۆزو حه‌کیمانه‌ی بۆ هاته کایه‌وه . ئه‌وه ده‌بێته قه‌ڵای شێران‌و خه‌ونه نه‌خۆشه‌کانیان ره‌ش‌ده‌کاته‌وه‌و سه‌ره‌ولێژیان ده‌کات . وه ئه‌بێته بنکه‌ی راپه‌ڕینی په‌ره‌سه‌ندنی نه‌ته‌وه‌ی عه‌ره‌ب . ئیتر ده‌رفه‌تی ئه‌وه نادرێت جارێکی ترکاربه‌ده‌ستانی ئێران‌و گه‌وره‌کانی دانی خۆیان بۆ گۆشتی عیراق چه‌ور بکه‌نه‌وه .

جا به‌م جۆره دوژمنا یێتی‌یان به‌رامبه‌ر به عیراق زیاتر کردو زیاتر ده‌ستیان بۆ خاکی زێرینی وولات درێژکرد ، بێ ئه‌وه‌ی ئه‌وه بێ‌بگه‌ن که ئه‌نجامی ده‌ست‌درێژی‌کردن ، ده‌ست برین‌و روو ره‌شی‌یه . ئه‌وه بوو به مه‌به‌ستی لاوازکردنی حکومه‌تی شۆرش له عیراق‌دا ، به چه‌ك‌و جبه‌خانه‌و چه‌ته‌و پاره ، وه به یارمه‌تی ئیمپریالیزمی ئه‌مه‌ریکاو زایۆنستی ره‌گه‌زپه‌رست‌و هه‌نده‌ێ لایه‌نی کۆنه‌په‌رستانی عه‌ره‌ب ده‌ستیان کرد به هه‌ره‌شه‌کردن‌و جم‌وجۆڵ دژی عیراق سه‌ربه‌خۆو پێشکه‌وتنخواز سه‌ره‌نجام نه‌یانتوانی ویستی جه‌ماوه‌ر شلۆق بکه‌ن‌و خه‌ونه بۆگه‌نه‌کانیان به‌جێ‌بگه‌یه‌نن . وه عیراق بتوانی ئازایانه له به‌رده‌م ئه‌م دوژمندارێتی‌یه بوه‌ستێ .

ئه‌وه بو له اری ساڵی ١٩٧٥ رێکه‌وتنێکی تازه له شاری جه‌زایر مۆرکرا له نیوان عیراق‌و ئیران بۆ چاره سه‌رکردنی کێشه‌کانی سه‌ر سنووری هه‌ردو وولات وه به گوێره‌ی ئه‌م رێکه‌وتنه نه‌خشه‌ی تازه داندرا له سنووری هه‌ردو وولات له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش‌دا ئێران مایه‌وه سه‌ر دۆخی جارانی خاڵه‌کانی رێککه‌وتنامه‌که‌ی به‌جێ نه‌هێناو وه له‌هه‌مان کاتیش باری ناوخۆی ئێران به‌ته‌واوی گۆڕاو تاقێکی ناله‌باری حکمداری نوێ جێگای تاقه به‌کرێ گیراوه‌که‌ی «شا» یان گرته‌وه .

عێراق بۆ ئه‌وه‌ی رژێمی نوێ ئێران خۆی ببینی‌و کاروباری خۆی رێك بخا . وای به باش زانی هه‌ندێ وه‌ختیان بداتی‌و تۆزێ چاوه‌ڕوان بکات . به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا شایه نوێ‌یه‌کانی ئێران له برێتی ئه‌وه‌ی به چاوی بینینی عێراقه‌وه سه‌یری مه‌سه‌له‌که بکه‌ن . کلکی خۆیان . به سه‌رۆکایه‌تی خومه‌ینی‌یه‌وه خسته سه‌ر پشت‌و درتر به چاوی دوژمنداریێتی‌یه‌وه رووبه‌رووی عێراق هاتن .

جا ئه‌م هه‌ڵویسته پیلانگێرو ره‌گه‌ز په‌رستی‌یه‌ی چڵکاوخۆرانی ئێران . وای له عیراق شۆرش کرد برپاره مێژوویه ره‌واکه‌ی بدا بۆ گه‌راندنه‌وه‌ی ته‌واوی سه‌ربه‌خۆیتی نیشتمانی‌ی به‌سه‌ر ئاوو خاکی‌یه‌وه‌و کۆتایی به رێککه‌وتنامه‌ی جه‌زایر بهێنی .

بۆ گه‌رانه‌وه‌ی هه‌موو جۆره مافێکی ره‌وای سه‌ر به‌خاك‌و زه‌وی‌و ئاو که ئێران زه‌وتی کردبو به ناحه‌ق‌و بێ شه‌رمانه . ئه‌مه‌یه رێبازی سیاسه‌تی حکومه‌ته‌کانی ئێران به‌رامبه‌ر به عێراق ئه‌م سیاسه‌ته که زنجیره‌یێکه له دوژمنداریه‌تی‌و رێز نه‌گرتنی به‌ڵگه‌نامه‌و یاساکانی ده‌وله‌تان‌و حورمه‌ت نه‌گرتنی سه‌ر به‌خۆی وولاتان .

# سەردەمی مووشەکی بلیمەت

مووشەکێکی نوێ دێتە کایەوە بەبێ ئەوەی سەر بکات بیتانە دەپێکێت و دەتوانێت نیشانەی ڕاستەقینە لە درۆکینە جودا بکاتەوە وا باسی دەکەن کە شۆڕشێکە لە هونەری جەنگدا چونکە زۆر لەو بۆچوونە سوپایی یە باوانەی ئێستا دەگۆڕێت

● مکرم رشید تالەبانی ●
کردوویەتی بە کوردی

● لەوە دەچێت سالآنی هەشتاکان کێ بەرکێیەکی خۆچەکدارکردن لە نێوان هەردوو دەوڵەتی زەبەلاحی جیهاندا بە خۆوە ببینن ، کە لەوەوپێش وینەی نەبووبێت . تەنیا ئەمریکا لە پێنج ساڵی داهاتوودا تریلیۆنێك دۆلار بۆ خۆچەکدارکردن خەرج دەکات ، واتە بلیۆن بلیۆن دۆلار (۱٬۰۰۰٬۰۰۰٬۰۰۰٬۰۰۰٬۰۰۰ دۆلار) . شتێکی ئاشکرایشە یەکێتیی سوڤیەت لە خۆچەکدارکردن دوا ناکەوێت .

هەروەها ، لە هەشتاکاندا ، هونەری جەنگ ، بازدانێکی چەشنەکیی زۆر فراوان بە خۆیەوە دەبینێت ، بە بەرەو سەردەمی سیلیکۆن و کۆمپیوتەر و ئەلکترۆنیی دەبات . هەروەها بەرەو بۆچوون و شێوازی نوێی (ستراتیژیەت و تەکتیك)ی دەبات .

ئەم سامانە زۆرەیش بە دوو لادا خەرج دەکرێت : یەکەم ، پتر بەرهەمهێنانی مووشەکی ستراتیژیانەی کیشوەربڕ سەرەرای فڕۆکەو تانك و کەشتی ، دووەمیش ، کە زۆر گرنگ و زۆر ترسناك و لە ڕابوردوو زۆرتری تێدەچێت ، ئەویش بەرهەمهێنانی مووشەکی تەکتیکیی «زیرەك»ە کە زیرەکیی دەگاتە پلەیەك ، هونەری جەنگ ، ئەوەی تا ئێستا باوە ، هەڵوگێڕ دەکات .

ئەوەبوو جێگری وەزارەتی بەرگری ئەمریکا ولیەم بیری وا باسی ئەم چەکانەی کردووە کە : «شۆڕشێکن ، لە هونەری جەنگدا» .

چونکە ، دەتوانرێت ئەم مووشەکە نوێیانە لە دەریاوە یان لە زەمینەوە یان لە ئاسمانەوە بتەقێنرێن . دەشتوانن بە هەموو ووردییەك بگەنە نیشانە دیاریکراوەکانیان وەك بڵێیت چاوی ئادەمیزاد ڕابەرییان دەکات . بە هەموو لایەکیشدا بە دووی نیشانەکانیان دەکەون . هەرچەندە خێراو تیژڕەو بن ، هەلی هەڵاتن یان دەربازبوونیان پێنادەن ، تا تێکیان دەشکێنن . پتر لەمەیش ، ئەم مووشەکانە بە تیژڕەوییان و دەزگای هەستکەری پەرەسەندوویان و گورج شیکردنەوەی هەر هەمایەك بۆ ئەوەی ڕێگای ڕووتێکردن بگۆڕن ، وایان لێدەکات ، پێویستیان بە هیچ ئامۆژگاری یان ڕێنوێنییەك نەبێت لە بنکەی تەقاندنیانەوە ئاراستەیان بکرێت ، چی فڕۆکەی جەنگی بێت ، یان هیلیکۆپتەر ، یان کەشتی ، یان تانك ، یان لە بنکەی ڕاوەستاوەوە بێت ، چونکە خۆیان توانای ئەوەیان هەیە ڕوو بکەنە نیشانی مەبەست ، بێ ئەوەی لە بنکەوە ئاراستە بکرێن .

بە پشتبەستن بەم چەشنە نوێیەی مووشەك ، ئەوا ڕێڕەوی سوپایی جێ پەنجەی خۆی لە بیرکردنەوەی سوپایی و بۆچوونی ئێستای سوپاییدا ، سەبارەت بە شێوازی بەکارهێنانی تانك و فڕۆکەی جەنگی لە پاشەڕۆژدا ، بەجێدەهێڵێت . چونکە شارەزایانی ستراتیژیەت لەو باوەڕەدا نین ئەم مووشەکانە سەربەخۆییەکی خودی جیاواز لە چەکەکانی تر بۆ خۆ وەدیبهێنن . بەڵام لەو باوەڕەدان هەندێك ئەرکی فڕۆکە ، وەك

جەنگی ئاسمانی ی نێوان فڕۆکەکان . یان بە شێوەیەکی نزم فڕین . بۆ خۆ وەربگرن . هەروەك چۆن پسپۆڕێکی سوپایی دەڵێت : لە پاشەڕۆژدا فڕۆکە وەکوو لۆرییەکی ڕاوەستاوی لێ دێت بۆ هەڵگرتنی مووشەكو تەقاندنیان تا ئەرکە سوپایییەکانیان بەدی بهێنن» هەروەها . لەوانەیە مووشەکی دوارۆژ هەڕەشە لە پاشەڕۆژی تانکی قورس بکات ئەویش لەبەر ئەوەی بە ئاسانی تێکی دەشکێنێت .

ئێستایش لە ئەمریکا زۆربەی تۆژینەوە تەکنۆلۆژییەکان سەبارەت بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیایە لە دروست کردنی ووردترین ئامێری ڕاوکردنی ئەو نیشانانە کە مەبەستن لەگەڵ ئەو **مووشەکانەی** هەڵیان گرتوون . پەنتاگۆن هانی کۆمپانیاکانی ئەمریکا دەدات‌و هەموو گەنجینەی ئەمریکاو تواناکانی ئەمریکای لە بەردەم‌دا کردوونەوە بۆ ئەوەی بە زووترین کات ئەم چەکانە بەرهەم بهێنن . بۆیە وەزیری بەرگری ی ئەمریکا دەڵێت : «تەکنەلۆژیای ئەمریکا ڕزگارمان دەکات . .» هەر لەبەر ئەمەیش لەو باوەڕەدایە کە ساڵی ١٩٨٥ هاتنە کایەوەی چەکی تەکتیکی ی نوێ ، لە ئامێری جەنگی ئەمریکادا ، بە خۆیەوە دەبینێت .

ئەگەر سەرنجێکی ئەو ڕەنجە بەهەڵپەیانە بدەین کە ئێستا لە ئەمریکادا بۆ بەرهەمهێنانی ئەم چەکە نوێیانە دەدرێن ، دەبینین کە یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم مووشەکە تەکتیکییە نوێیە تێکشکاندنی تانکی دوژمنە .

ئێستایش چەند پرۆژەیەك لە ئارادایە بۆ بەرهەمهێنانی ژمارەیەك لەم مووشەکانە ، گرنگترینیان پرۆژەی «واسب»ە لە ئاسمان بەرەو زەوی . کە زاناکان خەریکن پەرەی پێ دەدەن بۆ ئەوەی بە سیستەمی تیشکی خوارووی سوورو . بەرەو گەرما ڕاکشان . . ئیش بکات . یان بە سیستەمی شەپۆلی زۆر کورت (مایکرۆوێف) ئیش بکات ، بۆ دۆزینەوەو ڕووکردنە نیشان . ئەم دوو سیستەمە گەلێك لە سیستەمی پێکانی مووشەکی مافاریك پێشکەوتوو ترن ، کە ئێستا بەکاردەهێنرێت واتە مووشەکی مافاریك ، کەوا چاوەڕوان دەکرێت لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨١دا مووشەکی «واسب» جێی بگرێتەوە پاش ئەوەی بەرهەم دەهێنرێت .

مووشەکی مافاریك بە کامێرایەکی تەلەفزیۆنی ئیش دەکات ، بە لووتیەوەیە ، وێنەی «نیشان» دەگرێت ، پاشان تێکی دەشکێنێت . بەڵام ئەگەر هەور هەبوو یان تەم‌و مژ بوو ئەوا کامێراکە ناتوانێت ئیش بکات ، لەبەر ئەوەیە ئامێرو دەزگای ڕووکردنە نیشان لەم مووشەکەدا پەرەپێدراوە بۆ ئەوەی بە هۆی تیشکی خوارووی سوورەوە ئیش بکات .

ئەگەر چی ئەم دەزگایەی دوایی وای‌کرد مووشەکی مافاریك بۆ هەموو وەرزێك بشێت ، بەڵام دەزگای دۆزینەوەو نیشان لەم مووشەکەدا بە ووردی ئیشیان نەدەکردو زۆر جاریش کۆمپیووتەرەکەی بە هەڵە هێماکانیان لێك دەدایەوەو ڕێگایان وون دەکرد . هەندێك جار ڕوویان دەکردە ئەو بڵێسانەی بۆ ڕێ وون کردن دەکرێنەوە ، لە جیاتی ئەوەی ڕوو بکەنە نیشانی مەبەست ، بگرە تا ئێستایش مووشەکی مافاریك ناتوانێت نیشانی ڕاستەقینە لە هی درۆکینە جودا بکاتەوە .

بۆیە پەرە بە دەزگای ڕووکردنە نیشان لە مووشەکی مافاریك‌دا . دراوە بە تیشکی خوارووی سوورو بە ڕادار ئیش بکات ، هەروەها چەند مووشەکێکی تر ، وەکوو مووشەکی سایدو ئیندرو سبارۆ . بۆ ئەوەی باشتر نیشان بپێکن . بەڵام مووشەکی «واسب» ئاسمان بۆ زەوی‌و ، مووشەکی ئەمرام «ئاسمان بۆ ئاسمان) لەوەوپێش پتر پەرەیان ستاندووە .

پەرەپێدانی فراوانی ئامێرو دەزگای دۆزینەوەو نیشان‌شکێنی لە مووشەکی «واسب»دا وای لێ‌کردووە هەموو نیشانێکی مەبەست ببینێت‌و ، پاشان بە ووردی . ئەو نیشانەی کە دیاری کراوە هەڵبژێرێت .

یەکێك لەوانەی سەرپەرشتی ی پەرەپێدانی ئەم مووشەکە دەکەن دەڵێت : «ئەم مووشەکە لە ڕۆیشتنی‌دا هەموو ئەو شتانەمان بۆ دەژمێرێت کە دەیبینێت ، پێمان دەڵێت : تانکێك ، پردێکك ، سەربازهەڵگرێك دەبینم ، بەڵام مووشەکەکە لە بنەڕەتەوە پرۆگرامی بۆ دانراوە ، بۆ وێنە دژی تانکە ، بۆیە تەنیا ڕوو لە تانکەکە دەکات‌و ڕێگای خۆی لە ناو نیشانەکانی تردا وون ناکات» هەروەها دەڵێت :

بەر لە کۆتایی هەشتاکان کۆمپیووتەری «واسب» لە مێشکی مرۆڤ نزیك دەبێتەوە ، ئەو «نەك هەر زیرەك دەبێت ، بەڵکوو بلیمەت دەبێت» . پسپۆڕەکە لەو باوەڕەدایە ئەو کاتە سەردەمی بە دوگمە جەنگ‌کردن دەست‌پێ دەکات ، کێبەرکێ‌کەران پاش ئەوەی پرۆگرام بۆ ئەم مووشەکانە دادەنێن پەنجە بە دوگمەکان‌دا دەنێن مووشەکەکان بەرەو نیشانەکان دەچن‌و تێکیان دەشکێنن .

ئێستایش بۆ پەرەپێدانی دەزگای

دۆزینەوەو ێشـ ـێکی ێبـ ـێکۆیـەوەو تاقی‌کردنەوە بە ـ ـ ـ ـ . ـ ئەوەی پتر پەرەیان پێ‌بـ ـ ـ ـت . ـەوە نەیشە لە چەند سالێکی تر ئەنجام بگرێت .

مووشەکی واسب‌و ، هاوخێزانە وێرانکەرەکانی ، جیاوازی‌یەکی بنەڕەتی‌یان لەگەڵ مووشەکەکانی ئێستادا هەیە کە بە تیشکی لیزەر ئیش دەکەن ، چونکە مووشەکی لیزەر پێویست بەوە دەکات تیشکەکە لە فڕۆکەیەکەوە یان لە سەنگەری پێشەوەی تۆپخانە ئاراستەی نیشانەکە بکرێت ، ئەنجا مووشەکەکە دەتەقێت‌و ڕاستەوخۆ نیشانەکە دەپێکێت .

بەڵام لەوانەیە دوژمن نەهێڵێت ئەم کارە ئەنجام بگرێت ئەویش بەوەی فڕۆکەکە بخاتە خوارەوە یان تۆپخانەکە تێك‌شکێنێت بۆیە ناتوانرێت تیشکی لیزەر بەکاربهێنرێت . بەڵام مووشەکی واسب ئەو کەس‌و بنکانە ناخاتە بەر ئەم مەترسی‌یەوە . چونکە بە تەنیا خۆی دەتوانێت نیشانەکان تێك‌بشکێنێت‌و جیاوازی‌یان لە نێواندا بکات ، بەمەبشەوە لە هەردوو مووشەکی تاوو دراگۆن جیاوازە کە ئەو نیشـانە دەپێکن لە مەودای تەل یان لیرەزدانو . توانای ئەمەیشیان واتای ئەوەیە لەوانەیە لە لایەن ئاگری دوژمنەوە بپێکرێن ، کە تەلەکەیان یان سەکۆی تەقاندنەکەیان دەپێکێت .

لەبەر ئەمەیە پەنتاگۆن فەرمانی داوە واز لەم مووشەکانە بهێنرێت‌و ڕوو بکرێتە مووشەکی واسب‌و هاوخێزانەکەی ، کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئیش دەکەن بێ‌ئەوەی سەکۆکانی تەقاندن . چی فڕۆکە یان تانك یان هەر شتێکی تر ـ . بخەنە مەترسی‌یەوە .

وا چووەڕو ـ ـ ـ ـ پێش

بەرهەمهێنانی ئەم مووشەکە . نرخی لە ٢٥ هەزار دۆلارەوە ببێتە پێنج هەزار دۆلار .

بۆیە پسپۆرێکی سوپایی ئەمریکا دەڵێت : «کاتێك مووشەکێکی ٢٥ هەزار دۆلاریمان هەبێت بتوانێت تانکێکی یەك ملیۆن دۆلاری تێك‌بشکێنێت ، ئەو کاتە ، تانك دەبێتە بارێکی قورس‌و دەبێت چاوی پێدا بگێڕرێتەوە» .

لەبەر تیشکی ئەم پەرەسەندنەدا ، ئەوا پەنتاگۆن ژمارەی ئەو تانکانە پتر ناکات کە لەوانەیە لە دە ساڵی ئایندەدا دروست بکرێن کە خۆیان لە حەفت هەزار تانکی چەشنی «ئێم ئێکس – ١» دەدەن ، بەڵام هەندێك شتی تایبەتی دەگۆڕێت بۆ ئەوەی سووك‌ترو قەوارە بچووك‌تر بێت تا بە ئاسانی بگوێزرێتەوەو ، لەگەڵ بوچوونی تیپی بزێودا بگونجێت کە ئێستا پەنتاگۆن خەریکە سوپای ئەمریکا لەسەر ئەو بناغەیە دادەمەزرێنێت .

چونکە هەر کاتێك مووشەکی واسب دروست‌کراو بەرهەم هێنرا ئەوا ئەوە دەگەیەنێت : یەك گوللە بە ڕێك و پێکی نیشان دەپێکێت .

هەروەها ژەنەراڵی ئەدوارد ماییر . سەرەك سالاری جەنگی‌ی سوپای ئەمریکا دەڵێت ، ئەم مووشەکە ڕێگا دەدات بە ئاسانی چالاکی‌ی سوپایی دژی هەر دەست‌درێژی‌یەکی زرێی ئەنجام بدرێت هەروەها ڕێگا دەدات هێزی دەریایی‌و زەمینی لە هەر شوێنێکی بەرەی جەنگ هەرچەندە دوور بێت ، بەکار بهێنرێت . «چونکە لەوەوپێش نەمان‌دەتوانی چەك‌و ئامێری قورس ، وەکوو تانك‌و ئۆتۆمبیلی زرێی بگوێزینەوە ، بەڵام ئێستا من پشت بە چەکی زیرەك‌و کاری بەرانبەر دەبەستم

کە هێزێکی دەست‌وەشێنەری توندو تیژمان پێ‌دەبەخشێت ، لە هەر سیناریۆیەکی جەنگی ئەلکترۆنی‌دا لە هەر شوێنێکی جیهان بێت» .

پسپۆران دەڵێن تەنیا یەك تیپی سوپایی کە مووشەکی واسب‌و ، سەکۆی تەقاندن‌و تۆپخانەو پیادەی هەبێت ، لە توانایدایە هێرشێکی دوژمن ڕابگرێت کە بریتی بێت لە هەزار تانك ، دەشتوانێت لە ماوەی دوو ڕۆژ جەنگ‌کردن‌دا لەناویان بەرێت .

لەوانەیە ، مووشەکی واسب‌و چەشنەکانی ، لە دەریاو ئاسمان‌دا کاریگەری‌ی ئەوتۆیان هەبێت ، چونکە توانای نیشان شکاندنی مووشەکەکە سەربەستی‌ی ئەو فڕۆکانە کەم دەکاتەوە کە لە بنکەی زەمینی یان دەریایی‌یەوە هەڵدەفڕن ، ئیتر پێویستی فڕۆکەی جەنگی‌ی تیژڕەوو شەڕکەر نامێنێت ، چونکە ئەم مووشەکانە بە ڕێك‌و پێکی نیشانەکانی خۆیان دەپێکن ، لەوانەیشە سەرکردەکان داوای فڕۆکەیەکی لەسەر خۆترو قەوارە گەورەتر بکەن ، بۆ ئەوە بشێن وەکوو بنکەی مووشەك تەقێنی ئاسمان بۆ ئاسمان یان ئاسمان بۆ زەوی بەکاربهێنرێن .

بەڵام هەندێك سەرکردەی تر لەو باوەڕەدان ئەم مووشەکە نوێ‌یە پێویست بەوە دەکات فڕۆکەیەکی نوێ‌تری مەودا دوور هەبێت بتوانێت مووشەکەکانی خۆی لە دوورایی سەد میلەوە بەرەو نیشانە بتەقێنێت . ئەمەیش واتای ئەوە دەگەیەنێت پێویست بە فڕۆکە دەبێت ، بەڵام فڕۆکەیەکی نوێ دەبێت بە گوێرەی هەل‌و مەرجی نوێ .

هەروەها بە ڕێژەی چەکی دەریایی‌یەوە ، ئەوا چەکدارکردنی کەشتی‌و

فرۆکەکانی سەر فرۆکەهەڵگرەکان بەم موو‌شەکانە ، وایان لێ‌دەکات پێویستیان بە ژمارەیەکی زۆری کەشتیی پاسەوانی نەبێت لەگەڵیاندا بن ، چونکە ئەو کاتە دەتوانن خۆیان داکۆکی لە خودی خۆ بکەن . ئەمەیش واتای پتربوونی توانای دەستوەشێنەری هێزی دەریایی‌و مەودای چوونە پێشەوەو چالاکیی دەگەیەنێت ، لە هەر جەنگێکدا هەرچەندەیش دووربێت .

یەکەمین کۆسپ کە ئێستا کە لەبەردەمی ستراتیژیەت‌دانەرانی هەردوو دەوڵەتی گەورەدا ڕاست‌بووەتەوە ئەو تێکەڵ‌کردنە کاریگەرەی نێوان چەکە جەنگیی‌یەکان‌و چۆنیەتیی ئەرك بەرێوەبردنیانە لە سەردەمی نوێی مووشەکی بلیمەت‌دا .

ئێستایش کێ‌بەرکێیەکی تر لەنێوان هەردوو لادا دەکرێت ، ئەویش دروست‌کردن‌و بەکارهێنانی ئەو ئامێرەیە بەزووترین کات ، ئەوساکە دە ساڵ تێ‌دەپەڕی پێش ئەوەی وێنەی چەکە نوێ‌یەکە لە ژووری نەخش‌دانانەوە بچێتە ژووری بەرهەمهێنانی تەواوەتی . بەڵام کێ‌بەرکێی بە پەلەی پەرەپێدانی چەك لە نێوان هەردوو دەوڵەتی مەزن‌دا وایان لێ‌دەکات ئەو ماوەیە زۆر کورت بکەنەوە .

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ، هەندێك گەشبین بوون بەوەی کە پێشکەوتن لە پێناوی مرۆڤدا دەبێت ، بەڵام ئەم کێ‌بەرکێ بە پەلەیەی ئێستا بەڵگەی ئەوەیە کە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی بە شێوەیەکی ئەوتۆ بۆ تێك‌شێواندنی مرۆڤ دەستی پێ‌کردووە .

ئایا قسەی ئەو کابرایە دێتە دی کە وتوویەتی : مرۆڤ بە بلیمەتیی خۆی ، خودی خۆی دەکوژێت !

هەندێك واتای ئەو ووشانەی لەم باسەدا هاتوون کە پێویست دەکات خوێنەر بەرانبەرەکەیان بە عەرەبی بزانێت .

**سەردەم** : **عصر**
**مووشەکی بلیمەت** : **الصاروخ العبقري**
**نیشان** : **الهدف**
**نیشانی ڕاستەقینە** : **الهدف الحقيقي**
**بۆچوون** : **مفهوم**
**خۆچەکدارکردن** : **التسلح**
**بازدانی چەشنەکی** : **قفزة نوعية**
**کیشوەربڕ** : **عابر القارات**
**هەڵموگێر** : **قلب** : **رأساً علی عقب**
**تیژڕەو** : **سريع**
**هەستکەر** : **حساس**
**سیستەم** : **نظام**
**تیشکی خوارووی سوور** : **الاشعة تحت الحمراء**
**شەپۆلی زۆر کورت** : **الموجات القصيرة جداً**
**سیستەمی پێکان** : **نظام التهديف**
**دەزگای دۆزینەوە** : **جهاز الكشف**
**نیشان شکێن** : **التهديف**
**مەودای تەل** : **مدی الأسلاك**
**سەکۆی تەقاندن** : **قاعدة اطلاق**
**پەنتاگۆن** : **وزارة الدفاع الامريكية**
**تیپی بزێو** : **الفرق المتحركة**
**مەودا دوور** : **بعيد المدی**
**فرۆکەهەڵگر** : **حاملة طائرات**
**کەشتیی پاسەوان** : **سفن حراسة**



رایەکی سەربەست

## دەربارەی ئەو جەنگەرەوایەی عراق دژی فارس دەیکات جەنگە نارەوایەکەی فارس دژی عیراق

شورش لە سەرەتای بەرپابونیەوە ، لە پێودانگ‌و روانگەی سودو قازانجی گشتی عراق‌و نەتەوەی عەرەبەوە سەرنجی تێکرای ئەو مەسەلانەی داوە کە روو بە روویان بووەو هەر شتە بەپێ‌ی پێویست ماڤی خۆی داوەتی‌و هیچ کاتێك نەیهێشتوە لەسەر حیسابی لایەك تای تەرازو بەلای تاکتیك یان ستراتیجدا لاسەنگ بێ . بەڵکو تێکۆشاوە کە هەرشتە بەپێ‌ی توانا جێگاو پلەی شیاوی خۆی وەربگرێ .

پەیوەندی عراق بە وڵات‌و گەلانی دراوسێیەوە مەسەلەیەك بووە لەو مەسەلانەی کە لەسەرەتاوە روو بەرووی شۆرش بوون . شورش بەپێ‌ی ئەو قۆناخانەی پێیاندا تێپەڕیوە بایەخی پێداون . پەیوەندی دوو قۆڵی نیوان عراق‌و ئێران لەم بوارەدا مەسەلەیەك بووە کە عراق بەتەنگەوە بوە کە باش بێ‌و بەرەو باشتر بڕوات ئەویش سەبارەت بەو پەیوەندی‌یە دێرینە مێژوو ییانەی بە یەکیانەوەی دەبەستی‌و لەبەر سودو قازانج‌و ئامانجی ناوکۆییان . . بەڵام ئەم پەیوەندی‌یە دوو قۆڵی‌یە لە ساڵانی رابوردوودا هەندێ جار شێوەی جیا جیای وەرگرتووە . لە ئەنجامی هەڵوێستە نالەبارەکانی رێژیمی ئێران زۆر جار ئەم پەیوەندی‌یە گرژ بوەو دووچاری گیروگرفت بووە . تا ئەو رادەیەی هەستی دەستخستنە ناو کاروباری ناوخۆی عراقیان لی‌کراوە .

بەڵام عراق بەپێ‌ی بنچینەی دادپەروەری‌و دراوسێتی کە دەسەڵات‌و سەربەخۆیی‌و سودوقازانجی هەردوو وڵات دەستەبەربێ هەوڵی داوە ئەم پەیوەندی‌یە لەبارو باشتر بێ . ئەوەبو دوای روخانی رێژیمی چەپەڵی حمە رەزاخان وا چاوەرێ دەکرا کە سەرکردەکانی رێژیمی نوێ دەست لە سیاسەتە دوژمنایەتکاری‌و فراوانخوازی‌و هەڵوێستە چەپەڵەکانی پێشو هەڵگرن‌و بەباشی بێنە پێشەوەو دەستی دۆستایەتی‌و هاوسێتی بخەنێو دەستی دراوسێکانیانەوە . بەڵام مەسەلەکە بە بارێکی تردا شکایەوەو ئەوەندەی نەخایاند کە ئەوانیش دەستیان کرد بە رەچاو کردنی هەمان سیاسەتی پێشو . ئەگەر چی ئەمان ئەو سیاسەتەی خۆیان لە پەردەیەکی درۆو دەلەسەو ریا وەرپێچاوە . هەندی لایەن بۆ سودو قازانجی خۆیان بەبیانوی جۆر بە جۆر داکوکی‌یان لێ دەکەن . کاربە دەستە نێ‌یەکانی تاران تا ئێستا لاڤی ئەوە لێ دەدەن کە خلیج فارسی‌یەو سورن لە سەر زەوت کردنی سێ دوورگەکەو لەوەش پتر قسەی سەیری ئەو تۆ دەکەن کە نا چێتە ئەقڵەوە وەك ئەوەی عیراق‌و چەند بەشێکی تری ناوچەکە هی فارسەو داواکاری‌یەکەی شایان زیندو کردەوە کە گوایە بەحرین موڵکی ئێرانەو بۆ شێواندنی دۆخی دەوڵەتانی خلیج ئێرانی‌یەکانی دانیشتوی ئەم وڵاتانە دەوروژێنن بۆ ئەوەی وردە وردەو یەك لە دوای یەك لوت بژەنە خێرو بێری ئەم وڵاتانە . لە لایەکی ترەوە رێژیمی تاران بۆ رێگا خۆش کردنی هێرش بردنە سەر عراق‌و شۆرشەکەی ئەوەندەی تر دۆخی سیاسی‌یان دژی عراق ئاڵۆزاندو دەستیان کرد بە هێرش بردنی راگەیاندنانەو پروپاگەندە بڵاوکردنەوەو لەمەیدانی نێو دەوڵەتانیش‌دا پەیوەندی‌یان لەگەڵ هەردوو رێژیمی سوریاو لیبیادا بەتین کرد . بۆ یەکخستنی ئەو پیلانانەی دژی شورشی عراق رەنگی دەرێژن‌و لەسەرسنوریش بەتایبەتی لە ٤ی ئەیلولدا دەستیان کرد بە تۆپ باران کردنی شارو گوندەکان‌و پاسگا کانی سەرسنور .

کاربە دەستە بەکرێ گیراوەکانی تاران کە لاف‌و گەزاف‌و پروپالانتەکانیان بە پەردەی ئیسلام داپۆشیوە . دەیانەوێ نا کوکی بخەنە نێوان عروبەو ئیسلام‌و یەکگرتنی ئیسلام لە جیاتی یەکگرتنی عەرەب دادەنێن‌و دەیانەوێ دەست لە بنکەو مەڵبەندی شورشی عەرەب لە عراق بوەسێنن‌و بەشێ لاوەکی‌یەوە خەریکی بکەن‌و وای لێ بێ نەپیرژێتە سەر جێ‌بەجێ کردنی ئامانجە درێژخانەیە ستراتیجی‌یەکانی .

بەڵام عراق بەوپەری نەفەس درێژی‌و دان بەخۆ داگرتنەوە رەفتاری کردو چەند جارێك بە نوسراو یاداشت ئاگاداری کردنەوەو دوای ئەوەی هەموو رێگایەك روو بەرووی چاك بوونی ئەم دۆخە بەسترا ، فرمان بە سوپا درا کە مافە پێشێل کراوەکانمان دەست بخاتەوەو بە هێرش پەیتاپەیتای دلێرانە زین القوس‌و سیف‌سعدو محمرەو چەند ناوچەیەکی تری شط العرب گرت‌و سوپای عراق لە شاری (قصر شرین) جێگیربوو . شورش هەروەکو چەند جارێك لە لایەن سەرکردەکانی‌یەوە دووپاتی کردۆتەوە هیچ تەماعێکی لە خاکی ئێراندا نی‌یەو هەر کاتێك کاربەدەستانی تاران لە کەلی‌شەیتان بێنە خواری‌و دان بەمافەکانی عراق دا بنێن ئەوا عراق ئامادەی وەستاندنی ئەم جەنگەیە .

روشنبیری نوێ

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly Magazine
Issued by: Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

**رئيس التحرير**
**اسماعيل رســـول**

**نائب رئيس التحرير**
**فائـــق جميـــل**

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية ساحة الحلاني بغداد
تەلەفون ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

نرخی ٥٠ فلسه

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مطبعة الاديب البغدادية هاتف 6881232